

حافز بە کوردی

# تاڤگەی ئەوین



عومەر ساڵحی ساحێب (کولیل)

دیوان خواجه شمس الدّین محمّد

# حافظ شیرازی

# تاڤگەی ئەوین

عومەر ساڵحی ساحێب (گۆلیل)

کردوویە بە کوردی

| | |
|---|---|
| سرشناسه | : حافظ، شمس‌الدین محمّد، - ۷۹۲ق. |
| عنوان قراردادی | : دیوان.فارسی- کردی |
| عنوان و نام پدیدآور | : دیوان‌خواجه‌شمس‌الدین‌محمدحافظ‌شیرازی:تاقگەی‌نەوین/عومەرسالحی‌ساحێب(کۆلیل). |
| مشخصات نشر | : سنندج: دانشگاه کردستان، ۱۳۹۰. |
| مشخصات ظاهری | : ۱۰۰۵ص.: مصور (رنگی). |
| شابک | : ۹۷۸-۹٦٤-۲۷۹۷-٤۲-٤ |
| وضعیت‌فهرست‌نویسی | : فیپا |
| یادداشت | : فارسی- کردی. |
| یادداشت | :عنوان دیگر: وەرگێڕاوی غەزەلیاتی خاجە حافزی‌شیرازی بە زمانی کوردی. |
| موضوع | : شعر فارسی -- قرن ۸ ق. |
| موضوع | : شعر فارسی -- قرن ۸ ق. -- ترجمه شده به کردی |
| موضوع | : شعر کردی -- قرن ١٤ -- ترجمه شده از فارسی |
| شناسه افزوده | : صالحی صاحب، عمر، ۱۳۲۲ ، مترجم |
| شناسه افزوده | : دانشگاه کردستان |
| رده بندی کنگره | : PIR٥٤٢٦ /۳۸ک٤۱۳۹۰ |
| رده بندی دیویی | : ۸فا۱/۳۲ |
| شماره‌کتابشناسی‌ملی | : ۲۷۰۲۵۸۹ |




**زانستگای کوردستان**

**بە هاوکاری ناوەندی لێکۆڵینەوەکانی کوردستان‌ناسی**

**« وەرگێڕاوی دیوانی غەزەلیاتی خاجە حافزی شیرازی بە زمانی کوردی »**

| | |
|---|---|
| ◇ شاعیر و وەرگێڕ | عومەر ساڵحی‌ساحێب (کۆلیل) ◇ |
| ◆ ویراستاری + رازاندنەوە | رەزا یادگارنوین ◆ |
| ◇ پیت‌چنی | میهرداد گوڵپەسەندی ◇ |
| ◇ رووبەرگ | خالید مەحەدەویان ◇ |
| ◆ بڵاوکەرەوە | زانستگای کوردستان-سنە ◆ |
| ◇ چاپی یەکەم | ۱۳۹۱ی هەتاوی ◇ |
| ◆ ئەژمار | ۱۵۰۰ بەرگ ◆ |
| ◇ نرخ | ۱۸۰۰۰ تمەن ◇ |



منیش لام وایە کوردستان بەهەشتە
که یارەبی نەبینم ڕۆژی تالی!
لە ئاوی چڵچەمەی چاوی چەپەڵ دوورا!
کە خزر ئێستەش دەپرسێ هەر هەوالی
لە شاهۆ تا بە زمزیران و حەمرین
لە قەندیل و سەکۆ تا چەمچەمالی
هەوازۆ تا بە هەورامانی سەربەرز
بە زریان مۆڵەتێ نادا شەمالی
کە نێوی دێتە گۆڕێ تەختی جەمشید
قەڵای بەرزی کەرەفتوو وا لەپالی
وەرن بۆ سەققز و فێری هونەر بن!
لە پەنجەی مێشکی خەلکی هەر مەحالی

**قەڵەمی «حافیز»ە هەر دارەبەری شەکر و نەبات نییەتی باخی ئەدەب نەیشەکەرێ، سەر لەمە بێ چەشنی «کۆلیل» ئەگەر هەڵچنی ئەو میوەیە بم نامەوێ قەت لە ژیانا، سەمەرێ، سەر لەمە بێ**

# پێشەکی

«بەناوی خودای بەدیهێنەری ئاسمان و زەوین وە خولقێنەری تان‌وپۆی تاڤگەی ئەوین»

بە یارمەتی یاری دلاوا و دلۆڤان، نەمردم و بەو شتەی کە هەر لە مەڵبەندی دێهات و حوجرە پڕ لە سەفا و خۆشەویستیی دەوەر و ناوچەکانی کوردستانا، بە مەسەلی کوردی: «بێزووم پێوەدەکرد»، گەیشتم. گەلێ تامەزرۆ و دڵبەئاواتی ئەوە بووم کە رۆژێ بتوانم و جوربزە و زاورێکی وا لە خۆدا بخولقێنم، تەنانەت هەرچەن بە خۆهەڵسپاردن و داخوازی لەم و لەویش بووە، لە ژێر چەپۆکە و قەیرانی بێ‌لایەنی و کەم‌تەرخەمی سەبارەت بە داب و نەریتی خۆماڵی بەتایبەت هونەری شیعر و وێژەی کوردی کە قەباڵەی بوونی باب و باپیرانمانە، خۆ رزگار کەم و بەگوێرەی وزە و دەسەڵات هەوڵ و تەقالایێ بدەم. بەختەوەرانە بە بەڵگەی ئەم واتە کە دەڵێن: «مرۆڤ لەگەڵ دڵدارەکەی حەشر دەکرێ»، لە ئاکامدا بڵێسەی گڕ و تاوی تەندووری ئەم تاسە و خۆزگە و ئاواتە عاشقانە لە کوورەی سینەمدا وەها زرینگایەوە کە ئەو جەسارەت و بوێریمە، بە کۆمەکی خودای عەشق و دڵداری، بەدەس‌هێنا و بەر لە هەموو شت فاڵێکم لە دیوانی «**لیسانولغەیب خاجە شەمسەدین موحەممەد حافز**»ی شیرازی گرتەوە کە فەرمووی:

**لە تاقــی نێــرگزی گیــانانە من دڵ و گیــانم**
**دە زووبـە زوو، وەرە! سەیــرێکی تاق و مەنزەر کە**
**بە دەرکەوانــی بەهەشتــێ بڵــێ کە خــاکی مــە**
**بە ڕەسمی هەدیە لە جەننەت بە عوود و عەمبەر کە**
**فــزوولمــایە حەکــایەت گەلێ دەکـا مەیگێــڕ!**
**لە دەستی خۆت نەدەی کار و مەی لە ســاغەر کە**
**لە پــاش مەجلیســی نــۆش و ئەوینــی نــازاران**
**دەرون لە جەوهــەری «حافز» بە کانی گەوهەر کە**

بۆیێ ئەوەندەیتر هێـز و وزە زایینە دڵم و توانیم بە جەوهەر و کانی گەوهەری «خاجە» زەینی مێشک لە تاریکی و فزوولی تەمبەڵی نەجات بدەم و لە باخی هیوا خێوەتێ بەرپاکەم:

**خێــــوەت لە بـــاخ هــــــەڵدە! کە ئامادە خـــزمەتن**
**ســەروی کراسسەوز و کەمەربەستــە شەکــرە نـەی**
**«حافــز»! فریــوی سیــحری حەڵاڵت گەیـــی بە ڕۆم**
**تێپەڕ لە میســر و چیــن بو، سەمەرقەندی گرت و ڕەی**

دەیسا با ڕۆح و گیانی خاجە ئاگادار بێ کە سەحەری ئەم سیحــــرە هەتــاو بەرهەمــەی ئەوان لە ئاسۆی کــوردستــانیشەوە پرشنگی گزینگ و گرشــەی لێوانلێو لە برق و ورشــەی، ڕوون و روونــاکتر لە هەر مەڵــبەند و شــوێنێکی دیکەیــە؛ بــەو نێونیشــانە «**کۆلیـل**»ــێکی ئەوینداری کــورد و کوردستــان، سەرجــەمی دیوانە سیحراوییەکەیانی لە ماوەی ســێ ســاڵ و ئەندێکا، بە بێ ئەوە سەر لە بەژنی کەڵەگەت و مەوزوونی بشــێوێنێ وە هــەروەها بــە بــێ ئەوە تاقە خاڵــێ لەو خەتوخاڵانە کە جەوهەری قەڵەمیان گۆنای سافی ئــەوینی بــۆ هەتــا هەتای عەشق و دڵداری خەملاندووە بسڕێتەوە، بە شیعری کوردی و زمانی زگماکی خۆ، لە ژێر نازناوی «**تاقــگــەی ئەویــن**» وەردەگێــڕێ. ئەگــەریش بڵــێن: چــۆن و لەبــەر چــی...؟! دەڵێم: لەبەر ئەوە شیعری خاجە هەر ئەوەن خۆشە و لە سەر دڵانە، وە هــەروەها تــا ڕادە و پلەیێ لە بواری مەبەست و ڕواڵەت و کاکڵە بەبایــەخ و دەوڵــەمەندە کــە هــەموو کــەس بــە گوێرەی چێژە و سرشتێ وەکوو هونەری جوانپەرستی، دەتوانێ لەو بەحرە شرینە توونیەتی خۆ بشکێنێ، بە بێ ئەوە تەنانەت تنۆکێ لە زەریای گەورەیی و بلیمەتی خاجــە کەمببێتەوە. بڕواشم لەسەر ئەمەیە هەر ئەم تایبەتمەندییانە بوونەتە هۆ کە تا ئێستا سەدان ساغکەرەوە و توێــژەر و نووسەری زانا و بەناوبانگ بە زمانی بیانی و خۆماڵی لە «**شەرحی سوودی**»ــیەوە بگرە تا مامۆستایانی وەک: «**عەللامە قەزوینی**»، «**مەسعوود فەرزاد**»، «**رۆزنویک**»، «**هێرمــان بێنکێڵ**»، «**گووتــە**»، «**جــووانی ماریــا درمــە**»، «**خــەتیب ڕەهبــەر**»، «**ناهیــد فەرشــادمیهر**»،

«مەلای‌جەزیری»، «نالی»، «ئەحمەد خانی»، «حاجی‌قادر کۆیی»، «پیرەمێرد»، «گۆران»، «ناری»، «قانع»، «هەژار»، «مەلاغەفووری‌حافز»، «عەبباس حەقیقی» و...، لەم زەریا دەسنوێژی عەشقیان گرتووە و هەرکام بە شێوەیەک لە خزمەتی دیوانی رەندێک وەکوو حافز بارە وەردەگرن. لەمەشدا بێ‌گومانم کە رۆژ لەگەڵ رۆژ ئەم قافڵە و کاروانە گەوهەرناسانە، گەلێک کیمیاگەری لێزان و پێزانی دیکەشی پێوەدەلکێ. هەر بۆیە منیش «عومەری سالحی‌ساحێب»ی کوڕی «مەلا موحەممەدسادق»ی کوڕی «مەلا سالح»ی «ساحێو»ی «سەقز»ی، وەکوو نووسەر و شاعیرێ بە نازناوی «کۆلیل» واتە دڵ‌پەشێوێکی ئەویندار، بە چەن درەمێکی بێ‌رەواج و کەم‌عەیار، بە پاڵ‌پێوەنانی عەشق و باوەڕ، هاتمە ریز و کۆڕی خوازیاران و کڕیارانێ وەک ئەم کاروان و قەتارە. بەو هیوایە کە هەڕەشەی شێری برۆی شۆخێکی شیرین لە گوێی دڵی کۆلیل و فەرهادمدا بزرینگێتەوە. بەڵکوو منیش بتوانم بۆ هێورکردنەوەی سینگی پڕ لە کوڵ و چڵم بڵێم:

**شەرمەزارم لە حوزووری مەی و مەیگێر گەلێ**
**بەم کەوا شۆڕەوە هەر ئەونەمە لافی غەڵەتە**
**ماڵی وێرانە، نەبێ ئەو دڵە «کۆلیل»ی برۆت**
**ماڵت ئاوا! بە برۆی ئێوە دڵی ئێمە لەتە**

وە ئەگەر وەڵامەکەشم پەسندی خاتری یار نەکرا وە یا زمان لە خۆشی ئەو هەڕەشە بشکێت و وسکوت بکا، ئەمجار بە زمانی دڵ هاوار دەکەم و پێی رادەگەیەنم کە:

**منی «کۆلیل» ئەمەم بیستووە دووسەد کەرەتیش**
**مەم بە ئەم باخە بە عەشقی دیبەنی زینەوە هات**

هات و لە دلیشۆ مەتەقم لێ برا، قسەی ئەو پیرەژنە کە دەیویست بە دەس‌پێنچکێ خوری و تەشیەکەی دەستی یۆسف بکڕێ، یانەی دەروون لە گوێنی باخێکی پڕ لە گوڵی هیوا و بەیبوون بۆن‌خۆش دەکا تا سەرلەنوێ نەفەس بە ئۆکسیژنی ئەوین هەناسەی ژین هەڵبکێشێ. کاتێ بە تەوس و توانج بە داپیرەی خاوەن ئەزموون و بەساڵاچوویان وت: ـ «مەگەر نازانی کە هەموو گەورە بازرگانانی میسر دەرەقەت قیمەتی گۆشە چاوێکی یۆسف نایێن؟! چۆنت وێرا بەم شتە بێ‌نرخ و سووکانە خۆ رسوا کەی و هەموو عالەم بهێنیتە سەیری خۆ...؟!!» ئەویش خێرا بە بێ سێ و دوو، وەها وەڵامێکیان ئەداتەوە کە هەر هەموو دەمیان دەبێ بە تەڵەی تەقی و دەڵێ: ـ «من هەر ئەوەندەم بەسە کە لە داهات و مێژوودا لە کۆڕی خوازیاران و مشتەرییانی یۆسفم حەسێب‌کەن!».

بەڕاستی غەزەڵەکانی حافزیش یوسفی میسری دلانە و لە هەر نرخ و قیمەتێ سەر و گەردنێ سەرترە. غەزەڵەکانی خاجە بەستە و مەقاماتی عەشق و خۆشەویستی‌یە، باخی هەمیشە بەهارێکە کە بای زریانی خەزان و هەناسەی ساردی زستانی پێ ناوێرێ. میوەی ئەم باخە وەکوو باخی بەهەشتی بەرین قەت لە تام و بەرامە و بۆی خۆش ناکەوێ و هەستی مرۆڤی هەستیار و خاوەن بەڵێن و بڕیاری لێ تێر نابێ. وتار و کەلامی حافز ویستی موراد و مەرامی دلانە، بۆیێ لەسەر تەختی دلان حوکمەتی بەردەوام و پایەدارە:

**غەزەڵ وەک دوڕ دەهۆنیتۆ سەدا هەڵبێنە سا «حافز»!**

**خەلاتی ئەم هەوایەت ملوەنی خاتوو سورەییا بێ**

**سوروشێ دوێنەشەو فەرموی دەبێ ئەسرینی«کۆلیل»ـت**

**لە نێو پۆلی پەری، بەرمووری ملوانکەی کچی شا بێ**

وەکوو لەمە پێش‌تریش ئاماژەم پێ‌کرد ئەو هەموو تایبەتمەندییە جوان و بێ‌وێنەیانەی دیوانی خاجەی شیراز بوون بە هۆکار و هاندەرم و ئەو هەل و دەرفەتەیان بۆ رەخساندم تا کورد گوتەنی: «دەس لە دەس و قەوەت لە خوا»؛ ئەم کارە سەخت و لە هەمان کاتدا گرینگە بە ئاکام بگەیەنم. گەلێکیش جێگەی شانازی و بەختەوەرییە کە کارێکی وەها دژوار و بوێرانە بۆ هەوەڵ‌جار لە لایەن «کۆلیل»ـێکی هەژارەوە لەسەر هەمان کێشی عەرووزی و وەزنی تایبەت بە هەرکام لە غەزەڵەکان وەرگێڕدراوە. لەمەش‌دا لەسەر ئەو باوەڕەم کە کاری ئەم وەرگێڕاندنەش وەکوو ئیشی هەر مرۆڤێ، خالی لە کەم‌وکووڕی و هەڵە و بۆچوونی نادروست و یەک‌نەهاتنەوە لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی شیعری کلاسیک و عەرووزی نییە و ئەمەش بۆ من نابێتە هۆی مەترسی و دڵەڕاوکێ. چونکوو تەواو دڵنیام ئێوەی خوێنەری ئازیز و هێژا، رێگەناسانی شیعر و وێژەی کوردی، پەنجەی ئەمەگداری و دڵسۆزی لەسەر ئەو کەچی و کووڕییانە دادەنێن و بۆمی راست و پوخت ئەکەنەوە. منیش بە دڵێکی کەڵەگەت لە چەشنی بەژنی باوەڕ بەڵێن ئەدەم ئەگەر بمێنم و مەرگ مەودام بدا... لە رەخنە و پێشنیار و رێ‌پیشاندانە دڵسۆزانەکانتان کەڵک وەربگرم و ئەو رێگایە بگرمە پێش کە بە چرای ئێوەی بەڕێز بۆم رووناک کراوەتەوە و دەڵێم:

**لەبەر ئەو دەرکە نەکەوتوومە لەبەر شۆرەت و نام**

**بۆ پەنا هاتوم ئاخر فەلەک ئالاوە لە پام**

**فوو لە پۆلوی دڵی «کۆلیل» وەکوو زولفی بکەن**

**شەوی تاریک لەسەر رێگەمە، موحتاجی چرام**

دەبێ باوەڕیشم پێبکەن کە هەر ئەوەندەم وزە و توانا هەبووە یا هەر ئەوەم لە دەس هاتووە کە خاڵی لە هەر خۆپیشاندان و ریایێ وەک دیاری شوانێ پێشکەش بە ئێوەی خۆشەویس و گەورەی دەکەم.

دەڵێن کە عاشق دەرفەتی بیرلێکردنەوە و لێکۆڵینەوەی نییە، دەنا کەی لاقەکولەیێ شیاوی مەحزەری حەزرەتی سلێمانە؟! سەد بریا لەمە زیاترم لەدەس بهاتبایە...

**دوێنەشەو دڵ لە دەسم چوو کە وتی «خاجە» بە سۆز**

**ئەی سەبا بۆنی خۆشی زولفی فلانێکم ئەوێ**

**دڵی «کۆلیل» دەڵێ بۆیە لەگەڵتا بە شەرم**

**تۆ کەژی بەرزت ئەوێ من کەژەوانێکم ئەوێ**

دیارە گەیشتن بە لووتکەی کێوی سەربڵێندی ئاوات و خۆزگەی بەجێماو و گیرخواردوو لە دوندی مێژوودا کاری هەرکەسێ نییە و نابێ.

پاشان هەستم بەوەش کرد کە ئاوڕدانەوە و سەرنجدان بە چەن خاڵێکی گرینگ کە لەم وەرگێڕانەدا زەق و لەبەر چاون، پێویستە. هەر بۆیە لانیکەم دەبێ کورت و سەرپێیانەش بووە ئاماژەیەکیان پێ بکرێ:

**خاڵی یەکەم**

لە پاش وەرگێڕانی هەریەک لە غەزەلەکانی «خاجە»، بەیتێکیش لە وەرگێڕ بە یاریوەرگرتن لە هیممەتی «لیسانولغەیب» بە دوادێڕی شیعرەکان زیاد کراوە. چونکوو لە زۆر جێگە و شوێن کەسانێ بوون و ئێستەش هەر هەن یێخەی خۆیان بە نیشانی کەسێکی دی دەخەملێنن و لەسەر سفرەی ئەموئەو سەخاوەت ئەنوێنن!

ئەمەوێ بڵێم هێنانی ئەم تاقەبەیتانە لە پاش هەر غەزەلێک بۆ ئەوە بوو کە ئەو ئارم و مۆرە جەخت لەسەر ئەوە دانێ ئەم کارە ئەگەر چاکە یا خراو، تەنیا بەرهەمی فرمێسکی ئاڵ و رەنجی چەند ساڵەی «کۆلیل»ـێکی عاشقە و مافێکی ئەوجۆرە کەسانەی پێوە نییە. شایانی باسە کە هەر کامە لەو بەیت و دێڕانە بۆ ئەوە جوانی و شێوایی خۆ نەدۆڕێنن، دەس لە داوێنی غەزەلەکانی «حافز» هەریزا و هەریز بەرنادەن، هەر بۆیە سەرلێشێواو نین و رچە و رێبازەکەی «خاجە»یان لە هەر روانگە و بابەتێکەوە لێتێکنەچووە. بۆ وێنە حافز لە غەزەلێکدا باسی تامەزرۆیی یار و سکاڵای دەردی دووری دەکات و دەفەرمێ:

**نەتبیستووە چی نالە و هاوار کە کردم**

**پێموایە بەهۆی مەرتەبە بەرزیتە، نیگارا**

منیش لە پاش وەرگێڕانی سەرجەمی غەزەڵەکە دەڵێم:

**تۆخوا وەرە! «کۆلیل» لەگەڵ ئێوە سەعاتێ**
**نادا بە خەزێنەی جەم و دارایی دارا**

یان حافز لە کۆتایی غەزەلێکیتردا دەفەرمێ:

**تا وتم خۆزگە لەگەڵ «حافز»ی دیوانە دەبوو**
**پێکەنین گرتی و فەرمووی ئەمە دێوانەیی کێن؟**

کۆلیل»یش لە «حافز»ەوە فێر دەبێت و ئەم بەیتە پاش هەمان بەیت و غەزەڵ دێنێ:

**هەر وتم خالی رەشی وەک شەوی «کۆلیل» دەچێ**
**وتی بالی بکەن ئەم تەیرە لە شوێن دانەیی کێن؟!**

**خالی دووهەم**

تا جێگایەک ڕێگەم بووبێت هەوڵمداوە بۆ ئەم وەرگێڕانە لە هەموو زاراوەکانی کوردەواری کەڵک وەربگرم. چونکوو لە شیعری کلاسیکدا زۆرجار ڕێدەکەوێ بەهۆی کێش و ڕەدیف و قافییە و پاشبەند و ئەمجۆرە شتانە شاعیر نەتوانێ وشەی دڵخواز و یەکگرتووانەتر بەکاربێنێ و پێشم وا نییە ئەم کارە بەتایبەت لە شیعردا ببێتە هۆی دابەزاندن و سووککردنی هونەرەکە.

بۆ وێنە گەلێ پێمخۆشە کە لەم چەن شیعرە ئاوڕێ بدەنەوە:

**حەققم نییە بێژم هەن هۆشێ لە سەرم، خۆ نین**
**یا خۆ نییە بێژم نین بۆ ئەو نەزەرم، خۆ هەس**
**ئەی جەرگی هەموو عالەم لەتلەت بە بڕۆی تیژت**
**«کۆلیل» لەبەر چاوی بازی بەزەییتا چەس؟!**

***

**نەفەس نەفەس لە سەبا نەشنەوم ئەگەر بۆنێ**
**بەرۆک چاک دەمادەم بە غەم بە چەشنی گوڵم**
**مەڕۆ بە تاوا کە تیغی بڕۆ سەڕیشم کات**
**درێژە بۆ سەری فیتراقی زین مەبەستی کوڵم**

***

**ئاوی ژین لیخن، ئەرێ خزری موبارەکپێ لە کوێی؟!**
**شاخی گوڵ خوێن قەی دەکاتۆ بای بەهارانم لە کوێن**
**هیچکەس نالێ کە حەققی وا لەسەر شانم گوڵێ**
**کوا ئەمەگدارانی پێزانم، بەرارانم لە کوێن؟**

**خاڵی سێهەم**

رەنگە وەها کەسانێک ببن و بڵێن کە وەرگێڕاندنەکەی ئێمە لەگەڵ وشەگەلی غەزەلەکانی «خاجە» دەقاودەق نییە و ئەمەش لە ئیشی وەرگێڕاندن و تەرجەمەدا لە خوێنەر سەردەشێوێنێ. ئەو ئازیزانە دەبێ لەمە ئاگادار بن کە هەڵگەڕاندنەوەی دەقاودەق و وشە بە وشە، بەتایبەت لە شیعردا کە تژییە لە «چواندن (تشبیە)»، «تەوس و تـوانج (تعریض)»، «خوازە (استعارە)»، «زیپک و کینایە» و... یاسای یەکجار زەریف و جوانکیلە، بۆیێ لە شیعر و غەزەلی حافز و کەسانێ وەکوو ئەو، وەرگێڕاندنی راستەوخۆ کارێکی نەگونج و تەنانەت ناحەزە و رەنگە شان و شکۆی شیعرەکەش بخزێنێ. هەر بەم بۆنەوە لەم کارە خۆم پاراستووە و لە زۆر جێگەدا تەنیا مەبەست و کاکڵەی هەستی خاجەم رەچاو کردووە و هیچی کە. بێ گومانیشم وتەی شارەزایان لەم بوارەدا راستە کە دەڵێن: وەرگێڕاندن بە مەبەست و هاوشان گەلێ دژوارترە لە وەرگێڕاندنی دەقاودەق و راستەوخۆ؛ بۆ وێنە حافز دەفەرمێ:

**برو فسانە مخوان و فسون مدم حافظ**
**کز این فسانە و افسون مرا بسی یادست**

واتە:

**(هەجی‌مەجی) مەکە «حافز»اکە فوو لە موو داوە**
**کە من حەکایەت و فێلی فرەم ژنەفتە لە تۆ**

یان:

**زاهد ظاهرپرست از حال ما آگاه نیست**
**در حق ما هرچە گوید جای هیچ اکراه نیست**
**تا چە بازی رخ نماید بیدقی خواهیم راند**
**عرصەی شطرنج رندان را مجال شاه نیست**

واتە:

**چون رووالەت‌بینە زاهید عاشق و شەیدا نییە**
**با بجاوێ گۆشتی مردوو چی دەڕێسێ وا نییە**
**شا، روخی سووتا بە ئاخی گەرمی سەربازی گەرووم**
**هەرکەسێ خۆ شارەزا بۆ کیش‌وماتی شا نییە**

ئەم نموونانە و سەدان وێنەی‌تر لە «**تاڤگەی ئەوین**»دا وەکوو زێوێکی سپی و شی‌کراوە لە گوێنی لۆکەی کانیاو خۆ دەنوێنن. هەرچەن برێ شاعیر ئەمجۆرە وەرگێڕاندنانە ناو نانێن تەرجەمە و بە شیعری خۆیان لە قەڵەمی ئەدەن و ناسنامەکەی بە نازناوی خۆیانەوە دەردێنن! بەڵام کارێکی وا بە «**کۆلیل**»ـێکی بێ‌تین و هەژار ناکرێت و ناکەوێ.

**خاڵی چوارەم**

هەروەک خوێنەرانی هێژا ئاگادارن گەلێک دیوانی حافز شرۆڤە و چاپ، وە بلاوکراونەتەوە کە تا رادەیەک لە رووی ئەژماری غەزەلیات، چۆنیەتی ریزبەند و چنینی غەزەلەکان و... جیاوازییان لەگەڵ یەک هەیە. «**تاڤگەی ئەوین**» لە رووی دەقی دیوانی‌حافز، ساغ‌کراوەی «**عەللامە قەزوینی**» کە بە لێکدانەوەی «**دوکتور خەلیل خەتیب رەهبەر**» لە ساڵی ١٣٦٣ی هەتاوی لە چاپخانەی «**سعید نو**» چاپ و بلاوکراوەتەوە، وەرگێڕدراوە. بەپێی ئەم نوسخە جێ‌بڕوا و متمانەیە ئەژماری سەرجەمی غەزەلەکان دەبێتە ٤٩٤ غەزەل و یەک قەسیدە. کە لەم «**تاڤگەی ئەوین**»ـەش دا غەزەلە کوردییەکان راستە و راست وەکوو ئەو نوسخە چێنراون واتە سەرجەمی هەر غەزەلێ لەگەڵ ساغ‌کراوەکەی عەللامە قەزوینی وەک یەک دێنەوە.

کە شەو دەخشێتە نێو باس و بەیانم
سەحەر دێ بۆ سلاوکاری شەوانم
شەوەق دەڕژێتە ئاسۆی لێوی بیرم
بەیان هەڵدێ لە ئاسۆی شیعرەکانم

«کۆلیل»

**عومەر سالحی‌ساحێب (کۆلیل)**
سەقز - پاییزی ١٣٩٠ی هەتاوی (٢٠١١ ز.)

ژمارە تەلەفوونی تایبەتی بۆ پێوەندی لەگەڵ شاعیر و وەرگێڕ (کۆلیل): +٩٨ ٩١٨ ٧٩٥ ٤٦٦١

بە گەردش بێنە ساقی جامەکەت! بەو نەزمە هەر با بێ
وتم ئاسانە عەشق ئەمما بە بێ مەی ڕێگە تەی نابێ
بە ئاواتی نەسیمی پرچی تاریک و گرێچینی
گەلێ خوێنین جیگەر بون کەی سەبا بێ زولفی ئازا بێ
ژووانی وەسڵی گیانانم دەبێ چۆن بێ کە هەر ساتێ
لە زەنگی کاروان دەنگی (کەژاوەی سازکەن) را بێ
لە مەی هەڵکێشە بەرماڵ ئەر غولامی پیری مەیخانەی
لە دابی مەنزڵ و رێ، چی دەڵێ ڕێڕەو دەبێ وابێ
لە ماسی هەڵچنێ نایێ بکا باسی غەمی تەیرێ
لە شەو تۆفانی زەریا و تەنوورەی حۆل، دامابێ
بە خۆڕایی لە خۆڕایی سەرم کێشایە ڕسوایی
نهێنی چۆن دەمێنێ رازی دڵ وەختێ کە رسوا بێ
بە ئاواتی مولاقاتی ئەوینت هەڵدە لەو دونیا
دەرون هێور دەبێ «حافز»! کە ئازیزت لەسەر شا بێ
غوباری غەم بە ئاوی چاوی ئاواتێ بشۆ «کۆلیل»!
کە ئاوپڕژێنی بەر ماڵ و گوزەرگەی بەژنی لەیلا بێ

اَلا یــا اَیُّهــــا السّـــاقی اَدِرْ کَأسـاً وَ نـاوِلْهــا
که عشق آسـان نمود اول، ولـی افتـاد مشـکل‌ها

به بوی نافــه‌ای کـآخر صبـا زان طـــره بگشــاید
ز تاب جعـد مشـکینش چه خــون افتـاد در دل‌ها

مرا در منـــزل جانان چه امـن عیش چـون هـــر دم
جـــرس فـریـاد می‌دارد که بربنــدید محمـل‌ها

به می سجـاده رنگیـن کن گرت پیـر مغــان گوید
که ســالک بی‌خبـر نبــود ز راه و رسـم منـزل‌ها

شـب تاریک و بیـم موج و گـردابی چنـین هـایل
کجـــا داننـــد حـــال ما سبـکبـاران ســاحـل‌ها

همــه کارم ز خود کـــامی به بدنـامی کشید آخـر
نهـان کی مانـد آن رازی کـز او ســازند محفـل‌ها

حضـوری گر همی‌خواهی از او غایب مشو حافـظ
مَتـــی ما تَلْـــقَ مَـنْ تَهْـوی دَعِ الدُّنیـا و اَهْمِـلْهـا

ریــــای شێــخ لەکوێنــە و مەسی شــەراب لەکــوێن
بـــزا تەفــــاوەتی ژیــــر و منـــی خــراب لەکوێـــن
دڵــم لە تەکیـــە کە بێـــزارە وەک حەکـــاڵی ریـــا
لە کوێیە مـەیکـەدە ئاخـــۆ شـەرابی نـاب لەکوێـــن
چەنێ قەڵەنـــدەر و شێـــخی درۆ لە یـەکێ دوورن!
گــراوی پەندی مەلا زەمزەمـــەی روبـــاب لەکوێـــن
نەیـــاری کوێـــر جەمــــاڵی ئەویــــن چ نابینـــێ
گــڕی شەمـۆڵە لەگەڵ شـەوقی ئـافتـاب لەکوێـــن
کلــــەی گـــــلاری مــە خـــاکی بەر ئاستـــانەکەتە
بچینــە کوێنـــە بفــــەرموو کلـی جەنـاب لەکوێـــن
ئەوەندە تیژ و تون ئەی دڵ خەیاڵی کوێنەتە، کوێ؟
تەماحی سێـــوی چەنەو چاڵـــی پڕ عەزاب لەکوێـــن
زەمـانی پێکـەوەبـون چوو کە یـادی خۆشی بەخێـــر
ویقـــاری نـاز لەگـەڵ هەیبـــەتی عیتـــاب لەکوێـــن
قەرار و ئۆقـــــرە لە «حافــز» ئەدی مەپرســـــە، مەگەر
قــەرار چــۆنە سـەبر کامــەیەو جــوواب لەکوێـــن؟
دڵـی«عومـەر» وەکـو تۆقلـەی ســەر ئــاو دیقـی کرد
غەمـــــی ئەوینت و هێزی دڵـــی حوبـاب لەکوێـــن

صلاح کار کجا و من خراب کجا
ببین تفاوت ره کز کجاست تا به کجا
دلم ز صومعه بگرفت و خرقه‌ی سالوس
کجاست دیر مغان و شراب ناب کجا
چه نسبت است به رندی صلاح و تقوا را
سماع وعظ کجا، نغمه‌ی رباب کجا
ز روی دوست دل دشمنان چه دریابد
چراغ مرده کجا، شمع آفتاب کجا
چو کحل بینش ما خاک آستان شماست
کجا رویم بفرما از این جناب کجا
مبین به سیب زنخدان که چاه در راه است
کجا همی‌روی ای دل! بدین شتاب کجا
بشد که یاد خوشش باد روزگار وصال
خود آن کرشمه کجا رفت و آن عتاب کجا
قرار و خواب ز حافظ طمع مدار ای دوست
قرار چیست صبوری کدام و خواب کجا

که بێت و شۆخی کورسانی لەگەڵ ئەو دڵمەدا را بێ
سنە و سابلاخ و سەقز قیمەتی خاڵی رەشی نابێ
دە ساقی جامی باقی بێنە! فیردەوسی بەرین رەنگە
قەراخی (حەوزی بۆکان) و (سەکۆی مزگەوت‌ومیرزا) بێ
ئەمان لەم خۆش‌سەدا شۆخانە، لەم تاره‌تگەرانەی دڵ!
لە تورکی چاویان باوەڕ مەکەن دڵ سفرەشی مابێ
دەسی وەسفم بە بەژنی خۆرهەڵاتی کوڵمی تۆ ناگا
بە سووراو و خەت و خاڵی چ حاجەت رووەمەتێ وابێ
بە بێ‌مەرزی جووانی یۆسفا رۆژی هەوەڵ زانیم
دەبێ رسوای ئەوینی سەد هەزاران وەک زلێخا بێ
جنێوم پێ بدەیت و لەعنەتم کەی هەر دوعاگۆتم
وەڵامی تاڵ شیرینە لەسەر لێوێ گوڵی دابێ
نەسیحەت بگرە گوێ گیانا! کە لاوانی بەخت هاوەڵ
وەکوو گیانی دەپارێزن قسەی پیرێ کە زانا بێ
لە حەیران‌بێژ و مەی بێژن! لە رازی چەرخی کەچ ناگەن
کە گەنجی سەربەمۆری وا دەبێ رەمزی بە باڵا بێ
غەزەڵ وەک دورِ دەهۆنیتۆ سەدا هەڵبێنە سا «حافز»!
خەڵاتی ئەم هەوایەت ملوەنی خاتوو سورەییا بێ
سورووشێ دوێنەشەو فەرموی دەبێ ئەسرینی«کۆلیل»ت
لە نێو پۆلی پەری، بەرمووری ملوانکەی کچی شا بێ

اگـــر آن تـــرک شیـــرازی به‌دســت آرد دل مــا را
به خـــال هنـدوش بخشـــم سمـرقنـد و بخـــارا را
بده ســاقی می بــاقی که در جنــت نخـواهی یـافت
کنـــار آب رکـن‌آبـــاد و گلـگشت مصـــلا را
فغـان کاین لولیـان شوخ شیـــرین‌کار شهـــرآشوب
چنـــان بردند صبـــر از دل که ترکـان خوان یغمـا را
ز عشـــق ناتمـــام مــا جمـــال یـــار مستغنـــی است
به آب و رنگ و خال و خط چه حاجت روی زیبا را
من از آن حسن روزافزون که یوسف داشت دانستم
که عشـــق از پـــرده‌ی عصمت بـــرون آرد زلیخـــا را
اگر دشنـــام فـــرمایی و گر نفـــرین، دعـــا گویـــم
جـــواب تلـــخ می‌زیبـد لب لعـــل شکـــرخـــا را
نصیحت گوش کن جانا که از جـان دوست‌تر دارند
جـــوانـــان سعـــادتمنـــد پنـــد پیـــــر دانـــا را
حدیث از مطـرب و مـی گـو و راز دهـــر کمتـــر جو
که کس نگشـود و نگشـاید به حکمـت این معمـــا را
غزل گفتی و در سفتی، بیـا و خـوش بخـوان حافـظ
کـه بر نظـــم تو افشـــاند فلـــک عقـــد ثریـــا را

سەبا کەرەم کە بڵێ بەو غەزاڵە رەعنایەم
بە عەشقی تۆ لە بیابانە سەر لەگەڵ مایەم

شەکەرفرۆش کە عومری درێژ بێ! بۆچی
وەرامی لوتفی نەبوو بۆ وتەی شەکەر پایەم

جەماڵ و ناز مەگەر دەرفەتی نەدا ئەی گوڵ
دڵی بدەی بە غەمی ئەو دەروونە شەیدایەم

بە گۆشەیی نەزەرێ رامە، تەیری ئەهلی نەزەر
چ بەند و تۆڕە، دەناسێ تەواری سەر سایەم

چ هۆیە بێژە کە بۆ رەنگی ئاشنایی نین
لە بەژن و نێرگزی ئەو یارە مانگ سیمایەم

لەگەڵ ئەوین کە دەنیشیت و بادە نۆشیتە
کەرەم کە یادم! ئەگەرچی سەبایە سەرمایەم

خەتا لە روومەتی میناتە بێبەڵێنی کەمێ
لە رەخنە دووری دەنا، شاگوڵی لە نێو کایەم

بە شیعری «حافز»و ئاوازی زوهرە گەر عیسا
سەما بکا لە سەمادا، توانجی لێنایەم

شەمی جەماڵی لە حاسی«عومەر» کە هەڵبووبا
پەپوولەوێنە چەنێ خۆش بو خۆش بسووتایەم

صبـــا به لطف بگـــو آن غـــزال رعنـــا را
که ســـر به کـــوه و بیـــابـــان تو داده‌ای مـا را

شـکرفـــروش که عمـــرش دراز بـــاد چـــرا
تفقـــدی نکنـــد طـوطی شکـــرخـــا را

غـــرور حسنت اجـازت مگـر نـداد ای گـــل
که پرســـشی نکنـــی عنـدلیـــب شیـــدا را

به خلـــق و لطف توان کـــرد صیـد اهل نظـر
به بنـــد و دام نگیـــرنـد مـــرغ دانـــا را

ندانـــم از چه سبـب رنـــگ آشنـــایی نیست
سهـــی‌قـــدان سیـــه‌چشـــم مـــاه سیـــما را

چـو بـا حبیـب نشیـــنی و بـــاده پیمـــایی
بـــه یـــاد دار محـبـــان بـــادپیمـــا را

جز این قـــدر نتوان گفت در جمـــال تو عیب
که وضـــع مهـــر و وفـــا نیست روی زیبـــا را

در آسمـــان نه عجب گـــر به گفتـــه‌ی حافـظ
ســـرود زهـــره به رقـــص آورد مسیـحـــا را

دڵ دەردەچێ لە دەستم، دڵدارەکان چارێ
هەی داد رازی دەردم دەڕوا بە هەر دیارێ
کەشتی شکاوی عەشقم، سا دەی سەبا مورادێ!
ئەمجارەشم لە ئازیز بەڵکوو بێ دیارێ
گەردون دە رۆژە مەیلی، فێڵ و فریوە کاری
دەرفەت دەچێ لەدەستت لایێ کەرۆ لە زارێ
دوێشەو لە بەزمی بادەو گوڵ خۆش لە ناخی بولبول
موژدەی ئەدا بە مەستان جامی سەحەر دەبارێ
ئەی خاوەنی سەخاوەت شوکری بەهاری بەژنت
جێبێنە! پرس‌وجۆیێ فەرموو لە کۆی هەژارێ
رزگاری هەر دو عالەم دوو خاڵە مەشقی ژینی
بۆ یار خۆشەویستی، رێ‌چون لە گەڵ نەیارێ
رۆژی هەوەڵ بە کۆڕی چاکانی رێ نەدامێ
گەر تۆ قوبوولی ناکەی کاری قەزا کە چارێ
ئەو تام تاڵە سۆفی دەیوت حەرامە، مەیخۆ
شیرین پتر لە زارا تا ماچی گوڵعوزارێ
رۆژانی تەنگدەستی گەنجی موورادە مەستی
دەروێش ئەکا بە قاروون ئەو کیمیا بە جارێ
هێدی بە! نەک بسووتی وەک شەم بە سامی دڵبەر
مەرمەڕ لە دەستی وەک مۆم چەوساوە هەر بە قارێ
جامی جەهانوێن هەر جامی شەرابە بڕوا!
تاکوو بزانی دارا موحتاجە بۆ سەنارێ
عومری لە نۆ دەبەخشن شۆخانی کوردەواری
مەیگێڕ! بێژە سۆفی ئۆفی درۆ وەشارێ
«حافز» بە زۆر پۆشای رووسووری مەی عەباکەی
ئەی شێخی پاک‌داوێن بمبوورە جار و بارێ
«کۆلیل»! شەو شوکور چوو، ئالای خۆر شەکاوە
تا شێخی شەوپەرەستان رسوا بکا لە شارێ

دل می‌رود ز دستم صاحبدلان خدا را
دردا که راز پنهان خواهد شد آشکارا

کشتی شکستگانیم ای باد شرطه برخیز
باشد که بازبینیم دیدار آشنا را

ده روزه مهر گردون افسانه است و افسون
نیکی به‌جای یاران فرصت شمار یارا

در حلقه‌ی گل و مل خوش خواند دوش بلبل
هاتِ الصَّبوحَ هُبّوا یا اَیُّهَا السُّکارا

ای صاحب کرامت شکرانه‌ی سلامت
روزی تفقدی کن درویش بینوا را

آسایش دو گیتی تفسیر این دو حرف است
با دوستان مروت با دشمنان مدارا

در کوی نیک‌نامی ما را گذر ندادند
گر تو نمی‌پسندی تغییر کن قضا را

آن تلخ وش که صوفی اُم الخَبائِث خواند
اَشْهَی لَنا وَ اَحْلی مِنْ قُبلَةِ الْعَذارا

هنگام تنگدستی در عیش کوش و مستی
کاین کیمیای هستی قارون کند گدا را

سرکش مشو که چون شمع از غیرتت بسوزد
دلبر که در کف او موم است سنگ خارا

آیینه‌ی سکندر جام می است بنگر
تا بر تو عرضه دارد احوال ملک دارا

خوبان پارسی گو بخشندگان عمرند
ساقی بده بشارت رندان پارسا را

حافظ به خود نپوشید این خرقه‌ی می‌آلود
ای شیخ پاکدامن معذور دار ما را

## غزل شماره ۵

له هەواڵەكانی گیانان نییه كەس بڵێ به میرم
كه به شوكری سەروەریتان وەدەرم مەنێ! فەقیرم
له رەقیبی دێو خەسڵەت به خودا دەبەم شكایەت
مەگەر ئەو به بەرقی تیرێ بسمێ دژی گزیرم
كه مژۆڵی رەش نیگارا! نەزەری به خوێنی من بوو
له فریوی چا نەزەركەی! به هەڵەت نەكەی نەچیرم
دڵی عالەمێ دەسووتێ كه وەدەر دەخەی شەمی روو
ئەمه نام كەڵكی بۆ تۆ چییه ئەی شەمی تەویرم
گەشەوێ به ئەو هەوایەم كه نەسیمی بەربەیانی
به پەیامی دۆس هەڵكا له دڵی شناس و ژیرم
چ قیامەتێكه گیانا كه نیشانی عالەمت دا
دڵ و گیانمت به قوربان وەنوێنه روو ئەمیرم
به خودا قومێ به «حافز» سەحەرێ له دەم كەرەم كەی
له دوعای دەم بەیانم سەمەرێ دەبەی به بیرم
به «عومەر» ئەگەر كەرەم كەی له شەراوی لێو جارێ
له بەیان خەلاتی بەژنت، شەوەقی دەروونی شیرم

به ملازمـان سلطـان که رسـاند این دعـا را
که به شکـر پادشـاهی ز نظـر مـران گـدا را
ز رقیب دیوسیـرت به خـدای خود پناهـم
مگر آن شهـاب ثاقب مددی دهـد خـدا را
مژه‌ی سـیاهت ار کرد به خـون مـا اشـارت
ز فریب او بینـدیش و غلـط مکـن نگـارا
دل عالمـی بسـوزی چو عـذار برفـروزی
تو از این چه سـود داری که نمی‌کنـی مدارا
همه شب در این امیـدم که نسیـم صبحگاهی
به پیـام آشنـایـان بنـوازد آشنـا را
چه قیـامت است جانا که به عاشقـان نمـودی
دل و جان فـدای رویت بنمـا عـذار ما را
به خدا که جرعه‌ای ده تو به حافظ سحرخیـز
که دعـای صبحـگاهی اثـری کنـد شمـا را

سـوفی! ئەشا چسافە شـەرابی پییالەمان
تا حـەز بکەی سەفایە لە لەعلی دە سالەمان
ئەسراری ژێری پەردە لەکن مەست و رەندە هەر
لەم حالە شێخی عالیقەدر بێ قەبالەمان
سیمورغ چۆن لە تۆڕی من و ئێوە بەنّدەبێ
نێچیر لێرە بایە هەبان ئەو خەیالەمان
ئەم ژینگە یەک دو دەورە ئەدا مەی بە مەیلی تۆ
مان و ئەمان مەحالە بنووسن لە تالەمان
فەسلی تەمەن خەزانە مەگەر تازە گوڵچنین؟
پیرانە سەر هەبایە تەماحی گولالەمان
تا دەرفەتێ بە دەستە لە ژین بارە وەرگرە
ئادەم نەما کە کاتی، لە جەننەت رەجالەمان
گەورەم بەم ئاستانە گەلێ خزمەتی بە دڵ
کردوون ئەم غولامە چتان بوو حەوالەمان؟
«حافز» موریدی جامی شەرابەو شەماڵ تۆش
بۆ شێخی جام هەلکە لە تاسەی بە نالەمان
فەرموو بە پیری مەیکەدە «کۆلیل» تا بە کەی
بێبەش لە جامی لەعل و شەرابی دە سالە، مان

صوفی بیـا که آینـه صـافی‌ست جـام را
تا بنگـری صفـــای مـی لعـــل فـــام را

راز درون پـرده ز رنـدان مسـت پـــرس
کاین حـــال نیست زاهـــد عـــالی‌مقـــام را

عنقـــا شکـــار کس نشـود دام بـــاز چیـــن
کـآن‌جـا همیشـه بـاد به دست است دام را

در بـزم دور یک دو قـــدح درکـش و بـرو
یعنـی طـمــع مــدار وصـــال دوام را

ای دل شبـاب رفت و نچیـدی گلی ز عیش
پیـرانه سر مکـن هنـری ننـگ و نـــام را

در عیش نقـد کوش که چون آبخـور نمـاند
آدم بهـشت روضــه‌ی دارالســــلام را

ما را بر آستـان تو بس حـــق خـدمت است
ای خـواجه بازبیـــن به ترحـــم غـــلام را

حافـظ مرید جـــام مـی است ای صبـا برو
وز بنـده بنـدگی برسـان شیـخ جـــام را

هـــــەستە ساقی پڕ کە خاڵی جامەکەم!
بـا لە سـەر دەرچـــــێ غەمی ئەیـامەکەم
بیدە دەستـــــــم پڕ لە مەی جامێ، هەتـا
داکەنـــــم خەرقـەی درۆ، دێو جامەکەم
عالـــــەمێ تینـــوو بەڕێـــز و شـۆرەتـن
نـامـــەوێ من، نـەنـگە شۆرەتـــنامـەکەم
بادە بابـــــێ! تا بەکـــــەی با بێ لە سەر
قـوڕ بە سـەر نەفسـی خـراپ ئەنجـامەکەم
بـون بە پـــۆلـوو خێـلی دڵمردوو لە تاو
سینگـــــی نالان و هـــــەناسـەی زامـەکەم
کـــەس نەبوو مەحـرەم بە راز و خاتـرەی
ئەو دڵــــــەی شەیـدا سەر و ناکـامەکەم
بـــــەو دڵارامـــــەی دڵئارامـــم کـە وا
ســـەندی یەکجـاری لە دڵ، ئارامـــەکەم
کێ دەکا ســــــەیری چناری لێوی جۆ
تاکـو ســەوزن بەژنـی شۆخ ئەندامـەکەم
«حافـز»ی رەندم لەگەڵ سەختی حەریف
عاقیبـەت رۆژێ ئـەوینـــــم رام ئـــەکەم
رۆژی «کۆلیـــــل»ـن هەتـاوی روومەتت
وەک شـەوی تاریکی زولفت، شامـــەکەم

ساقیا! برخیز و در ده جام را
خاک بر سر کن غم ایام را

ساغر می بر کفم نه! تا ز بر
برکشم این دلق ازرق فام را

گرچه بدنامی‌ست نزد عاقلان
ما نمی‌خواهیم ننگ و نام را

باده درده چند از این باد غرور
خاک بر سر نفس نافرجام را

دود آه سینه‌ی نالان من
سوخت این افسردگان خام را

محرم راز دل شیدای خود
کس نمی‌بینم ز خاص و عام را

با دلارامی مرا خاطر خوش است
کز دلم یکباره برد آرام را

ننگرد دیگر به سرو اندر چمن
هر که دید آن سرو سیم‌اندام را

صبر کن حافظ! به سختی روز و شب
عاقبت روزی بیابی کام را

سەردەم و فەسڵی ژووانی گوڵ و باخانە، گوڵم
مەستی وەسڵی کچی شەوبۆ مەلی خۆش‌خانە گوڵم

ئەی سەبا! هەرکە گەیشتیت بە لاوانی چەمەن
سەد سڵاوم هەیە بۆ نێرگز و ڕێحانە گوڵم

هەروەها ساقی ئەگەر بادە بەدەس بێتو بچێ
بەو مژۆڵانە دەماڵم دەری مەیخانە گوڵم

تۆ کە کێشاتە لە سەر ڕوو خەتی سومبوڵ، مەکە دی
نیگەران‌تر لەمە توخوا دڵی دێوانە گوڵم

پێکەنی ئەو کەسە بەم خڵتەبنۆشانە، یەقین
عاقیبەت تاڵبی پەیمانە بە ئیمانە گوڵم

مەردی مەیدانی خودا بن! کە لە نێو کەشتیی نووح
هەیە خاکێ کە مەترسی نە لە تۆفانە گوڵم

چەرخی گەردون کەرەمێکی نییە، لەم ماڵە بڕۆ
کوشتی ئەم کاسە سیا، هەرکەسی میوانە گوڵم

خاکی نمناکە دەسی ئاخر ئەگەر جێگە خەوت
چ نیازێ بە سەرای سەر لە فەلەک‌بانە گوڵم

مانگی کەنعانم! ئەوا بوویە عەزیزێ لە میسر
وەرە دەر وەختییە لەو سووچەڵە زیندانە گوڵم

«حافز»! مەستو قەڵەندەر بە وەلێ وەک ئەمو ئەو
دامەنێ داوی ڕیا بەو گوڵە قورئانە گوڵم

پێکەنینت بە شەوی ئێمەیی «کۆلیل» نەیێ
هەر شەمێ ڕۆشنە تێفکرە لە گریانە گوڵم

رونق عهد شباب است دگر بستان را
می‌رسد مژده‌ی گل بلبل خوش‌الحان را
ای صبا! گر به جوانان چمن بازرسی
خدمت ما برسان سرو و گل و ریحان را
گر چنین جلوه کند مغبچه‌ی باده‌فروش
خاکروب در میخانه کنم مژگان را
ای که بر مه کشی از عنبر سارا چوگان
مضطرب حال مگردان من سرگردان را
ترسم این قوم که بر دُردکشان می‌خندند
در سر کار خرابات کنند ایمان را
یار مردان خدا باش که در کشتی نوح
هست خاکی که به آبی نخرد طوفان را
برو از خانه‌ی گردون به در و نان مطلب
کان سیه کاسه در آخر بکشد مهمان را
هر که را خوابگه آخر مشتی خاک است
گو چه حاجت که به افلاک کشی ایوان را
ماه کنعانی من مسند مصر آن تو شد
وقت آن است که بدرود کنی زندان را
حافظا! می خور و رندی کن و خوش باش، ولی
دام تزویر مکن چون دگران قرآن را

چوو لە مزگەوتۆ بەرەو مەیخانە دوێشەو پیرمان
چۆنە یارانی تەریقەت چارەو تەدبیرمان
ئێمە دەروێشان چلۆن روو کەینە خانوی قیبلە، تا
روو لە ماڵی مەیفرۆشن حەزرەتی دەسگیرمان
بەو خەراباتەی کە تەشریفی دەچێ، ئێمەش دەچین
چون وەها فەرموویەتی رۆژی ئەزەڵ تەقدیرمان
عەقڵ ئەگەر دەیبوو خەبەر چەن خۆشە بۆ دڵ داوی شەو
عاقڵان دێوانە بون بۆ بەندی دڵ زەنجیرمان
ئایەتی لوتفی لە رووما روومەتی جوانت نووان
بۆیە غەیری لوتف و جوانی تیا نەبوو تەفسیرمان
هیچ ئاخۆ لەو دڵەی سەختت دەبێ کاری شەوێ
ئاوری ئاخ و نزوولەی، سۆزەکەی شەوگیرمان
تیری ئاخی ئێمە گەردونپێکە «حافز»! وس بە سا
هۆشی خۆتت بێ! کە نەتپێکێ کەوان و تیرمان
تا سەحەر «کۆلیل» دوێشەو هەر لە فیکری زولفی بوو
رۆژی رون کاتێ وەدەرکەو کولمی کەفتە و بیرمان

دوش از مسجد سوی میخانه آمد پیر ما
چیست یاران طریقت بعد از این تدبیر ما
ما مریدان روی سوی قبله چون آریم چون
روی سوی خانه‌ی خمار دارد پیر ما
در خرابات طریقت ما به هم منزل شویم
کاین‌چنین رفته‌ست در عهد ازل تقدیر ما
عقل اگر داند که دل دربند زلفش چون خوش است
عاقلان دیوانه گردند از پی زنجیر ما
روی خوبت آیتی از لطف بر ما کشف کرد
زان زمان جز لطف و خوبی نیست در تفسیر ما
با دل سنگینت آیا هیچ درگیرد شبی
آه آتشناک و سوز سینه‌ی شبگیر ما
تیر آه ما ز گردون بگذرد، حافظ خموش
رحم کن بر جان خود پرهیز کن از تیر ما

ســـاقی بە شــەوقی بادە هەنــاری کە جــامی مــە
موتریب هــەوا بگـۆڕە جەهــان بوو بە کامــی مە
دیومـــانە ئێـــمە بــەژنی دەلالـــی لـە بـــادەدا
ئــەی بێخـــەبــەر لە تامــی شــەرابی مودامــی مە
پەرژین لە مەرگە ئەو کەسە عـــــەشقی لە دڵ ژیا
تۆمـــارە نـــاوی ئێـــمە لە سینگــی مەرامـــی مە
تا ئەو زەمـــانە بەژنـــی خەرامـــانە ســـەروی تەڕ
قــەدقــامەتی بە لــەنجـــە نەیێ نۆ نمامـــی مە
کاتـــێ گەییـــتە گوڵشەنی یاران، سەبا دەخیـــل
گیانان لەوێـــیە بـــۆی بەرە عەرز و پەیامی مە
یادم بڵـــێ لەبەر چیـــیە عەمدەن دەبەی لە بیـــر
ئەوکاتــە دێ نەدەیتـــەوە هەرگیز وەڵامـــی مە
مەستــی لە چــاوی جوانــە ئەوین، وا درا بە دەس
مەستــێ لەغـــاوی بیـــر و سەرەنجامی رامــی مە
لام وایە من کە رۆژی جـــەزا هەر وەکوو یەکن
نانــی حەڵاڵی شێـــخ و شەرابی حــەرامی مە
«حافـــز»! بڕێـــژە دانە لە یاقووتی دیـــدەکەت
شایەت کە تـــەیری وەسڵی سەرێ با لە دامی مە
پیرۆزە بەحری چەرخ و هیلالی گەمی، بە جووت
نوقمن لە نێـــو سەخـــاوەتی حاجی قەوامـــی مە
گوڵشەنی رازی ئێوەیە مەحمـــوودە بۆ هەیـــاس
«کۆلیـــل»ـی رەمـــزی دیدەتە ژیر و نەفـــامی مە

ساقی به نور باده برافروز جام ما
مطرب بگو که کار جهان شد به کام ما
ما در پیاله عکس رخ یار دیده‌ایم
ای بی‌خبر ز لذت شرب مدام ما
هرگز نمیرد آن که دلش زنده شد به عشق
ثبت است بر جریده‌ی عالم دوام ما
چندان بود کرشمه و ناز سهی‌قدان
کآید به جلوه سرو صنوبرخرام ما
ای باد اگر به گلشن احباب بگذری
زنهار عرضه ده بر جانان پیام ما
گو نام ما ز یاد به عمدا چه می‌بری
خود آید آن که یاد نیاری ز نام ما
مستی به چشم شاهد دلبند ما خوش است
زان رو سپرده‌اند به مستی زمام ما
ترسم که صرفه‌ای نبرد روز بازخواست
نان حلال شیخ ز آب حرام ما
حافظ ز دیده دانه‌ی اشکی همی‌فشان
باشد که مرغ وصل کند قصد دام ما
دریای اخضر فلک و کشتی هلال
هستند غرق نعمت حاجی قوام ما

ئەی دەقـی مانگی جـووانی روومەتـی رەخشانتـــان
وەی سەفابەخشـی دەلالی چای چناکەی جوانتـــان
بۆ زیارەت گیانـــی شیرینـــم بە سەر لێـــو هـــاتووە
بێــــتە دەر یا چێـــتە سەر؟ تا چـی بڵێ فەرمانتـــان
بـــێ‌بەلا بـــی! کەس لە دەستی چاوەکانت دەرنەچوو
عـەقڵ و تەقـوای شێخـە تالانی شکۆی مەستانتـــان
وا لە خــەو هەستــا شوکور بەختی خەوالّوی چاومان
چون لە گریانن بە عـەشقی مانگـی رووی تابانتـــان
بێ لەگەڵ بای سروە چەپکێ گـوڵ لە باخی کولـّمتم
بۆ بنێـــرن، با بکەم بـۆی خاکـی کـۆی بێسانتـــان
کامــەران و پڕ تەمــەن بن ساقیـــانی بـــەزمی جــەم
گەرچی هەرگیـز پڕ نەبوو جامم لە مەی‌گێڕانتـــان
دڵ پەرێشـــانی دەکـا، بێــژن بە دلّبــەر دەردەکــەی!
ئەی رەفێقـــان بـــۆ خودا دەستـــی مـن و دامانتـــان
کەی دەگا ئـــەو کاتـە یارەببی لەگەڵ یەک یەکگرن
خاتـــری جەمع و پەرێشـان زولفی وەک قەترانتـــان
هــــەڵکە داوێنت لە خاک و خوێن بە لامانا کە دێی
زۆرە لەم رێـــــگا شـەلاّلی تێــــغی ئەبرۆکانتـــان
وادەکا «حافــز» دوعـــایێ، ئێــوەش ئامیــنێ بە دڵ
دەک بە قسمەت بێ شەرابی لێوی شەکرنەفشانتـــان
با سەبا بێـــژێ لەباتـــی من بە خەڵکی شـــاری یــەزد
ئەی ســەری خێڵــی نەیاران بێ بە گۆی یارانتـــان
دوورە دیـــدارم وەلێ هیممەت نزیکن ئێـــوە گشت
خـۆم غـولاّم و شیعرەکانیشـــم بە گـــوڵبارانتـــان
ئەی ستــــارەی بەخت‌رۆشـن هیممەتێ تۆ بی و خودا
وەک هـــەسارەی ماچ کەم تا خاکی بەر هەیوانتـــان
بۆیە «کۆلیل»ـت کلاّوی خەڵکی ئەورۆی سەر نەچوو
تاجی شیعری نا لە سەر، چون پەرچەمی بەخشانتـــان

ای فـــروغ مـاه حسـن از روی رخشـــان شمـــا
آب روی خـــوبی از چـــاه زنخـــدان شـمـــا
عـــزم دیـــدار تـو دارد جـــان بـر لب آمــده
بـاز گـــردد یا برآیـــد چیست فـــرمان شمـــا
کس به دور نرگســت طـــرفی نبست از عافیـــت
بـه کـه نفـــروشنـد مستـــوری به مستـــان شمـــا
بخت خواب‌آلـــود مـــا بیـدار خواهــد شـد مگـر
زان‌کـه زد بـر دیــده آبــی روی رخشـــان شمـــا
با صبـــا همـــراه بفـــرست از رخت گلـدستـه‌ای
بو کـه بویی بشنـویـــم از خـــاک بستـــان شمـــا
عمـــرتان بـــاد و مـــراد ای ساقیـــان بـــزم جـــم
گرچـــه جـــام مـا نشـــد پر می به دوران شمـــا
دل خـــرابی می‌کنـــد دلـــدار را آگـــه کنـــید
زینهـــار ای دوستـــان جـــان مـن و جـان شمـا
کی دهد دست این غرض یا رب که همدستان شونـد
خـــاطـــر مجمـــوع مـــا زلـــف پریشـــان شمـــا
دور دار از خـــاک و خون دامـن چو بر ما بگـذری
کـــاندر این ره کشتـه بسیـــارند قـــربان شمـــا
ای صبـــا با ســـاکـنـــان شهـــر یزد از مـــا بگـــو
کـــای سـر حـق‌ناشنـــاسان گـــوی چوگان شمـــا
گرچـــه دوریـــم از بســـاط قـرب همت دور نیست
بنـــده‌ی شـــاه شمـــاییـــم و ثنـــاخـــوان شمـــا
ای شهنـــشاه بلنـــداختـــر خـــدا را همتـــی
تا ببـــوســـم همچـــو اختـــر خـــاک ایوان شمـــا
می‌کنـــد حـــافـــظ دعـــایی بشنـــو آمینی بگـــو
روزی مـــا بـــاد لعـــل شکـــرافشـــان شمـــا!

تا سەحەر هات بەستی پەردە، سەحاب
هاوەڵان! وا گەییوە سوبحی شەراب
ئەشکی شەونم تکایە سەرگوڵی ناز
زووبە ئازیز بێنە جامی گوڵاب!
لە چەمەن دێت بۆنی عەتری بەهەشت
سا لە سەر یەک بنۆشە ساغەری ناب
تەختی سەوزی لە باخ گوڵ لێدا
ماتڵی لەعلی سوورە شێخ و شەباب
بەستیان بۆچ دەرکی مەیکەدە لێم
بیکەیۆ ئەی کلێل و رەمزی جەواب
لێوەکانت هەیانە حەققی نمەک
لەسەر ئەو دڵمە، وەک دەروونی کەباب
لە بەهاری وەها سەرم سڕە هەی!
چۆنە مەیخانە قوفڵە؟ خانەخراب!
بە حەزی ساقی ئەو بەژن پەرییەم
وەکو «حافز» بنۆشە بادە جەناب
لێوی لەعلی دەقی جەماڵە «عومەر»!
چاوی نازی کەماڵی وەقر و عیتاب

می‌دمد صبح و کِلّه بست سحاب
اَلصَّبوح اَلصَّبوح یا اَصحاب

می‌چکد ژاله بر رخ لاله
اَلمُدام اَلمُدام یا اَحباب

می‌وزد از چمن نسیم بهشت
هان بنوشید دم به دم می ناب

تخت زمرد زده است گل به چمن
راح چون لعل آتشین دریاب

در میخانه بسته‌اند دگر
إفتَحْ یا مُفَتِّحَ الأَبْواب

لب و دندانت را حقوق نمک
هست بر جان و سینه‌های کباب

این چنین موسمی عجب باشد
که ببندند میکده به شتاب

بر رخ ساقی پری پیکر
همچو حافظ بنوش باده‌ی ناب

پێم وت ئەی شاهی جووانی خێرە دەرمانی غەریب
پێی وتم ئاوارەیی دڵ چاری نایێ بۆ تەبیب
تا وتم جارێ مەڕۆ فەرموی دەبووری چۆن دەبێ
من گوڵێ تاقانە ئێوەش پۆلی شەیدا عەندەلیب
نازەنینێ کەوڵی نەرمینی سمۆرەی دۆشەکە
کەی گرۆی باڵنجی بەردە و دڕک و داڵی وا غەریب
وەی کە خاڵی رەش لە رۆمی روو چەنێ خۆش خەوتووە
ئەی لە زەنجیرەی حەبەشتان ئاشنا دیلن عەجیب
عەکسی سووری مەی لە نێو مانگی روخت پەیدا، وەکوو
ئەرخەوان سەحنی سپی نەسرینی کریا بێنەسیب
وەک سەفی مێروو قەتارەی خەتتو خاڵت سەیرە سەیر
خەتتی میشکین بۆ بەهاری رووت ئەگەرچی زیبە زیب
پێم وت ئەی شێوی غەریبان شەو رەشی کاکۆڵەکەت
لادە خۆ! با نەتگرێ ناڵەی غەریبی شەو رەقیب
شارەزایان مات و حەیرانن وتی «حافزا» ئەدی
چۆن غەریبێ تێدەگا ئەفسوونی چاوی دڵفەریب
پێم وت ئاخر لازمە رێزی ئەدیبێ وەک «عومەر»
پێی وتم کەی باوی ماوە حورمەتی خێلی ئەدیب

گفتم ای سلطان خوبان رحم کن بر این غریب
گفت در دنبال دل ره گم کند مسکین غریب
گفتمش مگذر زمانی گفت معذورم بدار
خانه پروردی چه تاب آرد غم چندین غریب
خفته بر سنجاب شاهی نازنینی را چه غم
گر ز خار و خاره سازد بستر و بالین غریب
ای که در زنجیر زلفت جای چندین آشناست
خوش فتاد آن خال مشکین بر رخ رنگین غریب
می‌نماید عکس می در رنگ روی مهوشت
همچو برگ ارغوان بر صفحه‌ی نسرین غریب
بس غریب افتاده است آن مور خط گرد رخت
گرچه نبود در نگارستان خط مشکین غریب
گفتم ای شام غریبان طره‌ی شبرنگ تو
در سحرگاهان حذر کن چون بنالد این غریب
گفت حافظ آشنایان در مقام حیرتند
دور نبود گر نشیند خسته و مسکین غریب

ئەی بووکە پەری کێــــتە لە ســــەر لابەری تارا؟
وەی تەیری چـــەمەن کامە غولامی چەمەن ئارا؟
خەو چوو لە دییەم شەو بە خەیاڵێکی جیگەرسۆز
ئاخۆ لەگەڵت کێ دەنووێ سەرگوڵی سارا؟!
ناپرســــی لە حاڵــــی منــــی دەروێش، دەترسم
بــــڕوایە نـــەکەی چاك و خراپێــــکە لە ئارا؟
ئەو چاوە خـــــومارێتە دڵـــــی عــــــاشقی لێدا
مەعلــــوومە کە مەی مەستە لە دوو چاوی خومارا
ئەو تیـــرە خەتا چوو کە کریشمەت لە دڵی گرت
هەمـــدیس بزانــــم نەزەرت چۆنــــە لە کارا
نەتبیستـــووە چی ناڵــــە و هــــاوار کە کـردم
پێــــموایە بەهــــۆی مەرتەبە بەرزیـــــتە، نیگارا
ئەم چـــۆڵە تراویلـــکەیە کانـــــی نییە، ئامان
داوێـــکی بیــــاوانە لە دەس حــــــۆلی نەیارا
چوو سەردەمی گەنجی بە هەڵەت ئەی دڵی غافڵ
چی دی غـــەڵەتت ئێــستە بە پیــری هەیە یارا
ئەم کــــۆشکی ســـەفابەخشـــە هەتا مەنزڵی تۆیە
یـاڕەببی نەبێ هەڵمــەتی چەرخی لە کــــەنارا
«حافـــز» نە غولامێکە لە دەس خــاوەنی هەڵبێت
ئاشتـــم کەوە مردم لە چلــــەی دووری و قارا
تۆخـــوا وەرە! «کۆلیـــل» لەگەڵ ئێـــوە سەعاتێ
نادا بە خـــــەزێنەی جـــــەم و دارایی دارا

ای شاهد قدسی که کشد بند نقابت
و ای مرغ بهشتی که دهد دانه و آبت
خوابم بشد از دیده در این فکر جگرسوز
کآغوش که شد منزل آسایش و خوابت
درویش نمی‌پرسی و ترسم که نباشد
اندیشه‌ی آمرزش و پروای ثوابت
راه دل عشاق زد آن چشم خماری
پیداست از این شیوه که مست است شرابت
تیری که زدی بر دلم از غمزه خطا رفت
تا باز چه اندیشه کند رای صوابت
هر ناله و فریاد که کردم نشنیدی
پیداست نگارا که بلند است جنابت
دور است سر آب از این بادیه هشدار
تا غول بیابان نفریبد به سرابت
تا در ره پیری به چه آیین روی ای دل
باری به غلط صرف شد ایام شبابت
ای قصر دل‌افروز که منزلگه انسی
یا رب مکناد آفت ایام خرابت
حافظ نه غلامی‌ست که از خواجه گریزد
صلحی کن و بازآ که خرابم ز عتابت

خــــەمێ کە شۆخە برۆکەی لە کەچ کەوانی خست
بە قــەستی ســـەر دڵی بێ‌هێـــز و پڕ لە ژانی خست
خـــەبەر نەبوو لە دو عالـــەم، کە خۆشەویستی بوو
زەمانە نەخشی ئــەمــانی لە پێش ئـــەوانی خست
بە نـــازی دیــدە کە بــۆ خۆنووانــدنی فـــەرموو
هــــەزار و یەک شـــەڕی هێنا لە نێو جەهانی خست
مەسی شەراب و عەرەق کەردە، رەنگە چوویە چەمەن
گوڵاوی رووت کـــەوا رەنگی ئــەرخەوانی خست
زەماوەنی چــــەمەنم دوێــنەشەو بە مـــەستی دی
کە غونچە سەد لە دەمی تـۆم بە دڵ گـــومانی خست
وەنەوشـــە کاکــوڵی لوولــی هـــەتا گــرێچن کرد
ســـەبا بە رازی کەزێـــکەت بە مل‌شکـــانی خست
هـــەتا وتــم وەکو رووتن سەمــەن شـــەرم گرتی
لە دەم بە دەستــــی ســـەبا بۆیە خاکتـــانی خست
چ موتــریب و چ شـــــەرابم نــەدی لەبــەر پـارێز
هـــــەوای ساقییـــە ئێـــمەی بە هــەردوانی خست
دەبـــێ بە ئاوی مـــەی ئــەم خەرقە کۆنە پاکۆ کەم
بەشـــم ئــەزەڵ ئەمە بوو تا ئـەبەد لە شـــانی خست
یــەقیـــن بە مـــەستیــیە «حـافز» نەسیبی تا مـــاوە
کە پیری مـــەیکەدە ئـــاوا لە کۆی موغـــانی خست
جـــەهان بە مەیلمــە ئێستا کە چەرخ و سووڕی زەمان
منـــی بە داوی ئەمـــانی سەرۆکـی جەهـــانی خست
فەلەک لە دەورمی جامـــــێ نەدا کە بێـــغەش بێ
هەموو لە ساغــەری «کۆلیـــل» (شەوکـەران)ـی خست

خمی که ابروی شوخ تو در کمان انداخت
به قصد جان من زار ناتوان انداخت
نبود نقش دو عالم که رنگ الفت بود
زمانه طرح محبت نه این زمان انداخت
به یک کرشمه که نرگس به خودفروشی کرد
فریب چشم تو صد فتنه در جهان انداخت
شراب خورده و خوی کرده می‌روی به چمن
که آب روی تو آتش در ارغوان انداخت
به بزمگاه چمن دوش مست بگذشتم
چو از دهان توام غنچه در گمان انداخت
بنفشه طره‌ی مفتول خود گره می‌زد
صبا حکایت زلف تو در میان انداخت
ز شرم آن که به روی تو نسبتش کردم
سمن به دست صبا خاک در دهان انداخت
من از ورع می و مطرب ندیدمی زین پیش
هوای مغبچگانم در این و آن انداخت
کنون به آب می لعل خرقه می‌شویم
نصیبه‌ی ازل از خود نمی‌توان انداخت
مگر گشایش حافظ در این خرابی بود
که بخشش ازلش در می مغان انداخت
جهان به کام من اکنون شود که دور زمان
مرا به بندگی خواجه‌ی جهان انداخت

غـــــەمی ناسۆری دڵم سینە و سامانەمـــی سووت
ئاگـــری ئەو غەمە ئەم ماڵـە چکۆڵانـــەمی سووت
لەش بە تـاوی غەمـی دووری لە عەزیـزان بووە ئـاو
ئاوری روومەتـی گیان، گیان و دڵ و یانەمـــی سووت
ســـۆزی دڵ ئاگری ئەسرینمـی بەردا بۆوە شـــەم
شـەوی پێشوو وەکو باڵ و پەڕی پەروانەمی ســووت
ئاشنا چـــۆن بەزەیـــی نایە بە حاڵـــی منی زار
ئەو لە خـۆ چوونمـە وەختـێ دڵی بێگـانەمی سووت
چۆمی مەیخانە بە خـورِ هات و جبەی زوهدی رفان
ئـاوی خومخانە بە گورِ ئەو سەرە فـــەرزانەمی سووت
من کە تــۆبەم نەشکان ئـــەو دڵی میـــنامی شکاند
هەر وەکوو لالە دڵی بێ مـەی و مـــەیخانەمی سووت
مەگــرە دی پەڵپ و بیانوو، وەرە وا خـەڵکی دییـەم
چەشنی قەقنەس لە بەرا، خەرقە بە شوکرانەمی سووت
«حافـز»! راز و حەکایەت مەکە، مـەی خـۆوە دەمـێ
باسی پێشوو شەم و شەو، شەوکەتی ئەفسانەمی سووت
من بەقوربـانی گوڵـی رووتـم و «کـۆلیل»ـی بەڵێن
گەرچـی پـــەیمانی کەچت بادە و پەیمانەمی سووت

سینه از آتش دل در غم جانانه بسوخت

آتشی بود در این خانه که کاشانه بسوخت

تنم از واسطه‌ی دوری دلبر بگداخت

جانم از آتش مهر رخ جانانه بسوخت

سوز دل بین که ز بس آتش اشکم دل شمع

دوش بر من ز سر مهر چو پروانه بسوخت

آشنایی نه غریب است که دلسوز من است

چون من از خویش برفتم دل بیگانه بسوخت

خرقه‌ی زهد مرا آب خرابات ببرد

خانه‌ی عقل مرا آتش میخانه بسوخت

چون پیاله دلم از توبه که کردم بشکست

همچو لاله جگرم بی می و خمخانه بسوخت

ماجرا کم کن و بازآ که مرا مردم چشم

خرقه از سر به درآورد و به شکرانه بسوخت

ترک افسانه بگو حافظ و می نوش دمی

که نخفتیم شب و شمع به افسانه بسوخت

ساقــی ئەم جەژنتــە پیــرۆز وەلیٚ بیخـەوە بیــر
ئەو هــەموو وادە کە دابووت بە ئیٚمەی کز و پیــر
وڕ و واقــــم کە لە ڕۆژانــــی جـودابیت بە دڵ
لەو حەریفانە دڵت کەندوە وەك بەختی فەقیــر
بە کچــــی ڕەز بکە شاباش سڵاویٚــــكێ و بڵــێ
بە دوعای ئیٚمەی ئەمیٚستا نە لە نیٚو کووپەی ئەسیــر
هاتنی ئیٚـــوە بە ئـــــەم کۆڕە زەماوەندی دڵــــە
هەرکە تۆی شاد نەویێ، غەم لە دڵی بیٚ بە ئەمیــر!
خواشوکور دوورە لە تالآنی خـەزان باخی گوڵت
سەروی تــەڕپۆشە قەدت، یاسەمەنت لەعلی مونیـر
وەرە مەیگیٚــڕ! شوکور دەولـەتی زکماکی ئەتۆ
چــاوی دووپۆیـی و ئاژاوەگەر ئەسمیٚت بە تیــر
«حافـز»! ئەو کەشتیـە نووحەت مەدەد و یـار نەبیٚ
لە بنت هــەڵدەکەنێ قـودرەتی تۆفــانی کەبیــر
کەرەم ئەو جامـە کە فـەرمووت، نـووانی کەرەمێ
گوڵ و گوڵزارە لەبەر چاوی«عومەر»دەشتی کەویر

ساقیا آمدن عید مبارک بادت
وان مواعید که کردی مرواد از یادت
در شگفتم که در این مدت ایام فراق
برگرفتی ز حریفان دل و دل می‌دادت
برسان بندگی دختر رز گو به درآی
که دم و همت ما کرد ز بند آزادت
شادی مجلسیان در قدم و مقدم توست
جای غم باد مر آن دل که نخواهد شادت
شکر ایزد که ز تاراج خزان رخنه نیافت
بوستان سمن و سرو و گل و شمشادت
چشم بد دور کز آن تفرقه‌ات بازآورد
طالع نامور و دولت مادرزادت
حافظ از دست مده دولت این کشتی نوح
ور نه طوفان حوادث ببرد بنیادت

ئەی سەبا کۆشکی پشوودان و خەوی یار لە کوێن
مـــەنزڵی مانگی من ئاشق کوژی عەییار لە کوێن
شەوە تاریکە بەرەو خـــاکی وڵاتم ســـەفەریم
ئاگری تووری سنین و گـــڕی دیـــدار لە کوێن
هەر کەســێ هاتە جەهان رۆڵی خراپێـکێ نـووان
لە خـــــەرابات بڵێ پێم کەسی وەشیار لە کوێن
عاقیبەت خێرە ئەوەی رەمـــزی ئیشارەت بـــەڵەدە
شـارەزای ئێوە ئەرێ مەحرەمی ئەسرار لە کوێـــن
یەک یەکی موو لە لەشم رەمزی ئەوینێکی گـەشە
ئێمە لە کوێینو توانجی گـــەلی بێکار لە کوێـــن
زولفی چیـن چینی دەزانێـت فەقەت، لێـی پرسـن
ئەو دلـــی وێڵمە فـەرموو کە گرفتـــار لە کوێن
پرچی زەنجیری لە کوێن عەقڵی سەرم شێتی پەتین
دڵ بە گۆشەی چەمی چوو تاقی برۆی یار لە کوێن
مـەی و مـەیگێڕ و دەف و ساز هەموو سازە بەڵام
جێـــژنی بـــێ یار گەوارا نییە دڵدار لە کـوێـن
بـــا زەمەن گەر بە چەمەن هاتـەوە دڵگیـر نەبـێ
نێو نیشانێ بدە «حـافز»! گوڵی بـــێ‌خار لە کوێن
کوشتمی بـا ڕەشی زریـان وەکـو «کۆلیـل»، ئەرێ
هەڕەشەی گەرمی شـەماڵ و دەمی هاوار لە کوێن

ای نسیم سحر آرامگه یار کجاست
منزل آن مه عاشق‌کش عیار کجاست

شب تار است و ره وادی ایمن در پیش
آتش طور کجا موعد دیدار کجاست

هر که آمد به جهان نقش خرابی دارد
در خرابات بگویید که هشیار کجاست

آن کس است اهل بشارت که اشارت داند
نکته‌ها هست بسی محرم اسرار کجاست

هر سر موی مرا با تو هزاران کار است
ما کجاییم و ملامت‌گر بیکار کجاست

باز پرسید ز گیسوی شکن در شکنش
کاین دل غمزده سرگشته گرفتار کجاست

عقل دیوانه شد آن سلسله‌ی مشکین کو
دل ز ما گوشه‌گرفت ابروی دلدار کجاست

ساقی و مطرب و می جمله مهیاست ولی
عیشِ بی یار مهیا نشود، یار کجاست

حافظ از باد خزان در چمن دهر مرنج
فکر معقول بفرما گل بی خار کجاست

گــەردن ئازادییـە، جــەژنی دڵە، ڕۆیـی ڕەمــەزان
مــەی لە خومخانە بە کـوڵ هاتووە بـۆم تێکە ئەمان!
لار و لەنجەی گوڵـــی سەرچۆپی و گۆرانی و سـاز
ڕەونـــەقی زوهـدفــرۆشــانی گرانـجانی شـــکان
مەکە لـــۆمەی ئەوە جارجارە دەنۆشێت شـــەراب
بێخەبەر بون لە سـەری خاو، مەگەر جورم و خەتان؟!
بادەنۆشـــێ لە دڵـــی مەکر و ریـا ڕەنـــگی نەبێ
بێ گـــومان چاترە لەو شێخە کە ڕەنگڕێژی ریان
نە هــــەواداری ریـائین و نە یارانـــی دەغـــەڵ
خـــوا کە زانا بە هـــەموو رازە دەزانـــێ لە دڵان
بە قسەی خواش دەکەین و بە کەسیش زوڵم نەکەیم
هــەرچی بەو خــەڵکە ڕەوا نیــن بە ئێمەش نەڕەوان
چ دەقەومــێ لەگەڵــم چەن قەدەحێ بـادە وەخۆی
خوێنمژی باخی ڕەزین ئێمە نە خوێنخۆری کەسان
بـادەنۆشینـــــی ئەمــن هێــــزی خەتاییـــکی نییە
ئەگـەریش عەیبـە دەڵێن پاك لە هەر عەیب خودان
تف لە نێـــو چــاوی ریـاکار و درۆزن «کۆلیـــل»!
گورگن ئەم خێـــڵە لەنێو پێستـی مـەڕا دێنە کەوان

روزه یک سو شد و عید آمد و دل‌ها برخاست
می ز خمخانه به جوش آمد و می باید خواست

نوبه‌ی زهدفروشان گران‌جان بگذشت
وقت رندی و طرب کردن رندان پیداست

چه ملامت بود آن را که چنین باده خورد
این چه عیب است بدین بی‌خردی وین چه خطاست

باده‌نوشی که در او روی و ریایی نبود
بهتر از زهدفروشی که در او روی و ریاست

ما نه رندان ریاییم و حریفان نفاق
آن‌که او عالم سر است بدین حال گواست

فرض ایزد بگذاریم و به کس بد نکنیم
وان‌چه گویند روا نیست نگوییم رواست

چه شود گر من و تو چند قدح باده خوریم
باده از خون رزان است نه از خون شماست

این چه عیب است کز آن عیب خلل خواهد بود
ور بود نیز چه شد مردم بی‌عیب کجاست

گـــوڵ دڵ و دینـی رفــان و بە مەلامەت هەستــا
وتی کێ بوو لەگەڵت ســاغ و سەلامەت هەستـــا
هــەرکە دانیشتووە لەم کۆشکە دەمێ لێو بە کەنین
دەســـی ئاخـر بە گریــن و بە نەدامــەت هەستـــا
لافی سەر لێـوتی شــەم بوو لە سـەرا بۆیە شــەوان
بۆ گـــەلی عاشقی لێـــــوت بە غەرامەت هەستـــا
ســـروە خێــرا لە کەناری گوڵ و ســەروی چەمەنا
بە ئەوینی گوڵی روخســارت و قامــەت هەستـــا
مەس دەچووی و بە تەماشات لەنێو کۆڕی مەلەك
بوو بە غەوغا لە سەرت رۆژی قیــامەت هەستـــا
سەروی تەرپۆش شکا نــازی ســـەری خستە بــەرا
ســـەروم ئەو کاتە خەرامان قەد و قامەت هەستـــا
فـڕ دە ئەو خەرقەیە «حافز»! لە دەسی ڕاکە، کە لەو
بنـــکە فێڵاوییـــە ئاگـــر لە کـەرامــەت هەستـــا
بە دەمارێـــــکەوە واعیز لە هـــــەوا و فیزی دەوت
بۆیە «کۆلیـــل»ـی قەڵەندەر بە شەهامەت هەستـــا

دل و دینم شد و دلبر به ملامت برخاست
گفت با ما منشین کز تو سلامت برخاست
که شنیدی که در این بزم دمی خوش بنشست
که نه در آخر صحبت به ندامت برخاست
شمع اگر زان لب خندان به زبان لافی زد
پیش عشاق تو شب‌ها به غرامت برخاست
در چمن باد بهاری ز کنار گل و سرو
به هواداری آن عارض و قامت برخاست
مست بگذشتی و از خلوتیان ملکوت
به تماشای تو آشوب قیامت برخاست
پیش رفتار تو پا برنگرفت از خجلت
سرو سرکش که به ناز از قد و قامت برخاست
حافظ این خرقه بینداز مگر جان ببری
کآتش از خرقه‌ی سالوس و کرامت برخاست

لە ئەهلــــی دڵ قســـە وەربگرە قەت مەڵێ کە خەتان
خـــــەتا لە تۆیە کە مێــــشکی قسەت نەبێ، نە ئەوان
بە دوو جەهــانی نەبوو سەر نەزەر وە یا هــــــەوەسێ
عەجەب دەمەق بووە دڵ! ئەم نەوایە چن لە ســـەران؟
لە نێــو دڵی شــــــە کەتم کــــــێ موقیمە؟ نازانم
کە سرتە نایە لە مـــــن ئـــەو لەوێــوە دەمبەهـــــەران
دڵم لە سیـــــــنە وەدەر هات، موتریب! ئاهــــــەنگێ
لە ناڵە ســـەر خەوە! ئاخـــــر هەر ئەو هــەوامە هەوان
هەتاوی کوڵمەکەتی گەر جەهان لەسەر نەدەکەوت
گـــــــەرم نەبــوو نــەزەری دڵ بە رێبـــەنانی جەهان
نەنوستــووم لە پەژارەی خەیـــاڵی شــەو لە ســـەرا
خـــوماری هەر شەوەتـــم، هەر شەرابــــخانە دەوان
وەهـــا شەلاڵە لە خوێنـــــی دڵم، مزەوتـــی گەڕەک
بشــــۆن ئەگەر بە شــــەرابم، گەلێ رەوان و رەوان
گـــوڵم! لە دەیری موغـــان بۆیە خۆشەویســـە گڵم
هـــەمیشـــە چون دەگرێ دڵ بە ســۆزی سینـــەکەمان
لە کامـــە نــــــەزم و چ‌دەزگایەکـــی دەژەن موتریب
کە چوو تەمەنم و کەچی دڵ هەر ئەو هــەوایە نــەوان
دەروونــی دوێنەشـــەوم پڕ لە نەزمـــی دەنگت بوو
ســـەرایی سینـەیی «حافـز» لە مێـژە نوقمـی ســەدان
شریتـــی گیانمـــە «کۆلیـــــــل»! ســـــازی ئـاوازت
وجـاخی رۆشنـە ئاهەنــگی گیـــانی روو لە بەیـــان

چو بشنوی سخن اهل دل مگو که خطاست
سخن‌شناس نه‌ای جان من خطا اینجاست

سرم به دنیی و عقبی فرو نمی‌آید
تبارك الله از این فتنه‌ها که در سر ماست

در اندرون من خسته‌دل ندانم کیست
که من خموشم و او در فغان و در غوغاست

دلم ز پرده برون شد کجایی ای مطرب
بنال هان که از این پرده کار ما به نواست

مرا به کار جهان هرگز التفات نبود
رخ تو در نظر من چنین خوشش آراست

نخفته‌ام ز خیالی که می‌پزد دل من
خمار صدشبه دارم شرابخانه کجاست

چنین که صومعه آلوده شد ز خون دلم
گرم به باده بشویید حق به دست شماست

از آن به دیر مغانم عزیز می‌دارند
که آتشی که نمیرد همیشه در دل ماست

چه ساز بود که در پرده می‌زد آن مطرب
که رفت عمر و هنوزم دماغ پر ز هواست

ندای عشق تو دیشب در اندرون دادند
فضای سینه‌ی حافظ هنوز پر ز صداست

خەیـالّی روومەتی تەنیـا هەوالّـی نێو دلّـی مـەن
شەمیـمی پەرچـەمی تێـکەڵ بە ئاوەزی گلّی مـەن
جەمـالّی ئێـــوە دەلیـــلی نزاکـەتی عەشقـــە
نەفـامە ئەو کەسـە بەرگر لە عەشق و مێملّـی مـەن
لە چـالّی سەر چەنـەتا هاتـە گوێ سـەدآیێ خۆش
هـەزار یۆسفـی میسـری قەتیســی بابلّـی مـەن
ئەگەر بە زولفـی درێـژت نەگـا دەسـی دلّمـان
خەتا لە بەختی پەرێش و لە دەس دەسی کولّی مەن
بە دەرکەوانی حەرەمخـانە خاسـەکەت فەرمـوو
کە ئەو فلاّنـە، ئەوینـداری خـاکی مەنـزلّی مـەن
بلّـێ بەلّـــێ بە روالّــەت لە خـزمەتـم دوورن
وەلێ هەمیشـە لەبـەر چـاوی خاتـر و دلّی مـەن
ئەگەر دەسـی دلّی «حافز» لە دەرکی دا، وەیـکەن!
لە مێـژە چونـکە بە ئـاواتی روومەتی گولّی مـەن
وە یا لە چالّی چەنەم گیـرە گیـانی«کۆلیـل»ـێ
نەجـاتی هەر بە تەنـافی درێـژی سومبـولّی مـەن

خیال روی تو در هر طریق همره ماست
نسیم موی تو پیوند جان آگه ماست

به رغم مدعیانی که منع عشق کنند
جمال چهره‌ی تو حجت موجه ماست

ببین که سیب زنخدان تو چه می‌گوید
هزار یوسف مصری فتاده در چَهِ ماست

اگر به زلف دراز تو دست ما نرسد
گناه بخت پریشان و دست کوته ماست

به حاجب در خلوت‌سرای خاص بگو
فلان ز گوشه‌نشینان خاک درگه ماست

به صورت از نظر ما اگرچه محجوب است
همیشه در نظر خاطر مرفه ماست

اگر به سالی حافظ دری زند بگشای
که سال‌هاست که مشتاق روی چون مه ماست

لەو یـــارە دڵنـــەوایەم هەم شوکـر و هــەم شکـایەت
ڕێبـــواری ڕێی ئەوین کێـن لێـم بژنـەوێ حیکایەت
عاسمانی وشکێ و بێ‌خێـــر یاڕەب نەبێ لەسەر کەس
بۆ دڵ بۆ هەرچـــی کــردم نەیبوو کەمێ عینـــایەت
بۆ لێـوی وشـکی ڕەنـدان ئاوێکـی کەس نەهێـنا
هـەر شـــەم وەلـی دەناسـی چوو چۆڵ بوو وڵایەت
هەی‌هەی لە پێـچ و داوی زولفی کەمەنـدی ئەی دڵ
بۆ عـاشقـان سـەلیـن بێ‌جـورم و بێ‌جینـــایەت
فەرمـانی خۆتە چـاوت غەممــاز و خوێن‌ڕژێنـــە
کەنگێ دەشێت ئازیـز خوێن‌ڕێـژ بۆ حیمـــایەت
چـــاوی مەبەستی بەستـم تاریکـــەشەو لە ڕێ مـام
هەڵبێ لە گۆشەییکـــۆ! ئەی شـەو شـەمی هیدایەت
ڕۆییـــم بە هەر تەرەفـــدا ترســی دڵـم پتـر بـــوو
ئـــاخ ئەم کەویـــرە ئاخـــر پایـــانی بۆ مە نایــەت
ئەی خۆری خێڵی شۆخـــان کوڵ هەڵدەخا دەروونم
روخســـەت ئەدەی سەعـاتێ فێنکۆ ببــم لە سایەت؟
بێ‌تاقـــەتی لە پێشـــا عـــاشـــق خەتـــەر لە پێشــــە
بەســـراوە ڕێگـــە عەقڵــێ لـــەم ڕێگـــەدا نیهـــایەت
ناچـــم لە دەرکی ئەرکـت با دەرکمـــت نەفـــەرموو
حاشـــا لە شـــەکری دژمـن ژەهــری ئەتۆم کیفایەت
عـــاشق دەگەی بە دڵبـــەر بێت و بە چەشنی «حافـز»
قـورئـــان لە بەر بخوێنـــی هـــەر چـــاردە ڕەوایـــەت
بێ‌جـــایە (گوڵشەنی ڕاز) شەرحی بەزاری «کۆلیـل»
ئەممـا بە لوتفی لێـوی (تەفسیـری خاڵ)ـی شایەت

زان یار دلنوازم شکری‌ست با شکایت
گر نکته‌دان عشقی بشنو تو این حکایت
بی‌مزد بود و منت هر خدمتی که کردم
یا رب مباد کس را مخدوم بی‌عنایت
رندان تشنه لب را آبی نمی‌دهد کس
گویی ولی شناسان رفتند از این ولایت
در زلف چون کمندش ای دل مپیچ کآنجا
سرها بریده بینی بی‌جرم و بی‌جنایت
چشمت به غمزه ما را خون خورد و می‌پسندی
جانا روا نباشد خون‌ریز را حمایت
در این شب سیاهم گم گشت راه مقصود
از گوشه‌ای برون آی ای کوکب هدایت
از هر طرف که رفتم جز وحشتم نیفزود
زنهار از این بیابان وین راه بی‌نهایت
ای آفتاب خوبان می‌جوشد اندرونم
یک ساعتم بگنجان در سایه‌ی عنایت
این راه را نهایت صورت کجا توان بست
کش صد هزار منزل بیش است در بدایت
هر چند بردی آبم روی از درت نتابم
جور از حبیب خوش‌تر کز مدعی رعایت
عشقت رسد به فریاد ار خود به‌سان حافظ
قرآن ز بر بخوانی در چارده روایت

دەمێکە مەست و سەرخۆشی نەسیمی پێچی گێسووتم
شەل و شێتی پەلاماری فریوی چاوی جادووتم
خودا! سەبرم نەما، بێژی دڵی تاقم شەوێ بێژێ
شەمی چاوم شوکور هەڵبوو لە پاتاقی بڕۆی جووتم
دەزانی خەڵکی دوو چاوم لەبەرچی خۆشەوێ هێندە
بە دڵ ئاخر ئەویندارێ شەواری خاڵی هیندووتم
ئەگەر مەیلی ببێ دونیا بکا ڕۆشن بزەی لێوت
دەسی گیانم دەڵێ: من لابەری رووبەندی سەر رووتم
قەلاچۆی عالەمیشت گەر لە سەردا بێ منیش ئەڵبەت
وەکوو جاران خەفەتباری پەرێشان کردنی مووتم
لەگەڵ بای سروە بێحاسڵ بە دووتا دووبەدوو وێڵین
سەبا بۆ زولف و من بۆ چاوی مەست و نیوە خەوتووتم
چ هیممەت بەرزە«حافز» خۆش کە فەرمووی من لە دوو دونیا
بەشم ناوێ فەقەت موشتاقی خاکی دەرکی خانووتم
لە چاڵی بابلی چانەت بە سەربەرزی دەژی «کۆلیل»
بە سەرشۆڕی ئەگەرچی هەر وەکوو هاڕووت و ماڕووتم

مدامم مست می‌دارد نسیم جعد گیسویت
خرابم می کند هر دم فریب چشم جادویت
پس از چندین شکیبایی شبی یا رب توان دیدن
که شمع دیده افروزیم در محراب ابرویت
سواد لوح بینش را عزیز از بهر آن دارم
که جان را نسخه‌ای باشد ز لوح خال هندویت
تو گر خواهی که جاویدان جهان یک سر بیارایی
صبا را گو که بردارد زمانی برقع از رویت
و گر رسم فنا خواهی که از عالم براندازی
برافشان تا فرو ریزد هزاران جان ز هر مویت
من و باد صبا مسکین دو سرگردان بی‌حاصل
من از افسون چشمت مست و او از بوی گیسویت
زهی همت که حافظ راست از دنیی و از عقبی
نیاید هیچ در چشمش بجز خاک سر کویت

باخی وەسڵم وشکە، بـــاران کۆمەکێ!
کوشتمـی ئەم دەردە یـــاران کۆمەکێ
دین و دڵمی برد و گیـــانی لێـم ئەوێ
وەی لە نـــازی گـوڵعوزاران کۆمەکێ
ڕۆح و دڵ هەر قیمـــەتی ماچێـــکە لای
دلڕفێنـــان، چەشنـی جـاران، کۆمەکێ
خوێنـــمانی خێڵـــی کافـــــر دڵ ڕژانـد
ئـەی موسوڵمانـــان! بــەراران کۆمەکێ
هەر وەکوو «حافز» پەرێشان ڕۆژ و شـەو
ئـــاورم تێچـــوو گـــلاران! کۆمەکێ
مـــات و «کۆلیـــل»و کـزم ئازیـــزەکەم!
ئـەی شکـۆی بەزمی هـەواران کۆمەکێ

درد مـا را نیسـت درمـــان الغیـــاث
هجـــر مـا را نیست پـایـان الغیـــاث

دیـن و دل بردنـــد و قصـد جـان کنند
الغیـــاث از جـور خوبـــان الغیـــاث

در بهـــای بوســـه‌ای جـــانی طلب
می کننـــد این دل‌ستـــانان الغیـــاث

خـــون ما خوردنـد این کافـــردلان
ای مسلمـــانان چه درمـــان الغیـــاث

همچـو حافـظ روز و شب بی‌خویشتـن
گشتـــه‌ام سـوزان و گریـان الغیـــاث

کە تۆ لە سەرسەری شۆخانی عالەمی وەك تاج
دەشێ ئەوانە بە جەم، جەم بکەن خەراج و باج
بە چاوی شۆخ هەژانت شەڕی خەتا و حەبەش
بە چینی زولفتی ماچین و هیند داوە خەراج
کتێبی روومەت و روخساری، وەك هەتاوێ بەیان
قژی رەشی شەوی یەلّدا دەکات شێت و وڕاج
دەمی شرینتە مایەی رەواجی ئاوی حەیات
گوناحی لێوتە نەیما نەباتی میسر رەواج
لە ئەم نەخۆشییە بێشك قەتم شەفا نابێ
ئەگەر نەبێ دلّی شێتم بە لێوی ئێوە عەلاج
بە کامە هۆ دەشکێنی بە دلّڕەقی دلّمان
کە شیشە چا نییە بشکێ، بڕایە چون بە مەزاج
بە لێو جەنابی خزر، دەم بە چەشنی ئاوی ژیان
بەژن سەرو، کەمەرت موو، سینە هەر وەکو عاج
ئەوینی دلّبەری وەك تۆ کە کەوتە دلّ «حافز»
وتی بە خاکی دەرت خۆزگە دلّ ببایە هەڕاج
دەمێکە ماتلّی لوتفی بەهارە «کۆلیل»ـت
گولّێ کەرەم کە! بە داخی دلّی خەزانی کەلاج

تویی که بر سر خوبان کشوری چون تاج
سزد اگر همه‌ی دلبران دهندت باج

دو چشم شوخ تو برهم زده خطا و حبش
به چین زلف تو ماچین و هند داده خراج

بیاض روی تو روشن چو عارض رخ روز
سواد زلف سیاه تو هست ظلمت داج

دهان شهد تو داده رواج آب خضر
لب چو قند تو برد از نبات مصر رواج

از این مرض به حقیقت شفا نخواهم یافت
که از تو درد دل ای جان نمی‌رسد به علاج

چرا همی‌شکنی جان من ز سنگدلی
دل ضعیف که باشد به نازکی چو زجاج

لب تو خضر و دهان تو آب حیوان است
قد تو سرو و میان موی و بر به هیأت عاج

فتاد در دل حافظ هوای چون تو شهی
کمینه ذره خاک در تو بودی کاج

به دینی ئێــوه ئه گەر خوێنی عاشقــانه مەبــاح
به مەزهەبی گەلی رەنـدان مەباحــی تۆیه سەلاح
شـەواری زولفـی رەشت بوو شـەوی بەدیهێنــا
هەتاوی روومـەتی جوانت شکانی شەقڵی سەباح
دڵێ له تیــری کەوانی رەشــی نەماوە بە ساغ
له بەندی زولفی کەمەندی سـەرانی دژ به گوناح
چەمێ له سووچی گلارم ئەچێ که هەر مەلـەوان
بـه دیتــنی لـه هەلاتـن، به دڵ دەکــات تەماح
حەیــات و هێــزی مه ئـاوی ژیانی لێوی ئەتۆن
دوعـا به لێــوی ئەوین بۆیه بۆت ئەبێــته سیلاح
له لەعلــی لێوتــم ئاخــر به لالە ماچــێ سەنـد
دڵــم به نالــه گەیی عاقیــبەت به مــافی مەباح
خەلاتی گیــانتــه دوعــا به گیــانی تامــەزرۆم
به بێبڕانــەوە شــەو تا دەگــەم به بەژنـی سەباح
تەڵەب له من مەکه «حافز»! سەلاح و تۆبه له مەی
له شێــت و عاشقی رەندی کەسێ نەدیوە سەلاح
وتووته جەژنه به «کۆلیــل» ئەدەم خەلاتـی مــاچ
بەڵێ وتـوومه بەڕاسی، وەلێ به قەستــی مەزاح!

اگر به مذهب تو خون عاشق است مباح

صلاح ما همه آن است کان تو راست صلاح

سواد زلف سیاه تو جاعل الظلمات

بیاض روی چو ماه تو فالق الاصباح

ز چین زلف کمندت کسی نیافت خلاص

از آن کمانچه‌ی ابرو و تیر چشم نجاح

ز دیده‌ام شده یک چشمه در کنار روان

که آشنا نکند در میان آن ملاح

لب چو آب حیات تو هست قوت جان

وجود خاکی ما را از اوست ذکر رواح

بداد لعل لبت بوسه‌ای به صد زاری

گرفت کام دلم ز او به صد هزار الحاح

دعای جان تو ورد زبان مشتاقان

همیشه تا که بود متصل مسا و صباح

صلاح و توبه و تقوی ز ما مجو حافظ

ز رند و عاشق و مجنون کسی نیافت صلاح

دەروونـم پڕ لـە عـەشـقی رووی دڵبـەر
پـەرێشـانە بە چەشنـی مـووی دڵبـەر

مەگەر زولفی رەشی، ئیـزنی نەبوو کـەس
بکـا ماچێـکی رووگـەی رووی دڵبەر

ئەمن خۆزگەم دەبوو بەختێکی رەش وەک
خـەت و کاکـۆڵ و دوو هێنـدووی دڵبەر

بە بـەژنی سـەروی ئـازادا نەبڕیـا
شکـۆی بەژن و قـەدی هەڵچـووی دڵبەر

دە ساقی تێکـە بۆم جـامێ! بە یـادی
دو چـاوی ساحیـر و جـادووی دڵبـەر

فەلـەک بەژنی چەمـانم چون کـەوانێ
بە غـەم پەیـوەس چمان ئەبرووی دڵبـەر

نەرێتـی میسکی تـاتـاری خەجـڵ مـا
لـە لا دوو زولفـی عەمبـەرخـووی دڵبەر

دڵـی هەرکـەس ئەدا چـڵ بۆ ئـەوینێ
دڵـی مـن چـڵ ئـەدا بۆ کـووی دڵبەر

غـولامی هیممـەتی بـەرزی کەسێـکم
وەکـوو «حافز» لەجـێ کەوتـووی دڵبـەر

لە مەیـدانی وەفـا «کۆلیـل»ـەکـەی تـۆ
سـەر و دڵ گـۆیـە بۆ گێسـووی دڵبـەر

دل مـــن در هـــوای روی فـــرخ
بـود آشفتـه همچـون مـوی فـــرخ
بجز هنـدوی زلفش هیـچ کس نیست
که برخـوردار شـد از روی فـــرخ
سیـاهی نیک‌بخت است آن که دایـم
بود همـــراز و هـــم‌زانـوی فـــرخ
شـود چـون بیـد لـرزان سـرو آزاد
اگر بینـد قـد دلجـوی فـــرخ
بـده سـاقی شـراب ارغـوانـی
به یـاد نرگس جـادوی فـــرخ
دوتـا شـد قامتـم همچـون کمانی
ز غــم پیوسته چون ابـروی فـــرخ
نسیـم مشـک تـاتـاری خجـل کرد
شمیـــم زلـف عنبـربـوی فـــرخ
اگر میـل دل هـرکس به جـایی‌ست
بـود میـل دل من سـوی فـــرخ
غـلام همـت آنـم کـه باشـد
چو حافـظ بنـده و هنـدوی فـــرخ

یادی بەخێــر دوێنــە وتی پیــری مەیفرۆش
مەی تێکە غەم بە با دە لە بادەی سەفا کە نۆش!

پێـم وت شەرابی ئێـوە بە بــا ئابـڕوو ئەدات
فەرموی بەقەولّی من کە، لە لۆمەت نەبێ پەرۆش

قازانج و مایە چەشنی زەرەر گشت ئەچێ لەدەس
بۆ مامەڵەی وەهــا نییە غەمگیـن سەری بە هۆش

لەو جێ کە تەختی جەم بە فەنا چوو ئەگەر کەسێ
دونیــا بکا بە مــایە، بە بـا، کــا دەکـا فرۆش

«حافــز»! ئەگەر لە پەندی حەکیمان مەلوولی، با
کۆتا کـەم ئەم وتــارە، کە من مردم ئێـوە خـۆش

«کۆلیــل» ئەگەر لە لوتفـی وتـەی خاجە ناگەیی
وەک نیشتووی بنیشە خەمیندۆش و غەم لە کۆش

دی پیـر می فـروش که ذکرش به خیر باد
گفتـا شـراب نوش و غـم دل ببر ز یـاد
گفتـم به باد می‌دهـدم بـاده نـام و ننـگ
گفتـا قبـول کن سخـن و هر چـه باد باد
سود و زیان و مایه چو خواهد شدن ز دست
از بهـر این معاملـه غمگیـن مباش و شاد
بادت به دست باشـد اگـر دل نهی به هیـچ
در معرضـی که تخت سلیمـان رود به باد
حافـظ گرت ز پنـد حکیمـان ملالت است
کوته کنیـم قصـه که عمـرت دراز بـاد

شـەراب و بەزمی دزی مەرگـی رەندی سـەرشادە
دەچینە کـۆڕی حـەریفـانی مەست و ئـازادە

گـرێ لە دڵ کـەوە، فکری فەلـەک لە سـەر لاوە!
کە لـەم گرێ سـەری زانـا گ قوفڵـە، خۆ لادە!

لە ئـاڵوگۆڕی چەرخ سـڕ مەمێـنە چونکە زەمان
لە مەکـر و فێـڵ هـەزاران هـەزاری بێـدادە

قەدەح بە رەسمی ئەدەب بگرە! چون لە خاکی سەری
جەنـابی بەهمـەن و جەمشیـد و سـەردەمی مـادە

خەبەر نەهـاتەوە کـاووس و کەی بەرەو کوێ چوون
وە یـا چلـۆنە کە جـەم تەخت و بەختی بەربـادە

لە حەسـرەتی دەمی شیـرین دەبیـنم ئێستـاکەش
گولاڵەسـووره شەلاڵـی هـەنـاوی فەرهـادە

یەقیـن گولاڵـە زەمـانی بە بێبەڵێـن زانـی
کە کـەف لە بوونـەوە تـا چـون، بە جـامە ئامـادە

وەرن هەتاکـو زەمـانێ مـەس و هەوایـی بیـن
مەگـەر وەهـا بحەسینـۆ لە ئـەم هـەوا وادە

بزەی دەمـی (جـەخـەتـوون) و هەواری (هەورامـان)
سەفـەر خەوێنـی خوجەنـد و فـوراتی بەغـدادە

مەنۆشە مەی وەکـو «حافـز» مەگەر بە نالـەی چەنگ
کـە تێکـەلاو بـە هـەورێشمـی، بەسـەی شـادە

دەڵێـن وتوویـە بـە «کۆلیـل» وێـڵ و بێکـارەن
بڵێـن بە شێتییـە سـەرگەرم و کـاری ئازادە

شـــراب و عیش نهـــان چیست کـار بی‌بنیـاد
زدیم بر صـــف رنـــدان و هرچه بـادا بـــاد

گـــره ز دل بگشـــا و از سپهـــر یـــاد مکن
که فکر هیـــچ مهنـــدس چنـین گره نگشاد

ز انقـــلاب زمـــانه عجب مـدار که چـــرخ
از این فســـانه هـــزاران هـزار دارد یـــاد

قـــدح به شـــرط ادب گیـــر زان که ترکیبش
ز کـــاسه‌ی سر جمشیـــد و بهمن است و قباد

که آگه است که کاووس و کی کجا رفتنـــد
که واقف است که چون رفت تخت جم بر باد

ز حســـرت لب شیـــرین هنـــوز مـــی‌بینـــم
کـــه لالـــه می‌دمـد از خـون دیده‌ی فرهـــاد

مگـــر که لاله بدانست بی‌وفـــایی دهـــر
که تا بـــزاد و بشـــد جـــام می ز کف ننهـاد

بیـــا بیـــا که زمـــانی ز می خـــراب شویـــم
مگـــر رسیم به گنجـی در این خـــراب آبـاد

نمی‌دهنـــد اجـــازت مرا به سیـــر و سفـــر
نسیـــم بـــاد مصـــلا و آب رکـــن‌آبـــاد

قدح مگیـــر چو حافـــظ مگر به ناله‌ی چنگ
که بستـــه‌اند بر ابریشـــم طـــرب دل شـــاد

دوێشەو سەبا، هەواڵی سەفەرکەردە هات بات
بردی شەماڵ دڵم و بەڕێ هەرچی هات هات

کارم هەر ئاخی ناخە بە ڕۆژا، شەوانەشم
چەخماخە دڵ ئەدات و لە بەرقی هەوات وات

دڵ وا ئەسیری زولفە، ئەوینی بە زێدی خۆ
یانی وڵاتی سینە، لە بەر کۆی لەقات قات

خوا، ڕۆحی پەندبێژی مە شا کا بە دڵبەری!
بۆ لێوی ئەو جووانە، کە نوقڵ و نەبات بات

دڵ جەرگی خوێنە چونکە گوڵی دی لە مێرگوڵان
دوگمەی بەرۆکی بازە بەرەو سروە کات کات

بێهێزە لەش لە دەس چووە، دیسان لە نۆ ژیان
ئازیزا! بەو هەژارە مەگەر هەر سەبات بات

«حافز»! بەهۆی سرشت و خدەی پاکی کامەران
چون سینە سافی عەشقی، دڵی خۆرهەڵات لات

«کۆلیل» ئەو غوڵامە کە دیوانی وەسفی تۆن
هاوار چۆن لە دەستی ئەوینت شکات کات

دوش آگهی ز یار سفر کرده داد باد
من نیز دل به باد دهم هرچه باد باد

کارم بدان رسید که همراز خود کنم
هر شام برق لامع و هر بامداد باد

در چین طره‌ی تو دل بی‌حفاظ من
هرگز نگفت مسکن مالوف یاد باد

امروز قدر پند عزیزان شناختم
یا رب روان ناصح ما از تو شاد باد

خون شد دلم به یاد تو هر گه که در چمن
بند قبای غنچه گل می‌گشاد باد

از دست رفته بود وجود ضعیف من
صبحم به بوی وصل تو جان بازداد باد

حافظ نهاد نیک تو کامت برآورد
جان‌ها فدای مردم نیکونهاد باد

کاتی دڵداری و ئەوین یادی بەخێر!
ماچ و مووچ و بەی گوشین یادی بەخێر!
کوشتمی ژاری غەمی دووری لە یار
خورخورِی مەی هاونشین یادی بەخێر
چووم ئەگەرچی من لە بیری هاوەڵان
پڕ لە سینگی من لەوان، یادی بەخێر
بۆ نەجاتی دڵ لە بەندی غەم ئەڵێم
یەکیەتی کۆڕی بەرین، یادی بەخێر
چۆمی چاوانم دەچێ بۆ (ئەرخەوان)
(باخی بەردێ) ژوانی ژین، یادی بەخێر
رازی «حافز» باسی ئیتر ناکرێ
کوا رەفێقی رازیین؟ یادی بەخێر
بەکرە دژ «کۆلیل»ی وەک مەم خستە داو
بێخەبەر ماوم لە زین، یادی بەخێر

روز وصـــل دوستـــداران یـاد بـــاد

یـــاد باد آن روزگـــاران یـــاد باد

کامـم از تلخی غـم چون زهـر گشت

بانــگ نـوش شـادخـواران یـاد باد

گرچـــه یـــاران فـــارغ‌اند از یـاد من

از مـــن ایشـان را هـــزاران یـاد باد

مبتـلا گشتـــم در ایـــن بنـــد و بـلا

کوشــش آن حـق گـــزاران یـاد باد

گر چه صد رود است در چشمم مـدام

زنــده‌رود بـــاغ کـــاران یـــاد بـــاد

راز حافـــظ بعد از این نـــاگفته مـــاند

ای دریغـــا رازداران یـــاد بـــاد

جەماڵت رۆژی هەر دید و نەزەر بێت
جووانی کوڵمەکانت روو لە سەر بێت
موبارەك شاپەڕی شاهێنی زولفت
لە سەر نوختەی دڵی شێتم چەمەر بێت
کەسێ رۆحی لە بەندی زولفی تۆ نین
شەلاڵی خوێنی حەوجۆشی جیگەر بێت
دڵێ بۆ عەشقی کوڵمت هەڵنەچۆقێ
لە خوێنی جەرگی خۆ نوقمی خەتەر بێت
جووانا! چونکە تیرئەندازە نازت
دڵی زاماری من بۆ ئەو سپەر بێت
کە لێوی کانی شەکرت ماچ ئەبەخشێ
دەمی گیانم بە لەعلت پڕ شەکەر بێت
لە من هەر ساعەتێ عەشقێکی تازە
کە تۆ هەر چرکە حوسنت بەر لە بەر بێت
پەپوولەی خۆری رووتە گیانی «حافز»
گەلێ موشتاقی لوتفێکم، ئەگەر بێت
لە پێی پامورەکەی ملتا شەو و رۆژ
دڵی «کۆلیل»و وێڵم سەر لە بەر بێت

جمـــالت آفتـــاب هر نظـــر بـــاد

ز خـــوبی روی خـــوبت خوب‌تر بـــاد

همـــای زلف شاهیـــن شهپـــرت را

دل شاهـــان عـــالم زیـــر پـر بـــاد

کســـی کـو بستـــه‌ی زلفت نبـــاشد

چو زلفت درهـــم و زیـــر و زبـــر بـــاد

دلی کـو عـــاشق رویت نبـــاشـــد

همیشـه غرقـــه در خـــون جگـــر بـــاد

بتـــا چون غمـــزه‌ات ناوک فشـــاند

دل مجـــروح من پیشـــش سپـــر بـــاد

چو لعـــل شکرینت بوســـه بخشـــد

مـــذاق جـــان من زو پرشکـــر بـــاد

مرا از توست هـــر دم تـــازه عشقـــی

تو را هر ســـاعتی حسنـــی دگر بـــاد

به جـــان مشتـــاق روی توست حافظ

تو را در حـــال مشتـــاقان نظـــر بـــاد

سۆفی ئەر جام بنۆشێ ژەم و دەم، نۆشی بێ!
گەر نەناسێ حەدی خۆ، بادە فەرامۆشی بێ
هەرکەسێ لەو مەیە سەرتر لە قومێ نۆش نەکات
دەستی ئاواتی لە مل، دڵبەری سەرخۆشی بێ!
پیری مەیخانە وتی خەتتی خەتای نەبوّە قەڵەم
بارەکەڵڵا لە وتەی چاك و خەتاپۆشی بێ
شاهی توووران کە قسەی فیتنە ئەبیسێت بە دڵ
ئێشی تۆی جەرگی سیاوەش لە دڵی خۆشی بێ
گوڵ لەبەر شان و شکۆ و نازی لەگەڵما نەدووا
گیان بەقوربانی شکۆفەی دەمی خامۆشی بێ
چاوم ئاوێنەگری خاڵ و خەتی سەوزی و لێو
ژەم و دەم ماچڕفێنی دەم و لیمۆشی بێ
دیدەیی خەڵكنەواز و مەس و شەرمینی ئەگەر
خوێنی ئێمەی بە قەدەح ناوە لەسەر، نۆشی بێ
شۆرەتی دەرچووە «حافز» بە غوڵامت، چ دەبێ
دوو خەمی زولفی رەشی ئێوە لە دوو گۆشی بێ
لایەقی پێشکەشی ئەو کەی سەری «کۆلیل»ـە، مەگەر
هەر بە خۆراکی دو رەشماری لەسەر دۆشی بێ

صوفی ار بـاده به انــدازه خورد نوشش باد
ور نه اندیشــه‌ی این کــار فراموشــش بـاد

آن که یک جرعه می از دست توانـد دادن
دسـت با شـاهد مقصــود در آغوشـش بـاد

پیـــر ما گفت خطـا بر قلــم صنـع نرفت
آفـرین بر نظـر پــاک خطـاپوشش بـــاد

شـــاه ترکـــان سخن مدعیـــان می‌شنـود
شــرمی از مظلمــه‌ی خون سیــاووشش باد

گــرچه از کبر سخن با من درویـش نگفت
جـان فـدای شکـرین پسته‌ی خاموشش باد

چشمــم از آینــه‌داران خط و خالش گشت
لبـم از بوســه ربـایـان بر و دوشـش بـــاد

نرگس مسـت نـوازش کــن مــردم دارش
خون عــاشق به قدح گر بخـورد نوششِ باد

به غــلامی تو مشهـور جهـــان شد حافـــظ
حلقـه‌ی بنــدگی زلف تو در گوشـش بـاد

لەشـــت بە نـــازی حەکیمـــان منەت بـژار نەبێت
وجوودی ناسکـت ئـالـۆز و دەردەدار نەبێـت
هەمـوو سـلامەتی دونیـا سـەری سـلامەتی تۆن
بـە ژاری هیچ گەزۆکـێ دڵت پـەژار نەبێـت
ڕەواجی زاهیـر و باتـن لە کـۆی سلامەتی تۆن
کە ڕەببـی باتـن و زاهیـر غەمـت بە بـار نەبێت
خـەزان دەمێ کە خەزێنـەی چەمەن دەکا غارەت
بە تووشی قـامەتی سـەروی تـەڕ و چنـار نەبێت
جەمـالی ئێوە لە هەر جێ خەریکی جیلوەگەرین
مـەجـالی لۆمـەگەری خۆنوویـن و لار نەبێـت
وەک ئەسپـەنەر لە سەر ئاگر ببێـتە دووکەڵ و مژا
کەسێ بە دیتـنی کولـمت شوکـرگوزار نەبێت
شفـا تەڵەب کە! لە شەکری کەلامی «خاجـە» هەتـا
نیـازی دڵ بە عەلاجـی گوڵی بەهـــار نەبێـت
شـەرابی وەک غەزەڵی سافی تۆم نەدی «کۆلیـل»!
مەگـەر وتـاری دولێـوی شەکـەرتەبـار نەبێت

تنت به نـــاز طبیبـــان نیـــازمنـــد مبـــاد

وجـــود نازکـــت آزرده‌ی گـــزند مبـــاد

ســـلامت همـــه آفـــاق در سلامت توست

به هیچ عارضـــه شخص تو دردمنـــد مبـــاد

جمـال صورت و معنی ز امن صحت توست

کـه ظـــاهرت دژم و باطنـت نژنـــد مبـــاد

در این چمن چو درآید خـــزان به یغمـــایی

رهـــش به ســـرو سهـــی قـــامت بلنـد مباد

در آن بســـاط که حسن تو جلـوه آغـــازد

مجـــال طعنـــه‌ی بدبیـــن و بـدپسند مبـــاد

هر آن که روی چو مـاهت به چشم بد بیند

بر آتش تو بجـــز جـــان او سپنـد مبـاد

شفـــا ز گفتـــه‌ی شکرفشـــان حافـــظ جوی

که حاجتت به عـــلاج گـــلاب و قنـد مباد

بەژنت تـەڕ و ئەبـرۆت هـەسـون بێت!
ڕوومەت گوڵی ژاڵە سووری ڕون بێت!

سـەر پڕ لە وتـاری عەشـقی شیـرین
کۆکـەن لە بنـاری بێستـون بێـت

ئەو سـەروە کە سـەوز ئەبێ لە گـوڵزار
بۆ خـزمەتی بەژنـەکەت نگـون بێت

چـاوێ کە نەبێ خومـاری چـاوت
وەک گەوهەری من شەلاڵی خون بێت

چـاوت لـە بـوواری دڵـڕفێـنی
پڕپڕ لـە فـریو، فـەن و فسـون بێت

هەر سینـە هەمیشـە کەیلـی عەشقـت
لێـوانە لە ناڵـە! بێسکـون بێـت

قـەدقـامەتی تـۆ قیـامی تـا کـرد
چی قـامـەتە خـەم بە شکـڵی نـون بێت

کێ دڵ لە خـەمی کـەزێتـە ئـازاد
لـەم کـۆڕی ئەوینـە تەفـر و تون بێت

لێـوت کە لە سـەریە گیـانی «حافـز»
یـاڕەب بـە حـەرامی لێـوی دون بێت

فێـداری بـزەت لـە مێـژە «کۆلیـل»
بـەو دەردەوە تـا دەچـێ زەبون بێت

حسن تو همیشه در فزون باد
رویت همه‌ساله لاله‌گون باد
اندر سر ما خیال عشقت
هر روز که باد در فزون باد
هر سرو که در چمن درآید
در خدمت قامتت نگون باد
چشمی که نه فتنه‌ی تو باشد
چون گوهر اشک غرق خون باد
چشم تو ز بهر دل‌ربایی
در کردن سحر ذوفنون باد
هر جا که دلی‌ست در غم تو
بی‌صبر و قرار و بی‌سکون باد
قد همه دلبران عالم
پیش الف قدت چو نون باد
هر دل که ز عشق توست خالی
از حلقه‌ی وصل تو برون باد
لعل تو که هست جان حافظ
دور از لب مردمان دون باد

شاریارا سەری گەردون خەمی گۆچانت بێ!

هەر هەموو تۆپی زەمین جێگەیی جەولانت بێ

پرچی خاتوونی زەفەر پەرچەمی پیرۆزت بێ

چاوی سەرکەوتنی تا سەر حەزی جێژوانت بێ

نووسەری وەسفی شکۆتان عوتارد شەو و ڕۆژ

کۆمەڵی ژیر، قەڵەمهەڵگری دیوانت بێ

سەروی باڵا شکسی داوە بە توووبای بەهەشت

باخی فیردەوس بە داخی گوڵی لێوانت بێ

عالەمی خەڵک نەتەنیا وەکو ئینسان و جەماد

عالەمی ئەمر وەکوو گیان لە فەرمانت بێ

قژی شۆڕت ملی «کۆلیل» بخنکێنێت و

سەر و سامان و دڵ و گیانی بەقوربانت بێ

خسروا گوی فلک در خم چوگان تو باد
ساحت کون و مکان عرصه‌ی میدان تو باد

زلف خاتون ظفر شیفته‌ی پرچم توست
دیده‌ی فتح ابد عاشق جولان تو باد

ای که انشاء عطارد صفت شوکت توست
عقل کل چاکر طغراکش دیوان تو باد

طیره‌ی جلوه‌ی طوبی قد چون سرو تو شد
غیرت خلد برین ساحت بستان تو باد

نه به تنها حیوانات و نباتات و جماد
هرچه در عالم امر است به فرمان تو باد

زۆرێکە گوڵم عەتر و گوڵاوێکی نەداپێم
بۆ ئاگری دڵ گۆزەڵە ئاوێکی نەداپێم
سەد جارە دڵی بێسەر و پێم چوو بە دووایا
هەر ماتڵی جواوێکم و جواوێکی نەداپێم
مامز رەوشێ، کەو خەت و خاڵێکی نەهاتۆون
بێ چاو و سەرم هەی سەر و چاوێکی نەداپێم
زانی کە مەلی دڵ لە بەدەن کۆچەرە بۆچی
لەو زولفە رەش و خاویە داوێکی نەداپێم
هەرچەندە کە ساقی خەبەری لێمە خومارم
لەو لێوە شەکەر بارە شەراوێکی نەداپێم
ئەونەی کە دەمم دا، لە پلەی شۆرەت و ناوم
نەیبوو نەزەرێ شۆرەت و ناوێکی نەدا پێم
«حافز» کە غوڵامێکە ئەدەب وایە نەپرسێ
وەسفی چییە ئازیز کڵاوێکی نەداپێم
«کۆلیل»م و بێزەین لە رازی دەمی زانای
بەمحاڵەوە رەمزی سەرە واوێکی نەداپێم

دیری است که دلدار پیامی نفرستاد
ننوشت سلامی و کلامی نفرستاد
صد نامه فرستادم و آن شاه سواران
پیکی ندوانید و سلامی نفرستاد
سوی من وحشی‌صفت عقل‌رمیده
آهو روشی کبک خرامی نفرستاد
دانست که خواهد شدنم مرغ دل از دست
و از آن خط چون سلسله دامی نفرستاد
فریاد که آن ساقی شکّرلب سرمست
دانست که مخمورم و جامی نفرستاد
چندان که زدم لاف کرامات و مقامات
هیچم خبر از هیچ مقامی نفرستاد
حافظ به ادب باش که واخواست نباشد
گر شاه پیامی به غلامی نفرستاد

بـەم پیــــرییە عەشقــی دەمی لاویـم بە ســەر کەوت
ئـەو رازە حـەشـــارم لــە دڵا دابـــو بــە دەرکــەوت

ســەیرانی مـەلـی سینــە هــەواگیـــری نــەزەر بـــوو
ئەو دڵمــــە تەمـاشــا لـە چ داوێکی خەتـەر کەوت

هـــاوار لە ئاسکـی خوتـەن و چـاوی رەشـــی ئـــەو
وەک موشکی بەری نێوکی چ خوێنم لە جگەر کەوت

بـــۆی خــاکی دەر و رێـــگوزەری تـۆیە لــە سەرمــا
هـەر عەتـــر و عەبیـــرێ کە بە دەستم لە سەحەر کەوت

تــــا تێـغی جەهـــــانـگیــری ئـەکێشـێت مـژۆڵـت
هـەر گۆی ســەری دڵزینـدووە بەو نێزەوە سەرکەوت

دەرکەوتـــووە بۆ ئێمـــــە، مەکـــۆی تـۆڵــەیە گـــەردون
لـەم کـــۆڕە تڵتنۆشــە ئەوەی کەوتـــووە هـەر کەوت

نـابێــتە لەعـــــل مـــوورە شـــەوەی بەخت بە رۆحیـــش
چی دێ لە ســــرشتـــێ کە بە قسمـەت شەوی بەرکەوت

«حافــز» کـە بـە چـــاوســاغیی زولفـت بەســـەری بوو
ئەفســـووس ئەمێستـــاکە لە دەس کێش و نەزەر کەوت

ســـەد وادەیـی دیـــــداری لــە گیـــرفانی درۆ خســت
هەستـــــاوە درۆ بەختـــی و ئیقبـاڵی «عومـــەر» کەوت

پیــرانه ســـرم عشــق جــوانی به ســر افتاد
وان راز کـــه در دل بنهفـــتم به در افتــاد

از راه نظـــر مرغ دلـم گشت هـواگیـــر
ای دیــده نگـــه کن که به دام که درافتـــاد

دردا که از آن آهــوی مشکیـن سیـــه چشم
چون نافـه بسی خــون دلـم در جگـر افتــاد

از رهگـــذر خـــاک ســر کوی شمـــا بـود
هر نافـــه که در دست نسیـــم سحــر افتـــاد

مژگـــان تو تـا تیـغ جهـــان‌گیـــر برآورد
بس کشتـــه‌ی دل‌زنـده که بر یک‌دگر افتاد

بس تجــربه کردیــم در ایـن دیر مکـــافات
با دُردکشـــان هـــر که درافتـــاد بـــرافتـــاد

گر جــان بدهـــد سنـگ سیـــه لعل نگـردد
با طینـــت اصلـــی چه کنـــد بدگهـــر افتـــاد

حافـــظ که سر زلـف بتـان دست‌کشش بود
بس طرفه حریفی‌ست کش اکنون به‌سر افتاد

نووری روخساری ئەتۆ تا بە دڵی جام کەوت
لە بزەی مەی سەری ئاشق بە حەزی خام کەوت
لوتفی هەنیەت نەزەرێکی لە دڵی ئایەنە دا
بۆیە چی نەخشە لە جامی جەمی ئەوهام کەوت
مەی کە ئەو عالەمە نەخشین و نیگارەی دەنواند
شەوقی سەر روومەتی مەیگێڕە لە نێو جام کەوت
شێری عەشقت مەتەقی تاقمی خاسانی بڕی
چۆنە رازی غەمی لێوت بە دەمی عام کەوت
من لە مزگەوتەوە بۆ خۆم بە خەرابات نەچووم
ماف و رێکەوتی ئەزەڵ بوو، کە سەرەنجام کەوت
چم لە دەس دێ وەکو پەڕگار نەکەم باوەخولێ
گێژە چون هەرکە لە گێژ و خولی ئەییام کەوت
دڵ دەسی دا کەمەنی زولفی لە چاڵی زەقەنا
وەی کە لەو چاڵە وەدەرهات و لە نێو دام کەوت
گوزەرا ئەو دەمە سۆفی! لەگەڵت بێمە مزەوت
دەس لە مل ساقی و کارم بە بزەی جام کەوت
زەبری شمشێری برۆ بەزم و زەماوەندە لە لام
چونکە رووسوورە کەسێ خوێنی و پڕزام کەوت
هەردەمێ تازە دەواییکی لەبۆ دەرد نوواند
شا! گەدایێ کەرەمی شاهی چەن ئارام کەوت
بادە نۆشانن و چاوگێڕ هەموو شێخ و مەلا
«حافز»ی دڵ کەسەرم لەم جەمە بەدنام کەوت
دەمی خۆش بێ کە لە بەدناویی «کۆلیل» دەڵێ
چونکە ئەم شۆرەتی بەدناوییە فریام کەوت

عکس روی تو چـو در آینه‌ی جـام افتـاد
عـارف از خنـده‌ی می در طمع خـام افتاد
حسن روی تو به یک جلوه که در آینه کرد
این همـه نقـش در آیینـه‌ی اوهـام افتـاد
این همه عکس می و نقش نگارین که نمود
یک فـروغ رخ ساقی‌ست که در جام افتـاد
غیـرت عشق زبـان همه خـاصـان ببـرید
کز کجا سـر غمش در دهـن عـام افتـاد
من ز مسجـد به خـرابـات نه خـود افتادم
اینـم از عهـد ازل حاصـل فرجـام افتـاد
چه کنـد کز پی دوران نرود چـون پرگار
هـر که در دایـره‌ی گـردش ایـام افتـاد
در خـم زلف تو آویخت دل از چـاه زنـخ
آه کـز چـاه بـرون آمـد و در دام افتـاد
آن شـد ای خواجه که در صومعه بازم بینی
کـار مـا با رخ سـاقی و لب جـام افتـاد
زیر شمـشیر غمـش رقص‌کنـان باید رفت
کآن‌که شد کشته‌ی او نیک سرانجـام افتـاد
هر دمـش با من دل‌سوخته لطفی دگر است
این گـدا بین که چه شایسته‌ی انعـام افتـاد
صوفیـان جمله حریف‌انـد و نظـرباز ولـی
زین میـان حافـظ دل‌سوخته بدنـام افتـاد

کێ بە دڵبەر گوڵی روو سومبول و نەسرین ئەدات
تــاملّــێکیش بە گیــان و دڵــی غەمگیــن ئەدات
دەس‌درێژی لە چ کـەس زولفی درێژت بووە فێــر
لــەو ئەپارێمــەوە، بێ‌شک بە ئـەوم شیـن ئەگات
من دەســم ئەو دەمـە بــەرداوە لە فەرهــادی دڵــم
دیم کە باسی غەمی خــۆ بۆ دەمـی شیـرین دەکات
گەنج و زێڕم کە نەبێ سـووچی قەنـاعەت بەڵــەدم
چەرخـە! بەم چیــنە هەژاری بە گەلێ چیـن ئەدات
شۆخــە ئەم شــاژنی دونیـا بە رووالّــەت، وە بەڵام
شوو بە هــەرکەس کە بکا گیــانی لە کابین ئەبات
دامـەنی سـەروی قەراخی چەمـەن ئەگرم لەمە پاش
غەم لە خۆ بۆ جەڵەکەم؟ خۆر کە لە حەوسین هەڵات
دڵی «حافـز» لە جەفـاکانی فەڵەک خوێنی پەتیـن
کێ مەگەر خاجە عەلاجـی دڵی خوێنــین ئەکات
رەنگی گوڵناریـیە ئەشکم بە ئەوینـی گوڵی رووت
خوێنی «کۆلیل»ـە پەراوێــزە لە گوڵچیـن کەوات

آن که رخسار تو را رنگ گل و نسرین داد

صبر و آرام تواند به من مسکین داد

وان که گیسوی تو را رسم تطاول آموخت

هم تواند کرمش داد من غمگین داد

من همان روز ز فرهاد طمع ببریدم

که عنان دل شیدا به لب شیرین داد

گنج زر گر نبود کنج قناعت باقی‌ست

آن که آن داد به شاهان به گدایان این داد

خوش عروسی‌ست جهان از ره صورت لیکن

هر که پیوست بدو عمر خودش کاوین داد

بعد از این دست من و دامن سرو و لب جوی

خاصه اکنون که صبا مژده‌ی فروردین داد

در کف غصه‌ی دوران دل حافظ خون شد

از فراق رخت ای خواجه قوام‌الدین داد

وەنەوشە دوێ بە گوڵی خۆش وت و نیشانیدا
کە پێچی زولفمی بەم شێوە هەر فلانی دا
دڵم خەزێنەیی رازی نهێن بو دەستی قەزا
لە ئێمە ژەندی و رەمزی بە چاوەکانی دا
شکاوە باڵم و هاتوومە ئاستانێ تۆ
بە مۆمیاتمی دوکتور کە نێونیشانی دا
بە لەش سلامەت و دڵشاد بێت و خاتری خۆش!
کەسێ کە هێز و تەوانێکی بێتەوانی دا
بە فیکری خۆ بە بڕۆ واعیز ئەی هەواری ریا
شەراب و دلبەری شیرین لە کێ زیانی دا؟!
بە لا منا گوزەری کرد و خۆش وتی بە رەقیب
کە چەندە «حافز»ی بێچارە سەخت گیانی دا
حەیا لە مەزهەبی کوردا حەیاتە، بۆیە «عومەر»
حەیای ئەگەرچی رەقیبی نەبوو ئەمانی دا

بنفشه دوش به گل گفت و خوش نشانی داد
که تاب من به جهان طره‌ی فلانی داد
دلم خزانه‌ی اسرار بود و دست قضا
درش ببست و کلیدش به دلستانی داد
شکسته‌وار به درگاهت آمدم که طبیب
به مومیایی لطف توام نشانی داد
تنش درست و دلش شاد باد و خاطر خوش
که دست دادش و یاری ناتوانی داد
برو معالجه‌ی خود کن ای نصیحت‌گو
شراب و شاهد شیرین که را زیانی داد
گذشت بر من مسکین و با رقیبان گفت
دریغ حافظ مسکین من چه جانی داد

ئەگەر بە دڵ نەزەرێکت بە جێ گوزەرمانە
هومای بەختەوەری سێبەری لە سەرمانە
لە خۆشیا لە سەرم دیق ئەکا حوبابی کڵاو
لە ساغەر ئەو دەمە وێنەت لە بەر نەزەرمانە
شەوێ کە مانگی ئەمەل نوور ئەدا بە گەڵ، بێژی
بدا لە ئەو دڵە تاریک و پڕ کەسەرمانە؟
بە ئاستانی شکۆتانی با نەبوو بارێ
مەجال کەی بە سڵاوێکی دەربەدەرمانە
فیدای لێوی دەمێ بوو دڵم، خەیاڵم ئەکرد
کە یەک تنۆک لە لەعلی بەشی هونەرمانە
خەیاڵی زولفی وتی گیان کە لەعلی لێو ناکات
گەلێ نەچیری خەمی زولفی شەوخەتەرمانە
کە دڵ گرانی مەڕۆ لێرە لێدە فاڵێ خۆش
چون ئێرە دەرکی موراد و هەواری هەرمانە
دەمێ حەکایەتی خاکی دەرت دەکا «حافز»
نەسیمی باخی مەعانی لە مێشکی سەرمانە
کە مانگی روومەتی خەرمانی نوورە، «کۆلیل»یش
بە خۆی و شیعری لە دەوری دەبێتە خەرمانە

همای اوج سعادت به دام ما افتد
اگر تو را گذری بر مقام ما افتد
حباب وار براندازم از نشاط کلاه
اگر ز روی تو عکسی به جام ما افتد
شبی که ماه مراد از افق شود طالع
بود که پرتو نوری به بام ما افتد
به بارگاه تو چون باد را نباشد بار
کی اتفاق مجال سلام ما افتد
چو جان فدای لبش شد خیال می‌بستم
که قطره‌ای ز زلالش به کام ما افتد
خیال زلف تو گفتا که جان وسیله مساز
کز این شکار فراوان به دام ما افتد
به ناامیدی از این در مرو بزن فالی
بود که قرعه‌ی دولت به نام ما افتد
ز خاک کوی تو هر گه که دم زند حافظ
نسیم گلشن جان در مشام ما افتد

نمامی خۆشەویستی باخی دڵداری بە بارێنێ
درەختی دژمنی ببڕن قەتارەی هێلکەمارێنێ
لە خاکی دەرکی مەیخانان ئەدەب بنوێنە بۆ ڕەندان
بە مەستی سەرکەشی کردن لە سەر دەرکەی! خومارێنێ
شەوی دیداری دڵبەر خۆش هەلێکە با لە دەس نەڕوا!
کە گەردون هەڵدەسووڕێت و گەلێ لەیل و نەهارێنێ
کەژاوەی کیژە لەیلا خاوەنی تەختی شکۆ یاڕەب
چ بوو بەو ڕێگەدا بڕوا! کە مەجنون خوێن ئەبارێنێ
بەهاری ژینە عەشق ئەی دڵ! ئەگینا لەم چەمەنزارە
گەلێ گوڵ هات و با بردی، هەزار ئێستاش ئەزارێنێ
دە سا تۆ بی‌و خودا دڵ چون قەراری وا لە گەڵ زولفت
لە لێوی شیرنت ماچێ کەرەم فەرمووا قەرارێنێ
خودا! لەم باخی دونیا تا بە مردن «حافز»ی پیرت
لە جێژوانی لچی جۆ دەم لەسەر لێوی نیگارێ نێ
سەری هەرچەن سپی چەشنی سەحەر «کۆلیل» بوو ئەمما
گەلێ هیوایە ئەو ڕۆژەی شەوی تاری بتارێنێ

درخت دوستی بنشان که کام دل به بار آرد
نهال دشمنی برکن که رنج بی‌شمار آرد

چو مهمان خراباتی به عزت باش با رندان
که درد سر کشی جانا گرت مستی خمار آرد

شب صحبت غنیمت دان که بعد از روزگار ما
بسی گردش کند گردون بسی لیل و نهار آرد

عماری دار لیلی را که مهد ماه در حکم است
خدا را در دل اندازش که بر مجنون گذار آرد

بهار عمر خواه ای دل وگرنه این چمن هر سال
چو نسرین صد گل آرد بار و چون بلبل هزار آرد

خدا را چون دل ریشم قراری بست با زلفت
بفرما لعل نوشین را که زودش با قرار آرد

در این باغ از خدا خواهد دگر پیرانه سر حافظ
نشیند بر لب جویی و سروی در کنار آرد

کەسێ کە نووری جەماڵی ئەوینی بوو لە نەزەر
یەقین دو چاوی ئەبینێ کەماڵی بەژنی هونەر
وەکوو قەڵەمخەتی ئەو گرتنم رەوان و رەوان
سەرم لە رێیەتی هەر بیبڕێ بە تێغی مەگەر
کەسێکە لایەقی وەسڵت، کە چەشنی شەّم هەرچی
سەری بە تێغ بکرێ گڕی لە سەرترە هەر
بە ماچی پاتی کەسێ دەم گەیی، کە وەک دریا
لە ئاستانتی نابێ، هەتا هەتایەتی سەر
لە زوهدی وشک مەلوولم دەبێنە ساقی مەی!
کە لوتفی بادە مەگەر تەڕ بکا دەماغی پەکەر
شەراب کەڵکی ئەگەر هەر نەبێ ئەوەی هەیە بۆت
کە لانیکەم لە دنەی سەر دەمێک نیتە خەبەر
کەسێ کە یەک قەدەمی لا نەدا لە رێگە، ئەوا
بە قەستی مەیکەدە بەستی تەدارەکاتی سەفەر
بە گۆڕی پاک دەچێ «خاجە» دڵشکاو وەکوو
گوڵاڵە، داغ کراوی گراوی سۆزی جیگەر
مەبەس لە دیدە فەقەت دیتنی جەماڵی تۆن
دەنا بە کەڵکی چ دێ چاوی گیرەنۆکی «عومەر»

کسی که حسن و خط دوست در نظر دارد
محقق است که او حاصل بصر دارد
چو خامه در ره فرمان او سر طاعت
نهاده‌ایم مگر او به تیغ بردارد
کسی به وصل تو چون شمع یافت پروانه
که زیر تیغ تو هر دم سری دگر دارد
به پای‌بوس تو دست کسی رسید که او
چو آستانه بدین در همیشه سر دارد
ز زهد خشک ملولم کجاست باده‌ی ناب
که بوی باده مدامم دماغ تر دارد
ز باده هیچت اگر نیست این نه بس که تو را
دمی ز وسوسه‌ی عقل بی‌خبر دارد
کسی که از ره تقوا قدم برون ننهاد
به عزم میکده اکنون ره سفر دارد
دل شکسته‌ی حافظ به خاک خواهد برد
چو لاله داغ هوایی که بر جگر دارد

دڵـی من بە رووتـە مایـل نـە چەمـەن نە بـاخـی وەردم
وەکـو سـەوڵ هـەر بە پێـوەم وەکـو لالـە داغـی دەردم
لە خەمـی برۆی کەسێکـا سەری ئێمـە قەت نەخـەوتوون
لە گـورووپی گۆشـەگیران لە جەهـان تەریـک و فـەردم
لە وەنەوشـە بۆیە زیـزم دەمی دا لـە زوڵفـی رەشتـان
ئەمـە میسکـی نافـی مامـز ئـەوە رووسیـاهی مـەردم
وەرە بۆ چەمـەن تەمـاشـا کە گوڵاڵـە شـایە، لالـەش
بە وەزیـری شـا دەمێـنێ لە کـەفی شـەرابی سـەردم
شـەوی تـارە سرِ سرِ و چۆڵ دە چلۆن دەگەم، مەگەر تۆ
شـەمـی روو لە رێگـە هەڵـکەی شـەکەتی برِینـی هەردم
من و شـەم هەتـا سەحـەر دێ بە خەیـاڵی تۆوە دەگـرین
خەبـەرت نەبوو کە سـووتام بە حـەواوە ئێستـە گـەردم؟!
وەکـو هەوری مانگی نیسان لە چەمەن بە کوڵ دەکەم شین
قـەلـەڕەش لە مـاڵی بولبـول دەقـرِێ لـە وەردی زەردم
دڵـی پڕ لە دەردی «حـافز» بە هـەوای ئەوین ئـەدا چـڵ
نـە لـە خـاترم تـەمـاشا نـە لـە باخـم و نە هـەردم
بە زەغـەن بلـێ بپـرسێ لە تەبـاری کـوردە «کۆلیـل»
لە چلاٚنی چنـگ ئەکـەم گیـر کە هەڵـۆ لە شاخ و زەردم

دل ما به دور رویت ز چمن فراغ دارد

که چو سرو پایبند است و چو لاله داغ دارد

سر ما فرو نیاید به کمان ابروی کس

که درون گوشه‌گیران ز جهان فراغ دارد

ز بنفشه تاب دارم که ز زلف او زند دم

تو سیاه کم‌بها بین که چه در دماغ دارد

به چمن خرام و بنگر بر تخت گل که لاله

به ندیم شاه ماند که به کف ایاغ دارد

شب ظلمت و بیابان به کجا توان رسیدن

مگر آن که شمع رویت به رهم چراغ دارد

من و شمع صبحگاهی سزد ار به هم بگرییم

که بسوختیم و از ما بت ما فراغ دارد

سزدم چو ابر بهمن که بر این چمن بگریم

طرب آشیان بلبل بنگر که زاغ دارد

سر درس عشق دارد دل دردمند حافظ

که نه خاطر تماشا نه هوای باغ دارد

جــامت کە بە دەستـــە کــام خۆشــە
جەمشیـدی کە شەوقی جـام خۆشــە
ئـەو ئــاوە ژیـــانی دا بــە (بـەلیـــا)
چـا بـۆی بگـەڕی لە جـام خۆشــە
دەسپێـرمـە دەستــی بـــادە ژینـــم
ئەو لـەعلـــە بـێ نیـــزام خۆشــە
ئێمــــەو مـەی و سۆفـی و حـەکـالّی
تــا یـــار دلّــی بـە کـــام خۆشــە؟
ئــەو دەورە کــە جـــام لێـــوی تۆیـە
هـەر لـەو دەمـە نۆش و کـام خۆشــە
نێـــرگز کـە ئـەدا قـەرز بە مـەستـان
قـــەرزاری دییـەت لــە لام خۆشــە
یـــادی دەم و زولـفـی تـۆ لە دلّـــدا
زیکری منــە، سوبح و شــام خۆشــە
بۆ جـەزبـی بـرینـــی دەردمـــەنـدان
لێـــوت نـمــە کیـــن و زام خۆشــە
لـەو چـــالّی زەنـەختــە گیـانی «حافـز»
وەك ئێمـــە، گەلـی غـولاّم خـۆشــە
ئۆخــەی کە ئەسیری تۆیـە «کۆلیــل»
لـــەم داوە گـولّـــم دەوام خـۆشــە

آن کس کـــه بــه دست جـــام دارد

سلـطـــانی جـم مـــدام دارد

آبــی که خضــر حیــات از او یــافت

در میکـــده جـو کـه جـــام دارد

ســررشتـــه‌ی جـــان به جـــام بگـذار

کـــایـن رشتـــه از او نظـــام دارد

مـــا و مـــی و زاهـــدان و تقـــوا

تـــا یـــار ســـر کـــدام دارد

بیـــرون ز لـب تــو ساقیـــا نیست

در دور کســی کـــه کـــام دارد

نـــر گس همـــه شیـــوه‌های مستـی

از چشـــم خـوشـــت بـــه وام دارد

ذکـــر رخ و زلـــف تـــو دلـــم را

وردی‌ست کـه صبـــح و شـــام دارد

بــر سینـــه‌ی ریـــش دردمنـــدان

لعلـــت نـمکـــی تـمـــام دارد

در چـــاه ذقــن چـو حافــظ ای جـانْ

حسـن تــو دو صـــد غـــلام دارد

دڵێ کە عەرشی خودایە و لە نەسڵی جامی جەمە
لە کلکەوانەڕفێنی مەگەر هەراس و غەمە
شیاوی گەوهەری دڵ نین گەدای خۆش‌خەت و خاڵ
کە بووکی گەنجی ئەوین شاکچێکی خونچە دەمە
کە هەرچی بەژنە لە جەوری خەزانی سەرّ دەخەوان
غولامی قامەتی سەروم هەمیشە دژ بە خەمە
گەیی دەمێ وەکو نێرگز لە خۆشیا هەرکەس
بکاتە خەرجی قەدەح ماڵ، ئەگەرچی چەن درەمە
لە مەی درێغ مەفەرموو بە چەشنی گوڵ زەڕ و زێو
دەنا بە عەقڵی مە سەر سەد لە تەختەکانی کەمە
لە پشتی پەردە کەس ئاگا نەبوو مەتەق مەکە سا!
تەنانە مەحرەمی دڵ بێخەبەر لە نێو حەرەمە
دڵی قەڵەندەر و بێکارم ئێستە سەد کاری
بە بۆنی زولفت و با، تا بەیانی خۆش قەدەمە
مورادی دڵ مەکە داوا! قەپاتە دڵداریێ
کە بێژم ئەهلی دڵ و هەوری رەحمەت و کەرەمە
چ خێری ئەو جبە تێدایە بۆ مە یا «حافز»؟
سەمەد کە دلبەری ئێمە و نیگاری ئەو سەنەمە
«عومەر» لەبەر ئەوە کوردێکە پێچەوانە مەلا
لە کۆی مەرارەتی گەردوونی دون لفی ئەلەمە

دلی که غیب‌نمای است و جام جم دارد
ز خاتمی که دمی گم شود چه غم دارد

به خط و خال گدایان مده خزینه‌ی دل
به دست شاه وشی ده که محترم دارد

نه هر درخت تحمل کند جفای خزان
غلام همت سروم که این قدم دارد

رسید موسم آن کز طرب چو نرگس مست
نهد به پای قدح هر که شش درم دارد

زر از بهای می اکنون چو گل دریغ مدار
که عقل کل به صدت عیب متهم دارد

ز سر غیب کس آگاه نیست قصه مخوان
کدام محرم دل ره در این حرم دارد

دلم که لاف تجرد زدی کنون صد شغل
به بوی زلف تو با باد صبحدم دارد

مراد دل ز که پرسم که نیست دلداری
که جلوه‌ی نظر و شیوه‌ی کرم دارد

ز جیب خرقه‌ی حافظ چه طرف بتوان بست
که ما صمد طلبیدیم و او صنم دارد

دەلالـم شـــاگوڵی نـازە و لە سونبـوڵ ســایەبانی هـەس
بەهــاری کوڵمـی خەتتێـکی لە رەنگی ئەرخــەوانی هەس
خەت و خاڵێ لە سەر روخساری وەک خۆری رووا، یارەب
دەوامـی یەک جەهــانی بێ! کە ئەو جوانـی جەهـانی هەس
کە عەشقــم هــاتە رێ، دەمــوت بە ئاواتی دڵـم گەشتــم
کەچی نەمــزانی ئەم بەحــرە شـەپۆلی خوێـنفشـانی هەس
لە دەستــی چــاوەکــانت وادەزانــم گیــان بـەدەر نـابەم
لە هەر گۆشــەی کەمینــێ سەد کەمین، تیـر و کەمانی هەس
لە زولفـــی خاتــری ئێمــەی تەکــان و دایــە دەم بــا دا
سـەبــا سیخــوڕە نەک بێــژێ، قەنــارەی عاشقــانی هەس
بە ســەر خاکـــا دڵۆپێ مەی بڕێـــژە گــوێ بە دڵ بگــرە
لە جەمشیـــد و قوبـــاد و کــەی هــەزاران داستــانی هەس
بــزەی گــوڵ داوە، بولبــول! چــاوی فێڵـت لێدەقرتێـنێ
ئەمــانی گوڵ نەبـوو بۆ کـەس کە حوسنی بێئەمــانی هەس
لە دڵبەر تۆ بــیو خــوا پیــری مەیخــانەم بپــرسن بــۆچ
لەگەڵ خەڵکـی دەنۆشێت و لەگــەڵ من سەرگرانی هەس؟!
ئەگەر شـۆڕم بە لا زینـا دەکــەی، فەرمــوو شکــارم کــەن!
ژیـــانی ئێمــــە چونکـــوو لـەم بیـــاوانە زیـــانی هەس
نمامـــی قــامەتی ســـەروت لەســـەر چـــاوم بنێــژن، تــا
بــزانی گیـــانە! ئـەم چـاوانـە ئاوێـــکی رەوانـــی هەس
لە ترسـی هیجــرەتم دەربێنــە! یا خۆ هەر ئـەڕۆی ئۆغــر
خــودا ئەو چــاوە هەڵکۆڵـێ بەرەو تۆ تیــرەژانی هەس!
لە بەختــی خۆتە «حافــز»! ئەو عەیــاری شـار شێــوێنــە
بە تــاڵی دەتکوژێت و چی لە شـەکر و قەن دوکـانی هەس
هەتا «کۆلیـــل»ـەکەت ماوە بە تــاڵـت کــام شیــرینــە
لە جــامی چاوەکــانت مەیلـی ژاری شەوکـــەرانی هەس

بتـــی دارم که گـــرد گـــل ز سنبـــل ســـایه‌بان دارد
بهـــار عـــارضـــش خطی بـــه خـــون ارغـــوان دارد
غبـــار خط بپوشـــانید خورشیـــد رخـــش یـــا رب
بقـــای جـــاودانش ده کـــه حســـن جـــاودان دارد
چو عاشـــق می‌شـــدم گفتم که بردم گوهـــر مقصـــود
ندانستـــم که این دریـــا چه موج خون فشـــان دارد
ز چشمت جـــان نشاید برد کز هر ســـو که می‌بینـــم
کمین از گوشـــه‌ای کرده‌ست و تیر اندر کمـــان دارد
چو دام طـــره افشـــاند ز گـــرد خـــاطر عشـــاق
به غمـــاز صبـــا گـــوید کـــه راز مـــا نهـــان دارد
بیفشـــان جرعـــه‌ای بر خـــاک و حال اهل دل بشنو
که از جمشیـــد و کیخســـرو فـــراوان داســـتان دارد
چو در رویت بخنـــدد گل مشـــو در دامش ای بلبـــل
که بر گل اعتمـــادی نیست گر حســـن جهـــان دارد
خـــدا را داد مـــن بستـــان از او ای شحنـــه مجلس
که می با دیگری خورده‌ست و با من سر گـــران دارد
به فتـــراک ار همی‌بنـــدی خـــدا را زود صیدم کن
که آفت‌هـــاست در تأخیـــر و طالب را زیـــان دارد
ز ســـرو قد دلجـــویت مکن محـــروم چشمـــم را
بدین سرچشمـــه‌اش بنشـــان که خوش آبی روان دارد
ز خوف هجـــرم ایمـــن کـــن اگـــر امیـــد آن داری
کـــه از چشـــم بداندیشـــان خـــدایت در امـــان دارد
چه عذر بخت خود گویم که آن عیـــار شهرآشوب
به تلخـــی کشت حافـــظ را و شکـــر در دهـــان دارد

کەسێ خاتر جەم و خۆشبەختە، یاری نازەنینی بێ
کڵاوی لارە هەرکەس نۆ نەمامێ دڵنشینی بێ
گەلێ سەرتر لە عەقڵ و هۆشە دەرکی عەشق و دڵداری
کەسێ ئەو ئاستانەی ماچ ئەکا، ڕۆحی ئەوێنی بێ
دەمی شیرین و تەنگت کلکەوانەی شا سلێمانە
ئەشێ ئاقیقی لێوت، نەخش و مۆری سەر نگینی بێ
دو لێوی لەعل و یاقووتە و خەت و خاڵی گوڵی یاسە
دەوا بێ لەعلی یاقووتی تەبیبم یاسەمینی بێ!
بە چاوی سووکییۆ حاجی! لە حاڵی ئێمە مەڕوانە
دەبێ مووسا هەزارێ چەشنی قارون ڕێنشینی بێ!
لە سەر ئەو خاکە وشکەی ماوە فرسەت خاوەنی سامان
بە فیکری ڕۆژی تەنیایی لە ژێر خاکی نمینی بێ
بەلاگەردانی گیان و لەش، لە لێوی بێنەوا شینە
بەلا لاوێنە کێ لەو جارە عاری گوڵچنینی بێ
سەبا! ڕەمزێ لە رازی دڵ، بڵێ بەو شا کە سەد خوسرەو
وەکوو فەرهاد قوربانی بزەی لێوی شرینی بێ!
ئەگەر بێژێ ڕەجاڵ و عاشقێ وەک «حافز»م ناوێ
بڵێن پێی گا دەبێ سوڵتان، گەدایێ یاری ژینی بێ
لە سەر تا پێ دەزانی بۆ گڕ و ئەسرینە «کۆلیل»ـت
بەڵێنی زوو بە دڵبەر داوە مۆمی ئاورینی بێ

هر آن کو خاطر مجموع و یار نازنین دارد
سعادت همدم او گشت و دولت همنشین دارد
حریم عشق را درگه بسی بالاتر از عقل است
کسی آن آستان بوسد که جان در آستین دارد
دهان تنگ شیرینش مگر ملک سلیمان است
که نقش خاتم لعلش جهان زیر نگین دارد
لب لعل و خط مشکین چو آنش هست و اینش هست
بنازم دلبر خود را که حسنش آن و این دارد
به خواری منگر ای منعم ضعیفان و نحیفان را
که صدر مجلس عشرت گدای رهنشین دارد
چو بر روی زمین باشی توانایی غنیمت دان
که دوران ناتوانی‌ها بسی زیر زمین دارد
بلاگردان جان و تن دعای مستمندان است
که بیند خیر از آن خرمن که ننگ از خوشه‌چین دارد
صبا از عشق من رمزی بگو با آن شه خوبان
که صد جمشید و کیخسرو غلام کمترین دارد
و گر گوید نمی‌خواهم چو حافظ عاشق مفلس
بگوییدش که سلطانی گدایی همنشین دارد

خودا کەسێ لە هەموو نارەوا دەپارێزێ
بە دڵ کە حورمەتی خەڵکی خودا دەپارێزێ
پەیامی یار بفەرموو فەقەت بە حەزرەتی یار
کە ئاشنا هونەری ئاشنا دەپارێزێ
دڵا! کەسێ بە ئەدەب پێ بنێ، کە هەڵلەغزا
فریشتە پای بە دەستی دوعا دەپاریزێ
ئەوین لە دڵ گرە تا تۆش ئەوین لە دڵ بگرێ
دڵێ کە خاڵیە لەم خاڵە با دەپارێزێ
سەبا! لە سەر خەمی زولفی، بە تەیری دڵ فەرموو
کە لەو مەدارەیە گیانی سەفا دەپارێزێ
کە پێم وتی بە کەرەم راگری ئەوین بە! وتت
ئەوینی ئێمە فەقەت لوتفی خوا دەپارێزێ
دڵ و گڵ و سەر و ماڵم، هەموو بە قوربانی
کەسێ کە حورمەتی میهر و وەفا دەپارێزێ
غوباری ڕێگەعوبووری لە کوێیە چون «حافز»
بە یادمانی، نەسیمی سەبا دەپارێزێ
بەهاری لالە بە «کۆلیل» ئەڵێ چەمی چاوت
گلاری نێرگزی مەستم چ چا دەپارێزێ

هــــر آن کــه جـــانب اهـــل خـــدا نگه دارد
خـــــداش در همه حـــــال از بـــلا نـگه دارد
حدیث دوست نگویم مگر به حضرت دوست
کـــه آشنــــــا سخــن آشنــــــا نگـــــه دارد
دلا معـــاش چنـــان کن که گر بلغـــزد پـای
فرشتــــــه‌ات به دو دسـت دعـــــا نگـــه دارد
گرت هـواست که معشوق نگسلـــد پیمـــــان
نگـــــاه دار ســـــر رشتـــــــه تـــا نگـــــه دارد
صبـــــا بر آن ســـر زلف ار دل مـــرا بیـــــنی
ز روی لطـــف بگویـــش که جـــا نگــه دارد
چو گفتمش که دلـــم را نگـــاه دار چه گفـت
ز دست بنـــده چه خیـــزد خـــــدا نگـــه دارد
ســـر و زر و دل و جـــانم فـــــدای آن یاری
که حـق صحبـت مهــــر و وفـــــا نگـــه دارد
غبـــار راه راهگـــذارت کجـاست تا حـافـظ
به یادگــــــــار نسیـــم صبـــــا نگـــــه دارد

خاوەنی سازی ئەوین بەخ چ نەوایێکی هەیە
هەر هەوایێکی بە جێ و ڕێگە بە جایێکی هەیە
خوایە خاڵی مەکە! ناڵەی دڵی شەیدام لە گوێ
ئەم هەوا چون لە دڵی ئێمە هەوایێکی هەیە
خلتەنۆشی کە دەکا پیر و زەڕ و زۆری نییە
خۆش خەتا پۆش و کەرەمدار، خودایێکی هەیە
چونکە مێشی دڵی من عاشقی شەکری دەمی تۆن
خاوەنی باڵی شکۆ، فەڕی هومایێکی هەیە
کابە کەچ نابێ ئەگەر بێت و بپرسێت بە دڵ
شاریارێ کە لە بەر دەرکی گەدایێکی هەیە
ئەشکی خوێنینمی دوکتور لە مەحەك داوە، دەڵێ
دەردی عەشقم خەتەرە و تاقە دەوایێکی هەیە
فێری کوشتاری کریشمەت مەبە لەم مەکتەبە چون
چاکە خێرێك و خراپیش سزایێکی هەیە
ئەرمەنی کیژە جووانێ چ زەریفی قسە کرد
بە سەفای ئەو کەسە مەی خۆوە! سەفایێکی هەیە
خوسرەوا! «حافز»ە مل کەچ لە پەنا خاکی دەرت
دەم بە دۆعا لە دەمت چاوی دوعایێکی هەیە
دەست و پەنجەی بە خەنەی خوێنی «عومەر» کردووە سوور
لێوی شایەتمە، کە خۆی دەس بە حەنایێکی هەیە

مطرب عشق عجب ساز و نوایی دارد
نقش هر نغمه که زد راه به جایی دارد
عالم از ناله‌ی عشاق مبادا خالی
که خوش آهنگ و فرح‌بخش هوایی دارد
پیر دُردی‌کش ما گرچه ندارد زر و زور
خوش عطابخش و خطاپوش خدایی دارد
محترم دار دلم کاین مگس قندپرست
تا هواخواه تو شد فرّ همایی دارد
از عدالت نبود دور گرش پرسد حال
پادشاهی که به همسایه گدایی دارد
اشک خونین بنمودم به طبیبان گفتند
درد عشق است و جگرسوز دوایی دارد
ستم از غمزه میاموز که در مذهب عشق
هر عمل اجری و هر کرده جزایی دارد
نغز گفت آن بت ترسابچه‌ی باده‌پرست
شادی روی کسی خور که صفایی دارد
خسروا حافظ درگاه‌نشین فاتحه خواند
وز زبان تو تمنای دعایی دارد

کێ نەسیمی قژی بۆ گوڵ، گڕ و تاوێکی هەیە
سەر لە نۆ بۆ مەلی دڵ دانە و داوێکی هەیە
دەمکوژێت و لە سەرم توند ئەچێ چەشنی سەبا
چارە چین؟! عومری منەو جۆرە شیتاوێکی هەیە
زولفی تاریکی لە سەر مانگی وەکوو خۆڕێ، ئەڵێی
هەوری پەخشانە، لە ژێر پەردە هەتاوێکی هەیە
چاوم ئەسرینی لە هەر گۆشەوە ڕێکەوتووە چون
سەروی بەژنت هەوەسی زەمزەم و ئاوێکی هەیە
نازی چاوت بە خەتا گەرچی لە خوێنم دەگەڕێ
مۆڵەتێکی بدەرێ! فیکر و حەساوێکی هەیە
ئاوی ژین گەر ئەوەتا، لێوی شرینت هەیەتی
بێ گومانم کە خزر خەونی سەراوێکی هەیە
چاوی مەستت دەیەوێ قیمە بکا جەرگ و دڵم
هەر کە مەیلی بە مەیە سیخ و کەواوێکی هەیە
گیانی عەشقم نییەتی دەرفەتی پرسین لە رووت
خۆزگە بەو شەخسە لە تۆ سووکە جوواوێکی هەیە
چۆن دەکا چاوی مەسی بۆ دڵی «حافز» نەزەرێ
ئەو کە هەر لایە دەچێ شێت و خراوێکی هەیە
مەس و رسوا بە دو دیدەت بووە «کۆلیل»، چما
نێرگزی ئێوە خەس و خۆڵ شەراوێکی هەیە

آن‌که از سنبـــل او غـالیـــه تـــابـــی دارد
بـــاز با دل‌شـــدگان نـــاز و عتـــابی دارد
از سر کشته‌ی خود می‌گـــذری همچون باد
چه توان کـــرد که عمـــر است و شتـابی دارد
ماه خورشیـــد نمـــایش ز پـــس پـــرده‌ی زلف
آفتـــابی‌ست کـه در پیش سحـــابی دارد
چشم من کرد به هر گوشه روان سیل سرشک
تـــا سهـــی ســـرو تو را تـــازه‌تـر آبـــی دارد
غمـــزه‌ی شوخ تو خونـــم به خطـــا می‌ریـــزد
فـرصتـــش باد که خوش فکـــر صـــوابی دارد
آب حیوان اگر این است که دارد لب دوست
روشـــن است این که خضـــر بهره سرابی دارد
چشـــم مخمور تو دارد ز دلـــم قصـــد جگـــر
ترک مســـت است مگـــر میـــل کبـــابی دارد
جـــان بیمـــار مـــرا نیست ز تـــو روی سؤال
ای خوش آن خسته که از دوست جوابی دارد
کی کنـــد سوی دل خستـــه‌ی حافـــظ نظری
چشـــم مستش که به هر گوشـه خـــرابی دارد

شێــتی ئەو دڵبەرە بی! ئــاوی ژیانێــکی هــەیە
کەی هـەموو مووکەمەرێ خەتتو نیشانێکی هـەیە

روومـەت و بەژنی پەری دڵ گـرە، ئەمما گوڵی من
خوێن شـرینێــکەٰ بـزەی نـەرم و نیـانێــکی هـەیە

تۆقیــانی چەمـی چــاوم بە دڵــی لێـوی ئەتــۆن
خـورِ و خـاوێن عەجـەب ئـاوی رەوانێکی هـەیە!

مانگی کەنعــانـی و خۆر گۆیە لە گۆچانی کەزێت
کێ لە مەیـــدانی روخت شەوکەت و شانێکی هەیە

دڵنشیـــن بوو غەزەڵــم، تـا پەسـەنی ئێــوە کـرا
باســی عەشقــی دڵــە، بۆ هــەرکە مەکانێکی هەیە

سەنعــەتی قەوسی بـرۆتی ئەگـە بەهــــرام ئـەدی
نەیـدەوێـــرا کە بلــێ تیــر و کەوانێــکی هـەیە

ئاشنای رازی ئەوین چون بە حەقیقــەت نییە کەس
هەر ســەرێ جۆرە بەر و نەوعــە گومانێــکی هەیە

لافی دین لێـــمەدە لای ئێمـــەیی مەیخـــانەنشیـــن
هەر کـەلامێ وەکـو هەر نوکتـــە مەکانێــکی هەیە

تەیـری زیرەك نییـە هێـلانە لە گوڵــزار بکـــات
هـەر بەهــارێ کـە دەزانێــت، خەزانێــکی هـەیە

پێـی بڵێ نوکتـــە بە «حافــز» نەفرۆشێـت رەقیب
قەڵـەمـی وەك سەحـەرە و سیحـری بەیانێکی هەیە

پێی بڵێـن بەرد لە شووشەی دڵی «کۆلیل» نەدات
لـەتلـەتی دەوڵــەتی ئـەو کـاری دەبانێــکی هەیە

شـــاهـد آن نیست که مـویی و میـــانی دارد
بنـــدهٔی طلعـت آن بـــاش کـه آنـی دارد
شیـوه‌ی حور و پری گرچه لطیف است ولی
خوبـی آن اسـت و لطـــافت کـه فـلانی دارد
چشمـــه‌ی چشـم مرا ای گل خنـدان دریاب
کـه بـه امیــــد تـو خـوش آب روانـی دارد
گوی خوبی که برد از تو که خورشیـد آنــجا
نـه ســواری‌ست کـه در دسـت عنـــانی دارد
دل نشـــان شد سخنـم تا تو قبولـش کـردی
آری آری سخـــن عشــــق نشـــانی دارد
خـــــم ابـروی تو در صنعت تیـــراندازی
بـرده از دست هـــر آن‌کس که کمـانی دارد
در ره عشـــق نشد کس به یقیـن محـــرم راز
هـــر کســی بر حسب فکـــر گمـــانی دارد
با خـــرابات نشینـــان ز کـــرامات مـــلاف
هر سخـــن وقتی و هر نکتـــه مکـــانی دارد
مرغ زیـــرک نزند در چمنـش پرده ســرای
هـر بهـاری کـه بـه دنبـــاله خـــزانی دارد
مدعی گـــو لغــز و نکته به حافـظ مفـــروش
کلـــک مـــا نیــز زبانـــی و بیـــانی دارد

بێ مانــگی کوڵمی ئــازیز زیـزم بە دڵ لە گیــانێ
وەختــێ کە دڵبــەرم نین بێســووچە هەر ژیــانێ

نەمــدی لە کەس نیشــانێ لەو دڵــڕفێنە، ئەڵبــەت
یــا من بە بێــخەبەر لەو، یــا لــەو نەبــوو نیشــانێ

ئاوەنگی چــاوی عاشـق سەد بەحــری ئاگرینــە
ئــەی وەی کە ئــەم موعەمما، هەڵنــایە بۆ بەیــانێ

سەرکـــاروان لە دەسمـــان نابێ بچــێ پشـــوودان
ئەم رێگــە تەی نەکریــا بۆ تــاك و کــاروانێ

چەنگی چەمــاوە بانگـــی هەڵـــداوە بۆ زەمـــاوەن
دڵ بگــرە بۆ پەنــی پیــر! وا چاکــە بۆ جــووانێ

دارۆغــە رەنــدە ئەی دڵ! چاتر کە چەشنــی ئەو بی
بــا مــەستــە کــەس لە شــانی نادا وەهــا گومــانێ

سامــــان و گەنجــی دارای ئەم چەرخــە دا بە بــا دا
بچپێـــنە گوێی دەروونـــا، ئەم رەسمــە کــۆنە دانێ!

هەرچـــەن حەریف شــەم بێ، رازی دڵت مەفەرموو
ئــەو شۆخـــە سەربــڕاوەش مۆری زمــانی نــانێ

ئا لـــەو جەهــانە هەر وەك «حافــز» نەبوو غولامێ
چــون لەو جەهـــانە شــایێ وەك تۆ نەبــوو زەمانێ

هەرکەس بە ئەمری چاوی شاهێنی چەشنی «کۆلیـل»
سینگی نەکا بە نیشـــان، مـــافی ئەوینـــی کوانــێ؟!

جان بی جمال جانان میل جهان ندارد
هر کس که این ندارد حقا که آن ندارد
با هیچ کس نشانی زان دلستان ندیدم
یا من خبر ندارم یا او نشان ندارد
هر شبنمی در این ره صد بحر آتشین است
دردا که این معما شرح و بیان ندارد
سرمنزل فراغت نتوان ز دست دادن
ای ساروان فروکش کاین ره کران ندارد
چنگ خمیده قامت می‌خواندت به عشرت
بشنو که پند پیران هیچت زیان ندارد
ای دل طریق رندی از محتسب بیاموز
مست است و در حق او کس این گمان ندارد
احوال گنج قارون کایام داد بر باد
در گوش دل فروخوان تا زر نهان ندارد
گر خود رقیب شمع است اسرار از او بپوشان
کان شوخ سربریده بند زبان ندارد
کس در جهان ندارد یک بنده همچو حافظ
زیرا که چون تو شاهی کس در جهان ندارد

پەرتەوی کولمت بە میهر و ماهـ نەبوو هەر
گوڵ لە حەنای ئێوە پەڕری کاهـ نەبوو هەر
تاقی برۆکەت تەلار و کۆشکی وجوودم
قەسری جووانێکی وایە، شاهـ نەبوو هەر
لادە لە ئۆفی دڵی مە جامی جەماڵێ!
رووبەنی ئاوێنە چەشنی ئاهـ نەبوو هەر
نێرگزی سەر چڵ هەڵیبڕی لە کنت چاو
شەرم و ئەدەب چوو، حەیا پەناهـ نەبوو هەر
دیتم و دیتم دڵی چاوت رەشە بێ‌حەد
خاتری دۆستی لە دڵ نیگاهـ نەبوو هەر
جامی گرانی پڕەنگ تێکە بنۆشم
خۆشیی شێخت لە خانەقاهـ نەبوو هەر
وس بە لە ناڵین! دەروونی ناسکە دڵبەر
تێکەڵی هاواری دادخاهـ نەبوو هەر
قوم بووە لە خوێنی دیدە سینگ و بەرۆکم
چونکە بە دیوانی ئێوە راهـ نەبوو هەر
من بە تەنێ نیم لە بەندی زولفی درێژت
بەو شەوە کێ داخ و دڵ سیاهـ نەبوو هەر
مەگرە لە «حافز» دەبەم کە سوژدە لەبەر پێت
عاشقی تۆ تێکەڵی گوناهـ نەبوو هەر
کەی غەمی «کۆلیل» فەوج و لەشکەری هێنا؟
بێجگە لە ئەسرین قەتی سپاهـ نەبوو هەر

روشنـــی طلعـــت تـــو مـــاه نـــدارد
پیـــش تـــو گـــل رونـــق گیـــاه ندارد
گوشـــه‌ی ابـــروی توست منـــزل جانم
خـوش‌تر از این گوشـــه پادشـــاه نـــدارد
تـــا چه کنـد بـــا رخ تـــو دود دل مـــن
آینـــه دانـی کـــه تـــاب آه نـــدارد
شوخـــی نرگس نگـــر که پیش تو بشکفت
چشـــم دریـــده ادب نگـــاه نـــدارد
دیـــدم و آن چشـــم دل سیـــه که تو داری
جـــانب هیـــچ آشنـــا نگـــاه نـــدارد
رطـــل گـــرانم ده ای مریـــد خـــرابـــات
شـــادی شیخـــی که خانقـــاه نـــدارد
خون خور و خامش نشین که آن دل نازک
طـــاقت فـــریاد دادخـــواه نـــدارد
گو بـــرو و آستیـــن به خـــون جگر شوی
هـــرکـــه در ایـن آستـــانه راه نـــدارد
نی مـن تنهـــا کشـــم تطـــاول زلفـــت
کیســـت کـــه او داغ آن سیـــاه نـــدارد
حافـظ اگر سجـده‌ی تو کرد مکن عیـب
کافـــر عشـــق ای صنـم گنـــاه نـــدارد

قــاتە لــەم شــارە نیگــاریٚ دڵــی زامــار بــەریٚ
کۆمــەکی بەخت مەگــەر، ئێمــە لە نێو شــار بەریٚ
کوا حەریفیٚ مەس و جوامێــر، لە خزمەت کەرەمی
عــاشقیٚ نێــوی حــەزی دڵبــەر و دڵـــدار بەریٚ
باخـــەوان! وادەنووێنــیٚ لــە خــەزان بێـــخەبەری
وەی لە ئـەو ڕۆژە زەڵان عومــری گوڵت زار بەریٚ
ڕێــگری دز خـــەبەرە و وا لە کەمینــی تەمـــەنا
بیٚ گومـــان ماتڵــە ژینــی من و سەرکـــار بەریٚ
ئەو هەمـــوو بوو کە دەقــمدا لە خەیــاڵا بە غــەزەڵ
دڵــی ئەهلــی نــەزەریٚ بەڵکــو بە دیــدار بەریٚ
دڵ بە چــل ســاڵی وەکۆ کردووە زانیــن و هونــەر
چــاوی مەستــانە دەترســم لە ســەرم بــار بەریٚ
نــازی بــۆڕەی لەقــەزی گوێرەکە، بیٚساز و نەوان
سـامری کێـن وەکـو مووسـا کەرەمـی یـار بەریٚ
جــامی بێگـــەردی شەرابت دەڕفێــنیٚ تەمی غــەم
مەی نەبیٚ، مەینــەتی دڵ دیٚ ســەر و ســەردار بەریٚ
سەنگەری چـــاو و برۆی یــارە کەمیـــنی دڵەکەم
هەرکــەسیٚ ڕەنــدە دەبیٚ ڕێگـــە بە ئەســرار بەریٚ
«حافـــز»! یــار بە نــازۆ وتــی ئــەر گیــانم ئەویٚ
غەیــر خاڵی کـــە لە دڵ! بێڵـــە کە ژیــوار بەریٚ
عاشقــی لێــوەیە «کۆلیـــل»و ئەڵیٚ لێــوی ئــەوین
کەوسەری ژینە، چ بوو ڕۆح دوســـەد جــار بەریٚ

نیست در شهر نگاری که دل ما ببرد
بختم ار یار شود رختم از این‌جا ببرد

کو حریفی کش سرمست که پیش کرمش
عاشق سوخته‌دل نام تمنا ببرد

باغبانا ز خزان بی‌خبرت می‌بینم
آه از آن روز که بادت گل رعنا ببرد

رهزن دهر نخفته‌ست مشو ایمن از او
اگر امروز نبرده‌ست که فردا ببرد

در خیال این همه لعبت به هوس می‌بازم
بو که صاحب نظری نام تماشا ببرد

علم و فضلی که به چل سال دلم جمع آورد
ترسم آن نرگس مستانه به یغما ببرد

بانگ گاوی چه صدا بازدهد عشوه مخر
سامری کیست که دست از ید بیضا ببرد

جام مینایی می سدّ ره تنگدلی‌ست
منه از دست که سیل غمت از جا ببرد

راه عشق ارچه کمینگاه کمانداران است
هر که دانسته رود صرفه ز اعدا ببرد

حافظ ار جان طلبد غمزه‌ی مستانه‌ی یار
خانه از غیر بپرداز و بهل تا ببرد

شەراب ئەگەر غەم و حەسرەت لە فیکری ئێمە نەبات
هەراس و جەوری فەلەک پڕ لە بێخی ریشە ئەدات
ئەگەر شەراب نەخا لەنگەری شعوور و هۆش
بە کامە کەشتی ئەدەی دڵ، لە گێژی تۆف نەجات
نەبوو کەسێ کەرەتێ چەرخی کەچ بدا کیشێ
کەچی هەموو کەسی ئەو زاڵمانە کردووە مات
ژیان عوبووری بە تاریکسانی جەهلە، مەگەر
خزر بکا مەدەدێ، غەم دەنا حەیام دەبات
بەرەو چەمەن دڵی بێهێز مەیل ئەکا بەڵکوو
سەبا نەخۆشە ئەگەرچی، دەمێ بکات خەڵات
ئەمن تەبیبی دڵم بێنە مەی! کە مەڵهەمی وا
خەتا لەسەر بەرە وەک شەم، شەوار رۆشن ئەکات
بسووت «حافز»و دڵبەر لە حاڵی بێخەبەرە
لەبەر خودا مەگەری با، خەبەر بە دڵبەری بات
شەراب ئەمێستە خەفەتبارە خۆشی، وەک «کۆلیل»
کەسەر لە دوو سەری دۆمینە مەی دەکات قەبات

اگر نه بـــاده غـــم دل ز یـــاد مـــا ببـــرد
نهیـــب حـــادثـــه بنیـــاد مـــا ز جـــا ببـــرد
اگر نه عقـــل به مستـــی فـــرو کشد لنـــگر
چگـــونه کشتـــی از این ورطـــه‌ی بلا ببـــرد
فغـــان که با همه کس غایبـــانه باخت فلـــک
که کـــس نبـود که دستـی از این دغـا ببـــرد
گـــذار بر ظلمـــات است خضـــر راهی کو
مبـــاد کـــآتش محـــرومی آب مـــا ببـــرد
دل ضعیفـــم از آن می‌کشـد به طـــرف چمن
که جـــان ز مرگ به بیمـــاری صبـــا ببـــرد
طبیب عشق منـــم بـــاده ده کـــه این معجـــون
فـــراغت آرد و اندیشـــه‌ی خطـــا ببـــرد
بسوخت حافظ و کس حال او به یار نگفت
مگـــر نسیـــم پیـــامی خـــدای را ببـــرد

سەحەر بولبول شکاتی لا سەبا کرد
دەزانی عەشقی گوڵ چەندی سزا کرد؟

بە رەنگی روومەتی دڵ پڕ لە خوێنم
لە نێو گوڵزاری هەر دڕکی عەتا کرد

غولامی هیممەتی بەرزی کەسێکم
دەسی خێری لە مل کیژی وەفا کرد

لە دەستی ناکەسان بۆچی بناڵم
کەسم، سینەی بە ناڵین ئاشنا کرد

لە ئازیزم تەمەننا هەر وەفا بوو
لە سوڵتان ئەو تەمەننایەم خەتا کرد

نەسیمی بەر بەیانی هەر نەناڵێ
کە دەردی شەونشینانی دەوا کرد

لە گوڵ رووبەند و سومبوڵ پرچی لادا
یەخەی غونچەی لە دوگمەی شین رەها کرد

لە بولبول دەنگی واوەیلا و شینە
گوڵ ئەی هاوار لەنجەی بۆ سەبا کرد

بە کۆڕی مەیفرۆشان بێژە ساقی!
کە «حافز» پشتی لەو زوهد و ریا کرد

لەگەڵما سەروەرانی شار تەنیا
بە پەیمانی وەفا، هەر بولوەفا کرد

لەگەڵ «کۆلیل» چۆن بێژم تەنانەت
دڵی خۆشی هەواری لێ جودا کرد

سحر بلبل حکایت با صبا کرد
که عشق روی گل با ما چه‌ها کرد
از آن رنگ رخم خون در دل افتاد
و از آن گلشن به خارم مبتلا کرد
غلام همت آن نازنینم
که کار خیر بی روی و ریا کرد
من از بیگانگان دیگر ننالم
که با من هر چه کرد آن آشنا کرد
گر از سلطان طمع کردم خطا بود
ور از دلبر وفا جستم جفا کرد
خوشش باد آن نسیم صبحگاهی
که درد شب‌نشینان را دوا کرد
نقاب گل کشید و زلف سنبل
گره‌بند قبای غنچه وا کرد
به هر سو بلبل عاشق در افغان
تنعم از میان باد صبا کرد
بشارت بر به کوی می‌فروشان
که حافظ توبه از زهد ریا کرد
وفا از خواجگان شهر با من
کمال دولت و دین بوالوفا کرد

وەرن فەلــەک رەمــەزانی قوتــار و غــارەت کرد
کە مانگی یەکشەوە جـامی جەمی لە چـارەت کرد

کەسێ لە رۆژوو ئەبا خێـر و حەجج و عومـرە رەوان
بە دڵ کە خـاکی دەری مەیکــەدەی زیـارەت کرد

کە سووچی مەیکــەدە بـوو بۆ هەتـا هەتـا شوێنـم
دروودی حەق لـەوە بێ مەیکــەدەی عەمارەت کرد

بە چی ئەدەن قەدەحێ مــەی؟! بە گەوهەری ژیـری
هەڵێ کە خێـر ئەوە بردی ئەمــەی تیجـارەت کرد

بەڵـێ لە نێـو خەمی ئەبـرۆ سـەوابی نوێــژە گەلێ
لە بۆ کەسێ کە بە خوێنی گەشی تەهــارەت کرد

ئەمــان لە چـاوی فریوت کە شێخـی شـار ئەورۆ
بـە سـووکییـۆ نـەزەری بـۆ زەدەی ئیشــارەت کرد

کە کولـمی یــار دەبینـم، سپـاسی چـاوم ئەکـەم
سەرنجـی چـاوتی چونکـوو بە دڵ نـەزارەت کرد

کەلامـی عەشــق لـە «حــافز» ببیســە نەک واعیــز
ئەگەرچـی سەنعەتی زۆری بە دەم جەســارەت کرد

پەیامی عەشق لە «کۆلیــل»ـی دڵکەســەر بۆ یــار
سەبــا! لەبەر چ بـو نەتبرد، مەگەر شـەوارەت کرد؟!

بیا که ترک فلک خوان روزه غارت کرد
هـلال عیـد به دور قـدح اشارت کرد
ثواب روزه و حـج قبـول آن کس برد
که خـاک میکده‌ی عشق را زیارت کرد
مقـام اصلـی ما گوشه‌ی خرابات است
خداش خیر دهاد آنـکه این عمارت کرد
بهای باده‌ی چون لعل چیست جوهر عقل
بیا که سود کسی برد کـاین تجارت کرد
نمـاز در خـم آن ابـروان محـرابی
کسی کند که به خون جگر طهارت کرد
فغان که نرگس جمّـاش شیخ شهر امروز
نظـر به دُردکشـان از سر حقـارت کرد
به روی یـار نظر کن ز دیـده منت دار
که کـار دیده نظـر از سر بصـارت کرد
حدیث عشق ز حافـظ شنو نه از واعـظ
اگرچـه صنعت بسیـار در عبـارت کرد

سەحـــەر بە مەی شتـی دەسـنوێژ، عـارفێ دڵ رون
بەیـانی زوو کـە بـە مەیخـانە بۆ زیـارەت چون
هیـــلالی یەکشــەوە دەسـتـووری دەوری جـامی دا
هەتا بلـــووری هــەتاوی زەڕین لە کـــەل گوم بون
قوبوولە نوێــژی بە ئـاوات و پڕ لە سـۆزێ کەسـێ
لە خوێنی جەرگی کە دەسنوێژی حورمەتی گرتون
هەوەڵ بە خوێنی کچـی رەز مەلا عەبـاکەی شـت
بە دڵ، لە پاش ئەمە نوێـژی ئەو شـەوەی فـەرمون
دڵــم لە پەرچەمی، داوی شـەڕی کـڕی بۆ خـۆی
لـە ئـەم تیجـارەتە ئاخـۆ بەهـــایەکی بـردون؟
ئیمـــامی جومعـە گەر ئەحواڵی «حافـز»ی پرسـی
بڵێـــن بە بادە کە وسڵـــی جەمـــاعەتی کــردون
شەهـــادەتی کـوڕە کـــوردێکی، بۆ دەمی شیـرین
«عومـەر» لە لێـوی کەژێ چەشنی بێستون بیستون

به آب روشـــن می عـــارفی طهـــارت کرد
عَلَی‌الصَّبــاح که میخـــانه را زیـــارت کرد
همیـــن که ساغــر زرین خور نهـــان گردید
هـــلال عیـــد به دور قـــدح اشـــارت کرد
خوشـــا نمـــاز و نیـــاز کسی که از ســـر درد
به آب دیـــده و خون جگـــر طهارت کرد
امـــام خواجـه که بودش ســـر نمـــاز دراز
به خون دختـــر رز خرقــه را قصـارت کرد
دلم ز حلقـه‌ی زلفش به جـان خرید آشوب
چه ســود دید ندانــم که این تجــارت کرد
اگر امـــام جمـــاعت طلب کنـــد امـروز
خبر دهیـــد که حافـــظ به می طهـارت کرد

سۆفی بە ئۆف و داوی ریا مەکری ساز کرد
لەم چەرخە فێڵەوازە حوقەی لێوی باز کرد
هێلکەی لە ژێر کڵاوی فەلەك زوو لە سەر شکان
فێڵ و فریوی هەرکە لەگەڵ ئەهلی راز کرد
مەیگێڕ زووکە دلبەری واڵای سۆفیان
هەمدیس دەس بە جیلوە، بە عیشوە و بە ناز کرد
موتریب لە کوێن کە سازی مەقامی عەراقی وت
کۆکی لە پڕ بە نەزم و نەواکەی حیجاز کرد
ئەی دڵ دەخیلە زوو بە کە خۆ خەینەماڵی یار
چونکوو خەتای زۆری بە سوڵتان ئەیاز کرد
خەوشت نەبێ! کە هەرکە نەبوو پاكبازی عەشق
دەرکی قەڵای ژووری لەسەر خۆ فەراز کرد
سۆزی کە رۆژی حەشرە هەموو شت دەبێت روون
سەرشۆڕە کێ حەقیقەتی خەرجی مەجاز کرد
کۆتر بە لار و لەنجە مەڕۆ نوێژ ئەکا رەوی
بەم کارە سۆفیانەیە پۆلێکی ساز کرد
«حافز!» قەڵەندەران بە غەزەڵ سەرزەنش نەکەی
خوا تۆی ئەزەڵ لە شیعری ریا بێنیاز کرد
«کۆلیل» وس! مەتەق مەکە بولبولقڕانە باخ
پڕپڕ لە لاشخۆرە گەمەی قەل بە باز کرد

صوفی نهاد دام و سر حقه باز کرد
بنیاد مکر با فلک حقه باز کرد
بازی چرخ بشکندش بیضه در کلاه
زیرا که عرض شعبده با اهل راز کرد
ساقی بیا که شاهد رعنای صوفیان
دیگر به جلوه آمد و آغاز ناز کرد
این مطرب از کجاست که ساز عراق ساخت
و آهنگ بازگشت به راه حجاز کرد
ای دل بیا که ما به پناه خدا رویم
زان چه آستین کوته و دست دراز کرد
صنعت مکن که هر که محبت نه راست باخت
عشقش به روی دل در معنی فراز کرد
فردا که پیشگاه حقیقت شود پدید
شرمنده ره روی که عمل بر مجاز کرد
ای کبک خوش خرام کجا می‌روی بایست
غره مشو که گربه‌ی زاهد نماز کرد
حافظ مکن ملامت رندان که در ازل
ما را خدا ز زهد ریا بی‌نیاز کرد

دڵی بولبول بووە خوێن، تا گوڵی سووری گوڵی کرد
رەشـــەبا هـــات، گوڵـــی برد و پەرێشـــاندڵـــی کرد
دڵی تووتی کە ئۆمێـــدی شەکـــەری بوو لـە خەیـــاڵ
خەتـــی ئـــاواتی لە پڕ مـــۆری مەرگ باتڵـــی کـــرد
نووری چاوانـــم و ئەو جەرگی دڵـــەم یادی بەخێـــر
چەندە زوو چوو لە دەسم، وای کە چەن موشکڵی کرد
کـــاروان! بـــاری ئـــەمن کـەوتـــووە تۆخـــوا مەدەدێ
دڵ لە گەڵ ئێـــوە بە خاتـــر کەرەمـــێ تامڵـــی کـــرد
خاکی رووم و نمی چاوم دەسی کەم مە گرە! کە حەوت
کۆشکی شـــایی فەلەکی شین، لە گڵی من گوڵی کرد
داد و هـــاوار لـە چـــاوی چەپـەڵی مانگـــی چـــەرخ!
مانگـــی من کەوتە مەحـــاق و لە گـــلا مەنزڵـــی کرد
ئەونە «حافـــز»! لە روخی شـــات نـــەدا، کـــات نەما
دەسـەڵاتـــم نەبـو من، بەزمـــی فەلـــەک مـــاتڵی کرد
بۆیە سووتـــاوە شەقـــایەق دڵـــی، «کۆلیـــل»ـی لە بـــاخ
بۆ ســـەبا چون لە سەحـــەر داغـــی دڵـــی بولبـــوڵی کرد

بلبلی خون دلی خورد و گلی حاصل کرد
باد غیرت به صدش خار پریشان دل کرد
طوطیی را به خیال شکری دل‌خوش بود
ناگهش سیل فنا نقش امل باطل کرد
قُرَّةالعَین من آن میوه‌ی دل یادش باد
که چه آسان بشد و کار مرا مشکل کرد
ساروان بار من افتاد خدا را مددی
که امید کرمم همره این محمل کرد
روی خاکی و نم چشم مرا خوار مدار
چرخ فیروزه طربخانه از این کهگل کرد
آه و فریاد که از چشم حسود مه چرخ
در لحد ماه کمان ابروی من منزل کرد
نزدی شاه رخ و فوت شد امکان حافظ
چه کنم بازی ایام مرا غافل کرد

وەکــوو سەبـــا هەوەسی مێــرغوزارم ئــاواتە
لــە پەرچــەمی نـەفـەســێ موشکبـارم ئـاواتە
دەمێـکە بێ مـەی و دڵبـەر هەدەر دەچێ تەمـەنم
بەتاڵــەتم بەســە لـەو ڕۆوە، کــارم ئـــاواتە
هەر ئابـــڕوویە بە دەس هـــات، دیــنە یّا زانیــن
هەمـــوو نیســار بە چـــاوی نیگـــارم ئـــاواتە
بە چەشنی خــۆری سبـەینـانە رون، هەتـا مــاوم
مەبـەس لە سەرفی تەمـەن عەشقی یـارم ئاواتە
بە یادی چــاوی خومــارت لە خۆ کە دێمە دەرێ
دەوامـی مەحکـــەمی قـــەوڵ و قـەرارم ئـاواتە
سـەبا لە کوێیە کە ئەو گیـانە خوێنیەم وەکـو گـوڵ
فــەدای سومبـــوڵ و بۆنی بەهـــارم ئـــاواتە
سـەفـــای دڵ بە دەغـــەڵکاری و ریـا رۆیــی
تەریقــی «حافــز»ی رەنــد و عەیــارم ئاواتە
لە داخـی زاهیـدی ملهـوورِ و شاعیـری دڵ سـاغ
دەروونــی چەشنــی «عومــەر» کۆڵـەوارم ئاواتە

چو بـــاد عزم ســر کوی یــار خواهـــم کرد

نفس به بوی خوشش مشکبـــار خواهـم کرد

به هـــرزه بی مـی و معشـوق عمـر می گذرد

بطـــالتم بس از امـــروز کـــار خواهـــم کرد

هر آبـــروی که اندوختـــم ز دانش و دیـــن

نثـــار خـــاک ره آن نگـــار خواهـــم کـــرد

چو شمع صبحـــدمم شـد ز مهـر او روشـــن

که عمـــر در ســر این کار و بــار خواهم کرد

به یاد چشم تو خود را خـراب خواهم ساخت

بنـــای عهـد قدیم استـوار خواهـــم کـــرد

صبا کجاست که این جان خون گرفته چو گل

فـــدای نکهت گیســـوی یـــار خواهـــم کرد

نفـــاق و زرق نبخشـــد صفـــای دل حافـــظ

طـــریق رندی و عشق اختیـــار خواهـــم کرد

دەستــی وەسڵــی من و ئەو زولفە دوتــا چۆن دەکرێ
وەی کـە بــاوەڕ بە وەفــاتــان و ســەبا چۆن دەکــرێ
ئەرکی سەر شــانە لە پێــناوی دڵا هــەوڵ و خەبــات
هەر ئەوەنــدەی هەیە تێکــدانی قــەزا چۆن دەکرێ؟!
چــاکی داوێنــی بە سەد خوێنی جیگەر کەوتە دەسـم
بە فــەن و فێــڵی بەغێڵێــک رەهــا چــۆن دەکــرێ
روومــەتی ئەو بە مەســەل حەیفە بڵێــن مانگــی پڕە
کە قیــاسی لەگەڵ ئەو بێ‌ســەر و پــا چۆن دەکرێ
چــاوی خــاوێنە شیــاوی نەزەری روومــەتی یــار
کە لـە ئاوێنــە نـەزەر، بێ لـە سەفــا چۆن دەکرێ
موشکــڵی عەشــق و ئەوین دوورە لە عیلمــی من و تۆ
کەشفــی ئـەم رازە بە قــەولی عولــەما چۆن دەکــرێ
داخــم ئەو داخــە کە دڵــداری جەهــانیت، وەلێ
شـەڕی ئەم عەشقە لەگەڵ خەڵکی خـودا چۆن دەکرێ
ئەو دڵــەی نــاسک و ئەو تەبعــە لەتیفــەت وتی پێم
نوتقــی پەروانە لەکــن کولــمــی چــرا چۆن دەکــرێ
هــەر لە میحــراوی بـرۆ تا دڵــی «حافــز» دەچــەمێ
تــاعەتی غەیــری ئەتۆ لــەو خەمــەدا چۆن دەکرێ
قــامەتت رووگــەیی «کۆلیــل»ـە بە ئاشیــرەتی چاو
قیبلــەدۆزینــەوە بێ قیبلــەنومــا چــۆن دەکــرێ

دست در حلقه‌ی آن زلف دوتـا نتـوان کرد
تکیـه بر عهـد تو و بـاد صبا نتـوان کرد
آن چه سعی است من اندر طلبـت بنمـایم
این قـدر هست که تغیـیر قضا نتوان کرد
دامن دوست به صد خون دل افتاد به دست
به فسـوسی که کند خصم رهـا نتـوان کرد
عارضـش را به مثـل ماه فلک نتـوان گفت
نسبت دوست به هـر بی سـر و پا نتوان کرد
سـرو بالای من آن گه که درآید به سماع
چه محـل جـامه‌ی جان را که قبا نتوان کرد
نظـر پـاک توانـد رخ جـانـان دیـدن
که در آیینـه‌ی نظـر جز به صفـا نتوان کرد
مشکـل عشق نه در حوصله‌ی دانش ماست
حل این نکتـه بدین فکـر خطـا نتـوان کرد
غیـرتم کشت که محبـوب جهـانی لیکن
روز و شب عـربده با خلق خـدا نتوان کرد
من چه گویم که تو را نـازکی طبع لطیف
تا به حـدی‌ست که آهسته دعـا نتوان کرد
بجز ابـروی تو محـراب دل حافـظ نیست
طـاعت غیر تو در مذهـب مـا نتـوان کرد

رفـانی دڵم و دی نەمـدی کە چەی کرد
پەری ئاخـۆ بە کێ کەنگێ دەبەی کـرد؟
شـەوی دووری لە مەرگـم نیشتـە پارێـز
بە هۆی لوتفـی خەیـاڵی بوو، کە نەی کرد
لە دڵ چۆن چون گوڵاڵەم خوێـن نەچۆڕێ
کە چـاوی چەن لە گەڵمـانا گـزەی کرد
بـە کـێ بێـژم بە هـاودەستی برینـان
تەبیـبم قەستـی گیـانی پڕ لـە وەی کرد
وەکـوو مۆمی کە گـڕ بەر دا لە گیـانم
سوراحـی شیـوەن و ناڵیـنی نـەی کرد
ئەگـەر کـارێ لە دەستـت دێ سەبا دەی
کە دەردی ئـارەزوم ئـارامی پـەی کرد
لە کـۆڕی عـاشقـان ناشـێ بڵێ کەس
کە یـاری ئێمە چی فـەرموون و چەی کرد
بە گیـانی «حافـز»ی دژمـن نەکـردوون
ئەوەی تیـر و کـەوانی تۆ ئـەوەی کرد
لە ڕۆژێکـۆ «عومـەر» مەستـی قـەزا بوو
قـەدەر دوو چـاوتـانی پـڕ لـە مەی کرد

دل از مـن برد و روی از من نهـان کرد
خـدا را با که این بـازی تـوان کرد
شب تنهـاییـم در قصـد جـان بود
خیالـش لطف‌هـای بیکـران کـرد
چـرا چون لاله خونیـن دل نبـاشـم
کـه بـا مـا نرگس او سـر گـران کرد
که را گویـم که با این درد جـان‌سـوز
طبیـبم قصـد جـان نـاتـوان کـرد
بدان سـان سوخت چون شمعم که بر من
صـراحی گریـه و بربـط فغـان کـرد
صبـا گر چـاره داری وقت وقت است
که درد اشتیـاقم قصـد جـان کـرد
میـان مهـربانـان کی تـوان گفت
که یـار ما چنیـن گفت و چنـان کرد
عـدو با جـان حافـظ آن نکـردی
که تیـر چشـم آن ابـروکمـان کرد

سەفەری یادی بەخێر ئەو لە کەسی یاد نەکرد
بە هەواڵێ دڵێ غەمباری کەمێ شاد نەکرد
ئەو جووان بەختە کە مۆری کەرەمی نەخشە لە دڵ
بۆ غوڵامێکی کەنەفتی لە غەم ئازاد نەکرد؟
ئەم کەوا کاغەزیەم شەرتە بە خوێناوەشۆم
رێنوێنیمی فەلەك چونکو بە کۆی داد نەکرد
بێستوون شیوەنمی بیستووە وا هەر دەگری
چبوو شیرین کەمەکێ رەحمی بە فەرهاد نەکرد
سێبەرت تا لە چەمەن گرتەوە بولبول لەوە پاش
قەتی هێلانە لە نێو پەرچەمی شمشاد نەکرد
حەققی خۆی بوو کە سەبا رەوتی رەوانێکی نەما
چونکە چالاکتری لەو سەفەرەت، باد نەکرد
نەخشی ئاواتی نەکێشێ قەڵەمی شینی فەلەك!
هەرکە ئیقراری بە ئەم جوانیە، بێداد نەکرد
موتریبا! پەردە لە سەر نەزمی عەراقی بکە کۆك
چونکە لەم رێگەوە چوو یار و کەسی یاد نەکرد
شیعری «حافز» لە مەقاماتی عەراقی غەزەڵێ
ئەم هەوا کەوتە دڵی کێ گڕی ئیجاد نەکرد؟!
عەشقی پیری شەوی رسوائیە «کۆلیل»! بەڵام
کەس وەکوو لێوی ئەوین، جوانمی ئیرشاد نەکرد

یاد باد آن که ز ما وقت سفر یاد نکرد
به وداعی دل غم‌دیده‌ی ما شاد نکرد
آن جوان بخت که می‌زد رقم خیر و قبول
بنده‌ی پیر ندانم ز چه آزاد نکرد
کاغذین جامه به خوناب بشویم که فلک
رهنمونیم به پای علم داد نکرد
دل به امید صدایی که مگر در تو رسد
ناله‌ها کرد در این کوه که فرهاد نکرد
سایه تا بازگرفتی ز چمن مرغ سحر
آشیان در شکن طره‌ی شمشاد نکرد
شاید ار پیک صبا از تو بیاموزد کار
زآن که چالاک‌تر از این حرکت باد نکرد
کلک مشاطه صنعش نکشد نقش مراد
هر که اقرار بدین حسن خداداد نکرد
مطربا پرده بگردان و بزن راه عراق
که بدین راه بشد یار و ز ما یاد نکرد
غزلیات عراقی‌ست سرود حافظ
که شنید این ره دل‌سوز که فریاد نکرد

ماڵیـــم روو لە ڕێگــەی و لێمــی گـوزەر نەبوو
سـەد تیشکی بوو گـلار و یەکێکی نـەزەر نەبوو
لافـــاوی چـــاوی ئێمـــە دڵی شستوشـۆ نەدا
بـــاران لە بەردی مەڕمـەڕی هەرگیز ئەسەر نەبوو
یاڕەب لە تیـــری ئاخی بپـــارێزە شـۆخی شـــار
هەرچـەن لە ناخـی گۆشـەگرانی حـەزەر نەبوو
شـەوناڵەکەم لە چـاوی مەل و مۆری خەو رفـان
ئەو شـۆخە دڵـــڕفێنە، لە خـەونی خـــەوەر نەبوو
ویستـــم کە چەشنـــی مۆمی بســـووتم لە ڕێگـەیا
ئەو هەر نەهـــات و رەوتی نەسیمی سەحەر نەبوو
ئەو دڵ لە بەردە کێیە ئەوەن مێـــشکـی پووچەڵە
بۆ تێغـی قـــاری عەشقی ئەتۆ ســـەر لە بەر نەبوو
ئەو بێ‌زمانە «خاجە»! واتە قەڵـــەم، عەشقـی تۆی
بۆ کەس نەوت هەتـاکـو لچ و لێـو و سـەر نەبوو
دیوانی عەشقـــی خاجـــە بە دڵ شێـتی کـردووم
میوانی بەژنـی بـۆیە کەسێ وەک «عومەر» نەبوو

رو بر رهش نهادم و بر من گذر نکرد
صد لطف چشم داشتم و یک نظر نکرد
سیل سرشک ما ز دلش کین به درنبرد
در سنگ خاره قطره باران اثر نکرد
یا رب تو آن جوان دلاور نگاه دار
کز تیر آه گوشه‌نشینان حذر نکرد
ماهیّ و مرغ دوش ز افغان من نخفت
وان شوخ دیده بین که سر از خواب برنکرد
می‌خواستم که میرمش اندر قدم چو شمع
او خود گذر به ما چو نسیم سحر نکرد
جانا کدام سنگ‌دل بی کفایتی‌ست
کو پیش زخم تیغ تو جان را سپر نکرد
کلک زبان بریده‌ی حافظ در انجمن
با کس نگفت راز تو تا ترک سر نکرد

چۆن یـار چـوون و عـاشقـی زاری خەبـەر نەکرد
یـادی لە دۆسی شـاری و یـاری سەفـەر نەکرد؟
یـا بەختـی مـن مەرامـی ئـەوانـی نەگـرتە بـەر
یـا ئـەو بە کـۆی مەرامـی منـی هەر گوزەر نەکـرد
پێـم وابو گەرمەشیـنی ئەوین نـەرم ئەکـا دلـّی
نـالـّەم گەیی بە عـەرش و لە نـالـّی ئەسـەر نەکرد
سـووکی مەکـەن لە حەقـقی مەلـی بێـقەراری دلّ
چون عەشقـی داوی زولفی لە سەر قەت بەدەر نەکرد
گولـّزاری رووت هەر کە دەبیـنێ بە دلّ دەکـات
مـاچی دییـەم، کـە چـاوی لـە تۆ بێنـەزەر نەکرد
وەستـام تـا بـە چەشنی شەمـێ دامـرم لـە رێـی
ئەو خۆی عوبووری چەشنی هەناسەی سەحەر نەکرد
«کۆلیـل» وەک پەپـوولە پەڕ و بـالـّی سووتیـا
چونکـە لە مۆمـی رووتـی بە عومـری خەتەر نەکرد

دلبـر برفت و دل‌شـــد گان را خبـر نکرد
یـــاد حریف شهــر و رفیــق سفــر نکرد
یـا بخت من طـریق مروت فـرو گذاشت
یـــا او به شاهـــراه طریقـت گـــذر نکرد
گفتـــم مگر به گریـــه دلش مهـربان کنم
چون سخت بود در دل سنگش اثـر نکرد
شوخـــی مکـن که مرغ دل بی‌قـــرار من
ســـودای دام عاشقـی از ســـر به درنکرد
هر کس که دید روی تو بوسید چشم من
کـــاری که کرد دیـده‌ی من بی‌نظر نکرد
من ایستاده تا کنمـــش جـان فدا چو شمع
او خود گـذر به ما چو نسیـــم سحر نکرد

دیتە ئەی دڵ کە هەمیسان غەمی دلبەر چ دەکا
بەو سەفەر چوونیە لەم سینگە بە نەشتەر چ دەکا

لە دەس ئەو چاوە سیحرباز و شەڕەنگێزییە وەی
هەی کە ئەو مەستە لە وەشیاری هونەروەر چ دەکا

شەوەقی سووری سرشکم هونەریٚ قاری ئەون
بەختی بەدبەخت تەماشا کە لە گەوهەر چ دەکا

کە لە کۆی لەیلەوە دەربێت بروسکەی سەحەریٚ
وەی لە دەغڵی دڵی مەجنوونی دەرەو دەر چ دەکا

ساقیا ساغری مەی بێنەوە! نەققاشی ئەزەڵ
کێ دەزانێ کە لەگەڵ چەرخی مودەووەر چ دەکا

کێ لە جەغز و خولی پەرگاری ئەوی داوە خەبەر
لەو هەموو نەخشە پڕەنگەی فەلەکی، سەر چ دەکا

فکری عەشق، ئاوری غەم، «حافز»ی گڕ داوە ئەشا!
یاری مێژینە لەگەڵ عاشقی بێوەر چ دەکا

بۆنی عەشقی دڵی سووتاوی «عومەر» عالەمی گرت
لە نەسیمی گوڵی غەم، عوود و سنەوبەر چ دەکا

دیدی ای دل که غم عشق دگربار چه کرد
چون بشد دلبر و با یار وفادار چه کرد
آه از آن نرگس جادو که چه بازی انگیخت
آه از آن مست که با مردم هشیار چه کرد
اشک من رنگ شفق یافت ز بی‌مهری یار
طالع بی‌شفقت بین که در این کار چه کرد
برقی از منزل لیلی بدرخشید سحر
وه که با خرمن مجنون دل‌افگار چه کرد
ساقیا جام می‌ام ده که نگارنده‌ی غیب
نیست معلوم که در پرده‌ی اسرار چه کرد
آن که پرنقش زد این دایره‌ی مینایی
کس ندانست که در گردش پرگار چه کرد
فکر عشق آتش غم در دل حافظ زد و سوخت
یار دیرینه ببینید که با یار چه کرد

ئەی حەریفـــان کچـی ڕەز تۆبــە لە پەنهــانی ئەکـات
بـە هـــــەواداریـی دارۆغــــە دورڕئەفشـــانی ئەکـات
ئارەقـی پـــاك لە ڕوو كەن! كە لە خومخـــانە دەرات
با نەڵێـــن ئەو كچە بەم كـــۆڕە گرانجـــانی ئەكــات
موژدە ئـەی دڵ! كە هەوا بێـــژی ئەوین هەمدیســـان
سێــوی لێــوی شەكـــەری چــاری پەرێشانی ئەكات
نەك بە حەو ئـاو، بە ســەد ئـاگرە هەر سوور بە مەی
ئەو عەبــا قــرمـزە یــاشێـــخ لە ســەر شـــانی ئەكات
پێكـــەنی خونچـــەیی وەسڵــم بە شنەی پەرچەمی یار
وەسفی گوڵ بولبولی دەنگ‌خۆش بە گۆرانی ئەكات
خاكســـاری مەدە «حافـز»! لە دەس، ئاخـر كە بەغێـــڵ
ئابـــڕوو، دینـی، دڵـــی، هەر بەشـی شەیتـــانی ئەكات
بۆیە «كۆلیـــل»ـی گوڵی كێـــوی و سەر ئەشكـــەوتم
پاسـەوانی لە شكـۆی دەشت و دەری جوانی ئەكات

دوستـــان دختـــر رز توبـــه ز مستـــوری کـــرد
شـــد ســـوی محتسب و کـــار به دستـــوری کـرد

آمـــد از پـــرده به مجلس عرقـــش پـاک کنید
تـا نگوینـــد حریفـــان کـه چـــرا دوری کـــرد

مژدگــــانی بده ای دل که دگـــر مطـرب عشـــق
راه مستـــانه زد و چـــارهٔ مخمـــوری کـــرد

نـه بـه هفـت آب کـه رنگـش به صـــد آتش نرود
آن چه بـــا خـــرقهٔ زاهـــد مـی انگـــوری کرد

غنچـــهٔ گلـــبن وصلـــم ز نسیمـــش بشکفت
مـرغ خوشخوان طـرب از برگ گل سـوری کرد

حافـــظ افتـــادگی از دست مـده زان که حسـود
عــرض و مـــال و دل و دین در سر مغـروری کرد

تەمـــەنێ، دڵ هەوەســی جـــانی جەم ئارای دەکرد
خـۆی ئـەوەی بوو لە بیـانی کـە تەقـازای دەکـرد

گەوهـەری دڵ کە لە کـــان و سـەدەفی بـون بەدەرە
بـۆ لە گـومبووی لچـی زەریـا تەڵەبی وای دەکـرد؟!

دوێشـەو ئـەم رازمـە بۆ مورشیـدی مەیخـانە دەوت
بێ گـومان بـوم کە دڵـی ئەو گـوڵی مەعنـای دەکرد

دیـم لە زاری گوڵــی زەردەو لە دەسی جـامی شەراب
خۆش لە ئەو ئایـەنە سـەد جـۆرە تەماشــای دەکـرد

وتـم ئەم جـامی جەهـانبینـتە کـەی بوو بە خەڵات
وتـی ئــەو رۆژە خـودا خێـوەتی باڵای دەکـرد

عاشقــێ خوا لەگەڵـــی بوو لە هەمـوو کات و ئـەویش
چـاوی بینـینی نەبـوا! پـڕ بــە دەم ئەڵڵای دەکرد

ئەو هەمـوو فێڵە کە کـردی بە دڵ و گیـانی وەکوو
ســامری بوو کە لەگــەڵ حەزرەتی مووســای دەکرد

وتی ئەو دۆســە، کە بـەو بوو سـەری سێــدارە بڵیند
هەر گونـاحی ئەوە بوو کەشفــی کـەر و گـای دەکرد

نەفەسـی حـەزرەتی جبریـل بگـا گــەر بە کەسـێ
ئەو کەسـەش لێـوی وەکوو لێـوی مەسیحـای دەکرد

زولفــی زنجیــری بوتــان بۆ چییـە پرسیـــم، وتـی
چونکــە «حافـز» لە دڵـــی شێـتی سکــاڵای دەکرد

دڵ کە نەیبـەسیـەوە «کۆلیــل»! بە داوێکـی وەهــا
چـۆن بە ئـەو چـاوە جووانبینـتە بـڕوای دەکـرد

ســـال‌ها دل طـلـب جـام جـم از مـا می‌کرد
وآن‌چـــه خـود داشت ز بیـــگانه تمنـا می‌کرد
گوهری کز صدف کـون و مکـان بیرون است
طلـب از گـمشـــدگان لب دریـــا مـی‌کــرد
مشکـــل خویش بر پیـــر مغـــان بردم دوش
کـو به تأییـــد نظـــر حـــل معمـــا می‌کرد
دیدمش خـــرم و خنـــدان قدح بـاده به دست
ونـــدر آن آینـــه صد گونـــه تماشا می‌کرد
گفتم این جام جهان‌بیـن به تو کی داد حکیـم
گفت آن روز که این گنـبد میـــنا می‌کـرد
بی‌دلـــی در همـه احـــوال خـــــدا بـا او بود
او نمی‌دیـــدش و از دور خـــدا را می‌کـرد
این همه شعبـــده‌ی خویش که می‌کـرد اینجا
ســـامری پیش عصـــا و یـــد بیضـــا می‌کرد
گفت آن یـــار کز او گشت ســـر دار بلنـــد
جرمـــش این بود که اســـرار هویـــدا می‌کرد
فیـــض روح‌القـــدس ار بـــاز مدد فرمـــاید
دیگـــران هم بکـنـند آن‌چـه مسیحـــا می‌کرد
گفتمش سلســـله‌ی زلف بتـــان از پی چیست
گفت حافـــظ گلـــه‌ای از دل شیـــدا می‌کرد

بە رەمزی جامی جەم ئەو کاتە روونە چاوی نەزەر
بە خاکی مەیکەدە هەر رشتبێتی دیدەیی سەر
مەژێ بە بێ‌مەی و موتریب لە ژێر کەوانی فەلەك!
کە بەم دووانە غەمی دڵ دەنێیە چەرخی چەمەر
گوڵی موراد دەمێ لا ئەدا لە روو، تارا
لە خزمەتێ قژی هەر وەك سەبا بە! تا بە سەحەر
لە دەرکی مەیکەدە ئەکسیری بێ‌نەزیرە سووال
بکەی بە زێڕ بە ئەم کارە خاکی رێگە مەگەر
بە کۆی ئەوین ئەگەرت قودرەتی سەفەر مابێ
حەساوی بەرهەمی نایێ بە هۆش و مێشکی بەشەر
کەسێ لە ماڵی تەبیعەت نەچێتە دەر ئاخۆ
چلۆن بە باڵی تەریقەت گوزەر دەکا لە خەتەر؟!
لە پەردەدا نییە هەرچەن جەماڵی یار، بەڵام
غوباری دیدە بشۆری دەبێ بە خوێنی جیگەر
تەڵەب کە رەونەقی دیدار و جەژنی سەربەرزی
فەقەت لە سەر جەز و خەرمانی لوتفی ئەهلی نەزەر
وەلێ دەبێ مەبەست یار بێت و بادە، دەنا
تەماحی دیکە بە گشتی هەمانە بایە لە سەر
دڵێ کە روونە بە نووری ئەوین، دەکا وەکو شەم
بە پێکەنین سەری پێشکەش، بە عەشق و شەوقی هونەر
گەر ئەم نەسیحەتە پیرانە بژنەوێ «حافز»
شەقامی مەیکەدە ژیرانە سەر، دەکاتە گوزەر
گەر ئەم تەبیعەتە وێرانە دڵ نەکا وێران
مەرامی پیری موغانی مورادە تەبعی «عومەر»

به سـرّ جـام جم آن گه نظـر توانـی کرد
که خـاک میکـده کُحل بصر توانی کرد

مبـاش بی می و مطرب که زیر طاق سپهر
بدین تـرانه غـم از دل به در تـوانـی کرد

گل مـراد تو آن گـه نقـاب بگشـاید
که خدمتـش چو نسیـم سحـر توانی کرد

گـدایی در میخـانه طـرفه‌ی اکسیری‌ست
گر این عمـل بکنی خـاک زر تـوانی کرد

به عـزم مرحلـه‌ی عشق پیش نـه قـدمی
که سـودها کنی ار این سفـر توانی کرد

تو کـز سـرای طبیعت نمـی‌روی بیـرون
کجـا به کوی طریقـت گـذر توانـی کرد

جمـال یـار ندارد نقـاب و پـرده ولـی
غبـار ره بنشـان تـا نظـر توانـی کـرد

بیـا که چـاره‌ی ذوق حضور و نظـم امور
به فیـض بخشی اهـل نظـر تـوانـی کرد

ولی تو تا لب معشـوق و جـام مـی خواهی
طمـع مدار که کـار دگر تـوانـی کـرد

دلا ز نـور هـدایت گـر آگهـی یـابی
چو شمـع خنـده‌زنـان ترک سر توانی کرد

گر این نصیحت شـاهانه بشنـوی حـافـظ
به شاهـراه حقیـقت گـذر تـوانی کرد

چ مەستییەکە بە سەرمانی لەعلی مەی هێنا
بڵێن چ کارەیە ساقی شەرابی چەی هێنا
بە جامی بادەوە سا زوو بە! روو لە سەحرا کە!
کە ناخی بولبولی خۆش‌خوێن خرۆشی نەی هێنا
بڵێ بە خونچە سکاڵا لە زاری بەستە نەکا
سەحەر نەسیمی سەبا دار و دەستەکەی هێنا
گەیشتنی گوڵ و نەسرین بە خێر و خۆشی بێ!
وەنەوشە شاد بە دڵ، وەک سەمەن گەشەی هێنا
سەبا بە خۆش‌خەبەری وەک پەپووسلێمانە
لە بەژنی گوڵشەنی باخی سەبا شنەی هێنا
بە نازی ساقییە دەرمانی گیانی لاوازم
هەڵێنە چاو کە دوکتور بەزەی بزەی هێنا
غولامی پیری موغانم، لە من مەڕەنجە جەناب!
کە قەولی بادە لە تۆ بوو، وەلێ ئەوەیهێنا
فیدای سەروەری شۆخان و چاوی تەنگی بم
کە زۆری چەن لە هەژارێک بۆ جبەی هێنا
فەلەک غولامیی «حافز» بە دڵ دەکا ئێستا
پەناهی چونکە بە خاکی جەنابی کەی هێنا
وتم دییەم گلی تێچووگە، سورمەیێ «کۆلیل»!
وتی لە خاکی (سنە)ی بۆ مە گوڵ‌کلەی هێنا

چه مستی‌ست ندانم که رو به ما آورد
که بود ساقی و این باده از کجا آورد
تو نیز باده به چنگ آر و راه صحرا گیر
که مرغ نغمه‌سرا ساز خوش‌نوا آورد
دلا چو غنچه شکایت ز کار بسته مکن
که باد صبح نسیم گره‌گشا آورد
رسیدن گل و نسرین به خیر و خوبی باد
بنفشه شاد و کش آمد سمن صفا آورد
صبا به خوش خبری هدهد سلیمان است
که مژده‌ی طرب از گلشن سبا آورد
علاج ضعف دل ما کرشمه‌ی ساقی‌ست
برآر سر که طبیب آمد و دوا آورد
مرید پیر مغانم ز من مرنج ای شیخ
چرا که وعده تو کردی و او به‌جا آورد
به تنگ‌چشمی آن ترک لشکری نازم
که حمله بر من درویش یک قبا آورد
فلک غلامی حافظ کنون به طوع کند
که التجا به در دولت شما آورد

سەبا کاتی سەحەر لەو زولفە عەتر و عەمبەری هێنا
لە خۆشی وا نەسیمێ، دڵ بە جێگەی پێ سەری هێنا
لە نێو باخی دیەم شکڵی سنەوبەر هەڵکەنم چاکە
نەمامی بەژنی چون دایم لە دەرد و غەم، بەری هێنا
کە مانگی روومەتی دەرکەو لە ئاسۆی کۆشک ئەوەن رۆشن
لە شەرما رۆژی رون گریا بەرۆکی ئەحمەری هێنا
لە تالان و برۆی چاوی دڵی خوێنینم جێ‌هێشت
وەلێ بەو خوێنەشۆ، عەشقی جەسوورم، جەوهەری هێنا
بە واتەی موتریب و ساقی لە رێ دەرچووم و عاشق بووم
بە دەگمەن چونکە لەم رێگا، سەبا بۆی دلبەری هێنا
لە روی لوتف و کەرەم بوو، هەر خەلاتێ گوڵ وتی هانێ
ئەگەر زاری هەلاهەل یا گوڵاوی قەمسەری هێنا
بڕستی لێ بڕیم ئەرچی برۆی، سەد گەردنی ئازا
کە سەد نازی شەفابەخشی لە حەوزی کەوسەری هێنا
ورم دوێشەو لە مەی نۆشینی «حافز» ماق ما، ئەمما
وتم مەیکەن کە وەک سۆفی شەراوی ئەتهەری هێنا
بەهەشت و دارە توویاکەی لە باوەڕتا نەبوو «کۆلیل»!
هەتا ئەو رۆژە ساقی کولم و بەژنی عەرعەری هێنا

صبا وقت سحر بویی ز زلف یار می‌آورد
دل شوریده‌ی ما را به بو در کار می‌آورد
من آن شکل صنوبر را ز باغ دیده برکندم
که هر گل کز غمش بشکفت محنت بار می‌آورد
فروغ ماه می‌دیدم ز بام قصر او روشن
که رو از شرم آن خورشید در دیوار می‌آورد
ز بیم غارت عشقش دل پرخون رها کردم
ولی می‌ریخت خون و ره بدان هنجار می‌آورد
به قول مطرب و ساقی برون رفتم گه و بی گه
کز آن راه گران قاصد خبر دشوار می‌آورد
سراسر بخشش جانان طریق لطف و احسان بود
اگر تسبیح می‌فرمود اگر زنار می‌آورد
عفاالله چین ابرویش اگرچه ناتوانم کرد
به عشوه هم پیامی بر سر بیمار می‌آورد
عجب می‌داشتم دیشب ز حافظ جام و پیمانه
ولی منعش نمی‌کردم که صوفی‌وار می‌آورد

نەسیمی سروە، سەحەر، عەتر و عەمبەری هێنا
زەلان شکا کە سەبا فەوج و لەشکەری هێنا

کراسی پارە دەبەخشم بە نەیژەنی مەی‌نۆش
لە مژدەی ئەو خەبەری خۆشە سوح دەری هێنا

دەگیانە زوو وەرە! بۆ ئەم غولامە بووە ڕێزوان
کە بەم جەهانە کچ و بەژنی عەرعەری هێنا

دلا! دەگەیتەوە شیراز بەخت ئەگەر یارە
لە دووری یار گەرم! بەختی یاوەری هێنا

بە دەستی بێنە دلم چون گەلێ تەقیلەی شر
دو سەد وەک ئەفسەری شایی فەڕی سەری هێنا

لە جەغزی نالەمە مانگی تەواو و خەرمانەی
بڕۆی بە چەشنی هیلالی کە خەنجەری هێنا

گەییوە پەرچەمی «حافز» بە ژووری عەرشی فەلەک
هەواری چونکە بە دەرباری سەروەری هێنا

بە تاجی هەر نییە «کۆلیل»! گوڵ نیازێکی
کە فەڕی سومبولی سەد تاجی گەوهەری هێنا

نسیم باد صبا دوشم آگهی آورد

که روز محنت و غم رو به کوتهی آورد

به مطربان صبوحی دهیم جامه‌ی چاک

بدین نوید که باد سحرگهی آورد

بیا بیا که تو حور بهشت را رضوان

در این جهان ز برای دل رهی آورد

همی‌رویم به شیراز با عنایت بخت

زهی رفیق که بختم به همرهی آورد

به جبر خاطر ما کوش کاین کلاه نمد

بسا شکست که با افسر شهی آورد

چه ناله‌ها که رسید از دلم به خرمن ماه

چو یاد عارض آن ماه خرگهی آورد

رساند رایت منصور بر فلک حافظ

که التجا به جناب شهنشهی آورد

دڵبەر کە قەدەح بە دەست بگرێ
کێ شۆخە غەمی شکەست بگرێ
کێ دیدەتی دیوە کردی هاوار
دارۆغە لە کوێیە مەست بگرێ؟
ماسی دڵەکەم لە بەحری چاوت
تا یار قولاوی هەست بگرێ
کەوتوومەتە خاکی پێی بە زاری
ئاخۆ دەکرێ کە دەست بگرێ؟
خوڕڕەم دڵە، هەرکە چەشنی «حافز»
جامێ لە دەسی ئەڵەست بگرێ
«کۆلیل»ـە ئەوەی لە گوێنی من بێ
دژمن مەتەقی بە شەست بگرێ

یارم چو قدح به دست گیرد
بازار بتان شکست گیرد
هر کس که بدید چشم او گفت
کو محتسبی که مست گیرد
در بحر فتاده‌ام چو ماهی
تا یار مرا به شست گیرد
در پاش فتاده‌ام به زاری
آیا بود آن که دست گیرد
خرم دل آن که همچو حافظ
جامی ز می الست گیرد

دڵم بێ خۆشەویسی روومەتی جوان و پەری، ناوێ
بە هەر جۆرێ ئەدەم وەعزی ئەڵێ پێم، ئەشتەری ناوێ

لەمەولا تۆ بی‌و دینت! لە ساز و مەی بڵێ واعیز
کە خۆش‌تر لەم خەیاڵەی سەر بێ، گیانم سەری ناوێ

فیدای روخساری ئاڵت ساقیا! بۆم بێنە جامێ تاڵ
کە دڵ غەیری بزەی مەیگێڕ و بادەی ئەحمەری ناوێ

لە ژێر ئەو خەرقە وەک دەفتەر دوعا، جامی مەی ئەنوێنم
گری فێڵ و ریا سەیرە حەریفی دەفتەری ناوێ

دەبێ ئەم خەرقە پیناویمە رۆژێکی بسووتێنم
کە پیری مەی‌فرۆشانی، بە جامێ موشتەری ناوێ

گەشەی کۆڕی حەریفان هەر بە جامی مەی دەبێ حاسڵ
کە غەیری نەخشی یەک‌ڕەنگی، لە لەعل و گەوهەری ناوێ

نەسیحەت بێژی رەندان، چۆن دەگۆڕێ چارەنووسی ژین
بە دڵ‌تەنگی دەبینم، دا بزانن ساغەری ناوێ؟!

دەڵێی دەس هەڵگرم لەو شۆخە لێو ئاڵە و گوڵەندامەم!!
برۆ لاچۆ قسەی پووچەڵ، گوڵی بۆ عەمبەری ناوێ

گرین و پێکەنینم تێکەڵاون، وەک شەمی مەجلیس
زمانم گەرمە وەک ئاور وەلێ کەس ئاوری ناوێ

لە زولفی داوبازت ئافەرین خۆش تەیری دڵمی گرت
کە بۆ راوی هەڵۆ هەرکەس لە زولفت چاتری ناوێ

قسەی سامانی مەحبووب و نیازی عاشقین ئەی دڵ!
غەزەل سیحرێ دەزێ وەختێ غەزاڵت هونەری ناوێ؟!

من ئەو روخسارە، وەک جامی سکەندەر، دەس دەخەم رۆژێ
ئەوینیشم دڵی نەگرێ، دڵی من یاوەری ناوێ

هەزاری دەرکی تۆم ئەی دەوڵەمەن تۆ بی و خوا رەحمێ!
بەڵەد نیم ئاستانی کەس، دڵم عەقڵی سەری ناوێ

شیاوی «خاجە»ئازیزم، بە شێوەی شیعری شیرینی
خەڵاتی زێڕی سەر تا پایە، مەرجی داوەری ناوێ

دڵ و گیان و شعوور و شیعر و لەش گشتی بە قوربانی
دەم و لێو، چاو و ئەبرۆ، بەژنی، هەرچەن «هۆمەر»ی ناوێ

دلم جز مهر مه‌رویان طریقی بر نمی‌گیرد
ز هر در می‌دهم پندش ولیکن در نمی‌گیرد
خدا را ای نصیحتگو حدیث ساغر و می گو
که نقشی در خیال ما از این خوش‌تر نمی‌گیرد
بیا ای ساقی گلرخ بیاور باده‌ی رنگین
که فکری در درون ما از این بهتر نمی‌گیرد
صراحی می‌کشم پنهان و مردم دفتر انگارند
عجب گر آتش این زرق در دفتر نمی‌گیرد
من این دلق مرقع را بخواهم سوختن روزی
که پیر می فروشانش به جامی بر نمی‌گیرد
از آن رو هست یاران را صفاها با می لعلش
که غیر از راستی نقشی در آن جوهر نمی‌گیرد
سر و چشمی چنین دلکش تو گویی چشم از او بردوز
برو کاین وعظ بی‌معنی مرا در سر نمی‌گیرد
نصیحتگوی رندان را که با حکم قضا جنگ است
دلش بس تنگ می‌بینم مگر ساغر نمی‌گیرد
میان گریه می‌خندم که چون شمع اندر این مجلس
زبان آتشینم هست لیکن در نمی‌گیرد
چه خوش صید دلم کردی بنازم چشم مستت را
که کس مرغان وحشی را از این خوش‌تر نمی‌گیرد
سخن در احتیاج ما و استغنای معشوق است
چه سود افسونگری ای دل که در دلبر نمی‌گیرد
من آن آیینه را روزی به دست آرم سکندروار
اگر می‌گیرد این آتش زمانی ور نمی‌گیرد
خدا را رحمی ای منعم که درویش سر کویت
دری دیگر نمی‌داند رهی دیگر نمی‌گیرد
بدین شعر تر شیرین ز شاهنشه عجب دارم
که سر تا پای حافظ را چرا در زر نمی‌گیرد

غزل شماره ۱۴۹

ساقی ئەم جۆرە بکا ناز لە هەر جامێکا
جێگەی ئەهلی دڵە مەیخانە لە هەر شامێکا
تا لە ژێر داوی خەمی دانەیی غەم داشارێ
گیرە تەیری ئەمەلم باڵی لە مل دامێکا
خۆزگە بەو مەستە! نەزانێ لە گڕی عەشقی دڵی
مێزەری یا سەری پێشکەش بە گوڵەندامێکا؟!
زاهیدی گێژ کە نەفرینی مەی و جامی ئەکرد
ژێر ئەبێ گەر نەزەرێ خۆش لە دڵی جامێکا
ڕۆژ کاتی هونەرە و کار، نە نۆشینی شەراب
ڕەش نەکەی جامی دەروونت لە گەروی کامێکا
کاتی نۆشینی شەرابی سەحەرئاکارە، دەمێ
خەوتبێ خۆر کە لە ژێر خێوەتی ڕەش فامێکا
قەت لەگەڵ موحتەسیبی شار نەنۆشیت، دەخیل!
پیاڵە بشکێنە و مەی نۆش لە هەر تامێکا
تاجی زێڕینی هەتاوت لە سەرن «خاجە» ئەگەر
فاڵ دەر بێ لەگەڵ ئەو مانگە لە فەرجامێکا
شانسی «کۆلیل» نەبوو فاڵی هەموو پووچە، وەلێ
دڵی هەروا لە خەیاڵاتی دلارامێکا

ساقی ار باده از این دست به جام اندازد
عارفان را همه در شرب مدام اندازد
ور چنین زیر خم زلف نهد دانه‌ی خال
ای بسا مرغ خرد را که به دام اندازد
ای خوشا دولت آن مست که در پای حریف
سر و دستار نداند که کدام اندازد
زاهد خام که انکار می و جام کند
پخته گردد چو نظر بر می خام اندازد
روز در کسب هنر کوش که می خوردن روز
دل چون آینه در زنگ ظلام اندازد
آن زمان وقت می صبح فروغ است که شب
گرد خرگاه افق پرده‌ی شام اندازد
باده با محتسب شهر ننوشی زنهار
بخورد باده‌ات و سنگ به جام اندازد
حافظا سر ز کله گوشه‌ی خورشید برآر
بختت ار قرعه بدان ماه تمام اندازد

لەگەڵ غەم هاوەڵی وەختێ، هەموو دونیا دەمێ ناکا
بە جامێ کەمتری بفرۆشە! ئەم عابا، ژەمێ ناکا
لە کۆڕی مەیفرۆشانی بە جامێکی پڕی نابەن
جبەی دین ئافەرینی بێ! تەنانەت وەرهەمێ ناکا
بە لۆمەی پاسەوانانت چلۆن جێبێڵم ئەو دەرگا
چ قەوماوە لە دەرکی دڵبەرا، سەر شێلەمێ ناکا
جووانی تاجی سوڵتانی کە باسی سەر لەوا مۆرە
کڵاوی فەخرە ئەمما سەر کە چوو ئەو درهەمێ ناکا
غەمی زەریا لە سەر شانی دڵم چوو بۆ شەپۆلی گەنج
هەڵەم بوو، چونکە لەم تۆفانە گەوهەر ماتەمێ ناکا
لە خێڵی عاشقان داپۆشە روخسارت کە دڵخۆشی
جەهانگیری، غەمی قەتڵ و قەلاچۆی عالەمێ ناکا
قەناعەت چاکە «حافز»! منەتی دونیا مەنێ کۆڵت
کە گەنج و موڵکی قاروونی، لە ژێر بارا، خەمێ ناکا
وەکوو «کۆلیل» ئەساچێنم، بە دونیا خۆ لە تۆ ناکەم
لە کوردستانی ئێمە چەرخی گەردون پەرچەمێ ناکا

دمی با غـم به سر بردن جهـان یک سر نمی‌ارزد
به مـی بفـروش دلـق ما کز این بهتـر نمـی‌ارزد
به کوی مـی فـروشانش به جامی بر نمی گیرند
زهی سجـاده‌ی تقـوا که یک سـاغر نمـی‌ارزد
رقیبم سـرزنش‌ها کرد کز این به آب رخ برتاب
چه افتـاد این سـر ما را که خـاک در نمی‌ارزد
شکوه تاج سلطانی که بیم جـان در او درج است
کـلاهی دلـکش است اما به تـرک سر نمی‌ارزد
چه آسـان می‌نمود اول غـم دریا به بوی سـود
غلط کردم که این طوفان به صد گوهر نمی‌ارزد
تو را آن به که روی خود ز مشتـاقان بپـوشـانی
که شـادی جهـان گیـری غـم لشکر نمی‌ارزد
چو حافظ در قناعت کوش و از دنیی دون بگذر
که یک جو منت دو نان دو صد من زر نمی‌ارزد

رۆژی ئەووەڵ کە جەمـاڵت لە گوڵستان دەمی دا
ئـاگـری تـاسـە لەوێـڕا لـە دڵـی عـاڵەمی دا
چونکە عاشق بە جەمـاڵت نەبـو شەیتـانی بەغێـڵ
بوو بە ئاگـر، بە حەسـوودی لە گڵـی ئـادەمی دا
هۆش فەرمـوویەتی لەو شۆڵـە چرایێ بکـە رون
خیـرەتی عەشق درەوشـایەوە، سەر پەرچەمی دا
بێ‌ئەمەگ ویستی کە هەڵداتەوە، پەردەی حەرەمی
دەستـی غەیبـی لە دەم و سەر دڵی نـامەحرەمی دا
قسمەتی خەڵک لە ژین شادی و سەرکەوتی ئەمەل
تیـری ئـاواتی دڵـی ئێمـە لە خـاڵی غەمی دا
دڵ و گیـانم هەوەسی چاڵی چەنەی کەوتە سەری
ترسی چاهی غەمی بوو دەستی لە زولفـی خەمی دا
«حـافز» ئەوڕۆژە ئەوین‌نـامەیی تـۆی دا لـە رەقـەم
کە لە شـایی دڵی خـۆ، رەش قەڵـەمی مـاتەمی دا
منـی «کۆلیـل» شکـاتی غەمـی خۆ ناکـەم بـۆی
هەر ئەڵێـم زۆری خەفـەت بەو دڵـە بێچارەمی دا

در ازل پرتو حسنت ز تجلی دم زد
عشق پیدا شد و آتش به همه عالم زد
جلوه‌ای کرد رخت دید ملک عشق نداشت
عین آتش شد از این غیرت و بر آدم زد
عقل می‌خواست کز آن شعله چراغ افروزد
برق غیرت بدرخشید و جهان برهم زد
مدعی خواست که آید به تماشاگه راز
دست غیب آمد و بر سینه‌ی نامحرم زد
دیگران قرعه‌ی قسمت همه بر عیش زدند
دل غم‌دیده‌ی ما بود که هم بر غم زد
جان علوی هوس چاه زنخدان تو داشت
دست در حلقه‌ی آن زلف خم اندر خم زد
حافظ آن روز طرب‌نامه‌ی عشق تو نوشت
که قلم بر سر اسباب دل خرم زد

که خۆری پەرچەمی هەڵدا، له دوندی کۆهساران دا
به کۆڕی عاشقان دڵبەر ئومێدی چەشنی جاران دا
سەحەر تا تێگەیی خۆر بێ‌وەفایە و خۆ دەشارێتۆ
به پرقەی پێکەنین تانەی له عەهدی کامکاران دا
له کۆڕی دوێنەشەو دڵبەر به قەستی هەڵپەڕین هەستا
گرێی کردۆ له ئەبرۆ، دایە کۆڵی گیانی یاران دا
له تەقوا دەستم ئەو ساتەی به خوێنی جەرگ و دڵ شۆرێ
که چاوی مەستی، میوانی به خێڵی هۆشیاران دا
له کام ئاسن‌دڵێ بەو شێوە فێری دڵڕەقی بوویی
که هەر ئێوارە دەس‌بردت له خێڵی دەردەداران دا
خەیاڵی قیر و قاچی کەوتە سەر بێچارە دڵ، یاڕەب
دەسی لوتفی به سەر بێنا، له جەرگەی شاسواران دا
دڵ و گیانم به گوڵزاری بەهاری روومەتت ئەسپارد
کەچی فەرمانی تالانی هەوەڵ بۆ دڵسپاران دا
به ئەو پەشمینە عابا چۆن له تۆڕی خەم، کەمەنداری
که زولفی داوی داناوە له رێی خەنجەرگوزاران دا
هەموو کامی دڵم، چاوی له دەستی حاتەمی تەی بوو
که «حافز» فاڵتی لێدا له کۆڕی بەختیاران دا
شەهی خاوەن شکۆ (منصور)ی دوو دونیا، دلێر و ژیر
که ئیحسانی بزەی، بەرقی له سەر هەوری بەهاران دا
له رۆژێکۆ که جامی مەی به لەعلی لێوی عاشق بوو
فەلەک هەر ساغەری شایی به کۆڕی مەی‌گوساران دا
درەوشایۆ به تاوی شێری، سەرکەوتن لەوی رۆژۆ
که چاوی پۆڵی ئەستێرەی، به تەنیا شۆڵەباران دا
دەوامی دەوڵەتی له خوا دەکەم داوا، شوکور گەردون
سکەی عەشقی ئەوی کێشا له سەر سینگی هەزاران دا
به ئەو هیوایە «کۆلیل»ی شنەی سروەی بەهاریتم
دڵی کوردم بلاوێنێ له سەحنی رۆژگاران دا

سحر چون خسرو خاور علم بر کوهساران زد
به‌دست مرحمت یارم در امیدواران زد
چو پیش صبح روشن شد که حال مهر گردون چیست
برآمد خنده‌ی خوش بر غرور کامگاران زد
نگارم دوش در مجلس به عزم رقص چون برخاست
گره بگشود از ابرو و بر دل‌های یاران زد
من از رنگ صلاح آن دم به خون دل بشستم دست
که چشم باده‌پیمایش صلا بر هوشیاران زد
کدام آهن‌دلش آموخت این آیین عیاری
کز اول چون برون آمد ره شب‌زنده‌داران زد
خیال شهسواری پخت و شد ناگه دل مسکین
خداوندا نگه‌دارش که بر قلب سواران زد
در آب و رنگ رخسارش چه جان دادیم و خون خوردیم
چو نقشش دست داد اول رقم بر جان‌سپاران زد
منش با خرقه‌ی پشمین کجا اندر کمند آرم
زره مویی که مژگانش ره خنجرگزاران زد
شهنشاه مظفر فر شجاع ملک و دین منصور
که جود بی‌دریغش خنده بر ابر بهاران زد
از آن ساعت که جام می به دست او مشرف شد
زمانه ساغر شادی به یاد میگساران زد
ز شمشیر سرافشانش ظفر آن روز بدرخشید
که چون خورشید انجم‌سوز تنها بر هزاران زد
دوام عمر و ملک او بخواه از لطف حق ای دل
که چرخ این سکه‌ی دولت به دور روزگاران زد
نظر بر قرعه‌ی توفیق و یمن دولت شاه است
بده کام دل حافظ که فال بختیاران زد

کۆکی کە ساز جۆرێ دەم بێ لەگەڵ غەمانا
شیعرێ بڵێ شەرابی شەم بێ لە تۆی دڵانا
گەر سەر لە دەرکی ماڵی دڵبەر لە خاک ماڵی
نێوبانگی سەربڵێندیت دەڕوا بە ئاسمانا
پشتی چەماوی ئێمەت پێ سووک بوو، بەڵام ئەو
خۆش پێکە چاوی دژمن، تیری لە ژێ کەوانا
رازی ئەوین چوزانێ سۆفی لە خانەقادا
ئەم رەمزە وا لە جامی پیری موغانی زانا
دەروێشی بێنەوام و سامانی شام ناوێ
ئێمەین و خەرقەکۆنێ، خۆش سووت و شڕ، لە شانا
دڵدار هەر دو دونیای داناوە هەر بە چاوێ
عاشق دەبێ لەپێشا گیان با، لە رێی گیانا
سامان و کۆشکی وەسڵت دەرکێ مەگەر بکاتۆ
هەر بەو خەیاڵە ئاخر خاکم لە ئاستانا
گەنجی، ئەوین و رەندی، ئاواتی هەر دڵێکە
گەر ئەم سیانە کۆ بن، کۆکی لە کۆی بەیانا
سەد کاروانی لێدا زولفت وەکوو دڵی من
غارەتگەرم کە تۆ بی ناچم لە کاروانا
«حافز» بە عەشقی قورئان مەکر و ریا وەلا نێ!
شایەت خەلاتی شایی دەس با لە دوو جەهانا
ناسازە سازی نەغمە و ژێتاری ئاهی «کۆلیل»
ئەینا چلۆن دەبێ ئەو، نەڕوا بە گژ زەمانا

راهی بزن که آهی بر ساز آن توان زد
شعری بخوان که با او رطل گران توان زد

بر آستان جانان گر سر توان نهادن
گلبانگ سربلندی بر آسمان توان زد

قد خمیده‌ی ما سهلت نماید اما
بر چشم دشمنان تیر از این کمان توان زد

در خانقه نگنجد اسرار عشق‌بازی
جام می مغانه هم با مغان توان زد

درویش را نباشد برگ سرای سلطان
ماییم و کهنه دلقی کآتش در آن توان زد

اهل نظر دو عالم در یک نظر ببازند
عشق است و داو اول بر نقد جان توان زد

گر دولت وصالت خواهد دری گشودن
سرها بدین تخیل بر آستان توان زد

عشق و شباب و رندی مجموعه‌ی مراد است
چون جمع شد معانی گوی بیان توان زد

شد رهزن سلامت زلف تو وین عجب نیست
گر راهزن تو باشی صد کاروان توان زد

حافظ به حق قرآن کز شید و زرق بازآی
باشد که گوی عیشی در این جهان توان زد

ئەگەر هەواڵی ئەپرسم شەرم دوچار دەكات
وەگەر لە حاڵی نەپرسم ژیان بە ژار دەكات
وە یا لە رێگوزەری یەك نەفەس بە رەسمی وەفا
ببم بە خاك، لە خاكی گوزەر فەرار دەكات
بكا تەماح كە لێوم لە نیوە ماچێكی
لە دورجی لێوی هەزاران خوسن خەسار دەكات
من ئەو فریوە دەبینم لە چاوی ئێوە دەڵێم
دەبا حەیا لە مەلا، شێخ شێت و هار دەكات
كە چاڵ و چۆڵی كەویری ئەوین گك داوی بەڵان
لە كوێیە شێردڵێ وا بەلا شكار دەكات
تەمەن درێژ و بەتاقەت مەگەر بزانێ چەرخ
كە سەیرتر لەمە شۆخی لەگەڵ هەژار دەكات
سەری رەزا بخەوێ چاكە بۆ قەزا «حافز»!
شكستی حەتمییە كێ شەڕ بە رۆژگار دەكات
تەفاوەتی منی «كۆلیل»و یار وا لەمەدا
كە من لە باسی ئەوم ئەو قسەی نەیار دەكات

اگـــر روم ز پـــی‌اش فتـــنه‌هـــا بـــرانگیـــزد
ور از طـــلب بنشیـــنم بـــه کیـــنه بـــرخیـــزد
و گر به رهگـــذری یک دم از وفـــاداری
چو گـــرد در پـــی‌اش افتـــم چو بـاد بگریزد
و گر کنم طلب نیـــم بوســـه صد افســـوس
ز حقـــه دهنش چـــون شکر فـــرو ریـــزد
من آن فـــریب که در نرگس تو می‌بیـــنم
بس آب روی کـــه با خـــاک ره برآمیزد
فـــراز و شیـــب بیـــابان عشـــق دام بـــلاست
کجـــاست شیـــردلـــی کـــز بـلا نپـرهیـــزد
تو عمر خواه و صبوری که چـــرخ شعبده‌باز
هـــزار بـــازی از ایـن طرفـــه‌تر برانگیـــزد
بر آستـــانه‌ی تسلیـــم ســـر بنـــه حـافـــظ
کـــه گـــر ستیـــزه کنـی روزگـــار بستیـــزد

به خولّق و بـەژن و وەفـا کەس بە یـاری من نە گەیی
پـــلاری تـــانه بـه لوتفـی وتـــاری مـــن نـه گـــەیی
گەلێ بە رەمـــزی جووانـی خـەریکـــی جیلوە گەرین
کـەســێ بـە رازی کریشمـــەی نیگـــاری من نە گەیی
قەســـەم بـە دۆسیـــی جـــارانمـــان! کەســێ بـە وەفـــا
بـە یـاری یەکـدڵ و حورمەت گوزاری من نە گـــەیی
قەڵەم بە بێ‌حـەدی کێشاوە نەخشـــی دڵـــگر و شۆخ
بـەڵام هیـــچ یەکێـــکی بـە یـــاری مـن نە گـــەیی
لە زێـــڕی خـــالس و بێ‌خەوشـــی زۆرە کـــان، وەلێ
یەکـێ بە زێـــڕ و سکـەی پڕعەیـاری مـن نە گـەیی
هـــەزار حەیـــف! تەمـــەن کـــاروانی وا تـــون چـــوو
کە گـــەردی رێ بـە سنـــووری دیاری من نە گـەیی
مەرەنجە ئەی دڵـی من بێ گومان کە مەکری حەسوود
دەســی بـە خێـــوەتی هیـــوا قـــەراری من نە گـــەیی
وەهـــا بژێ کە ئەگـــەر بوویـە خـــاکی رێ ئەی دڵ!
بڵێـــم بە خـــاتری دڵبـــەر غوبـاری من نە گـــــەیی
بســـووت «حافز» و داخـــم ئـــەوەن حەکـــایەتی ئـەو
بـە یـــاری کـــامرەوا شـــاریاری مـن نـە گـــەیی
خەزانی چەرخـــە خەزێنـــەی خەمـی دڵـــی «کۆلیل»
خـــودا خـــودامە، کە هەرگیـــز بەهـــاری من نە گەیی

به حسن و خلق و وفا کس به یار ما نرسد
تو را در این سخن انکار کار ما نرسد
اگرچه حسن فروشان به جلوه آمده‌اند
کسی به حسن و ملاحت به یار ما نرسد
به حق صحبت دیرین که هیچ محرم راز
به یار یک جهت حق گزار ما نرسد
هزار نقش برآید ز کلک صنع و یکی
به دلپذیری نقش نگار ما نرسد
هزار نقد به بازار کائنات آرند
یکی به سکه‌ی صاحب عیار ما نرسد
دریغ قافله‌ی عمر کآنچنان رفتند
که گردشان به هوای دیار ما نرسد
دلا ز رنج حسودان مرنج و واثق باش
که بد به خاطر امیدوار ما نرسد
چنان بزی که اگر خاک ره شوی کس را
غبار خاطری از رهگذار ما نرسد
بسوخت حافظ و ترسم که شرح قصه‌ی او
به سمع پادشه کامگار ما نرسد

کێ لەگەڵ نۆ خەتی سەوزت سەری سەودای بێ
پێ لە ئەو دایەرە پێوەندە، هەتا پای بێ
شەرتە وەک لالە لە گۆڕێ کە سەرم هانییە دەر
ئەو دەمەش داغی ئەوینت لە دڵم جای بێ
ئاخر ئەی گەوهەری تاقانە لەبەر چی گۆمی لێم
دیدە تا کەی لە غەمت دەوڵەتی زەریای بێ
کانیاوێکە بنی خێڵی موژۆڵم وەکو زێو
خۆش تەماشائییە، کێ مەیلی تەماشای بێ
گوڵی سوورم! لە حیجابا وەدەرێ چەشنی شەراب
کیژی دیدار بە دەگمەن هەلی ئاوای بێ
کەم نەبێ سێبەری زولفت لە سەرم! چونکە دڵی
تاسە بەو سایە مەگەر، گیانی تەسەللای بێ
چاوی نازت نییەتی مەیل بە «حافز» کە دەڵێن
مەست و مەغروورە کەسێ نێرگزی شەهلای بێ
دڵ بە قوربانی دەر و دەشتی سەقز، خاک و هەوای
گیان نیساری کوڕی مەجنون کچی لەیلای بێ

هر که را با خط سبزت سر سودا باشد
پای از این دایره بیرون ننهد تا باشد
من چو از خاک لحد لاله صفت برخیزم
داغ سودای توام سرّ سویدا باشد
تو خود ای گوهر یکدانه کجایی آخر
کز غمت دیده‌ی مردم همه دریا باشد
از بن هر مژه‌ام آب روان است بیا
اگرت میل لب جوی و تماشا باشد
چون گل و می دمی از پرده برون آی و درآ
که دگرباره ملاقات نه پیدا باشد
ظلّ ممدود خم زلف توام بر سر باد
کاندر این سایه قرار دل شیدا باشد
چشمت از ناز به حافظ نکند میل آری
سرگرانی صفت نرگس رعنا باشد

من و نەفرینی شەراب! ئەم وتەش ئینکار نەکەم؟!
ئەونە عەقڵ و خیرەدم نین کە قسەی لار نەکەم؟!
نەمدەزانی چییە مەیخانە هەتا ئێستە دەنا
نە لە چاکیمە بە مەی، خەرقە کە گوڵنار نەکەم
زاهید و نازی نوێژ و من و سەرمەستیِ شەراب
بەو گوناحەم بکوژن، شەرتە کە هاوار نەکەم
چونکە سۆفی سەری رەندی نییە، ریشی بەدڵە
خەڵعەتی یارە ئەوین، کوفرە کە ئیقرار نەکەم
من بە یاری دەف و نەی رێگەیی تەقوام دەبەست
ئێستە سەر بێنمە رێ و گوێ لە قسەی یار نەکەم؟!
پیری مەیخانە لە گێژی وەدەرێنام دە چۆن
سەر بە پۆیلەی مەدەدی پیری ئەویندار نەکەم
شەو نەخەوتم لە غەمی ئەم قسە، دۆسێ کە وتی
«حافز» ئەر مەستە چلۆن مەدحی مەسی شار نەکەم
مەیکەدەی چاوی ئەگەر رێگە بە «کۆلیل» نەدات
چۆن لە مەیخانە بە جامێ غەمی دڵ چار نەکەم

من و انکـــار شـــراب این چه حکایت باشد

غالبـا اینقـــدرم عقـل و کفـــایت بـاشـد

تـا بـه غـــایت ره میخـــانه نمی‌دانستـــم

ور نـه مستـــوری مـا تـا بـه چـه غایت باشد

زاهـد و عجب و نمـاز و من و مستـی و نیـاز

تـا تـو را خـود ز میـان با که عنـایت باشد

زاهــد ار راه به رنـدی نبـرد معــذور است

عشـق کـاری‌ست که موقوف هدایت باشد

من که شب‌ها ره تقوا زده‌ام با دف و چنگ

این زمــان سـر به ره آرم چه حکـایت باشد

بنـده‌ی پیـــر مغـانم که ز جهلـم برهـاند

پیـــر ما هر چه کنــد عیـن عنـــایت باشـد

دوش از این غصه نخفتم که رفیقی می‌گفت

حافــظ ار مست بود جــای شکـــایت باشد

زێـڕی سـۆفـی لـە مسـی زەردی وڵاتـی سـتـەمن
بابـەتی سـووتنـە ئەو خەرقـە لە سـەر شـانی ئەمن
زاهیـدی ئێمـە کە ویردی سەحـەری مەستـی دەکا
لە شـەوی سەیـر کە! چۆن مەستی شـەرابی حەرەمن
بێـتـە پێشـێ مەحەکی تەجـرەبـە وا خۆشـە هەتـا
دەرکەوێ رووی رەشی هەرکەس کە عەیارێکی کەمن
تۆبـە، نەخشێک لە سـەر ئـاوە کە مەیگێـڕ ئەمە بێ
وەی چەنێ چێرە بە عەشقی چەمەنی خوێن لە چەمن؟!
خۆپەرس نابەڵـەدی رێگـەیی دڵـدارە، ئـەرێ!
عاشقـی کـاری جەفـاکێش و جگەرداغی شەمـن
مەی بخـۆ نەک غەمی دونیـا کە دڵـی ژێـر گەڵێ
حەیفـە ئاڵـۆز و پەرێشـان بە پەلامـاری غەمـن
جـامی «حافز» لە دەسـی ساقیـیە گەر بـادە فـرۆش!
نرخـی ئەم لوتفـە مەگـەر خەرقـە و بەرمـاڵەکەمن
رێـڕەوی عەشقـم و «کۆلیـل»ـە دڵـم ماتڵی تۆم
کـوردەواری لە بەڵێـن‌دا کە دەڵێـن زیـن و مەمـن

نقـــد صوفی نه همــه صافی بی‌غش باشد

ای بســا خرقــه که مستــوجب آتش باشـد

صوفــی ما که ز ورد سحــری مست شدی

شامگـاهش نگــران باش که سرخوش باشد

خوش بود گر محک تجـربه آید به میــان

تـا سیــه روی شود هر کــه در او غش باشد

خط ساقی گر از این گونه زند نقش بر آب

ای بســا رخ که به خونــابه منقــش باشـــد

نــاز پــرورد تنعــم نبــرد راه بـه دوسـت

عاشقــی شیــوه‌ی رنــدان بــلاکش باشد

غم دنیــیّ دنــی چنــد خوری بــاده بخور

حیــف باشــد دل دانـــا که مشــوش باشد

دلق و سجــاده‌ی حافــظ ببرد بـاده فروش

گر شــرابش ز کف ســاقی مهـوش باشـــد

سەفـــایە خەڵوەت ئەگـەر لەیل مەیلی بۆ من بێ
نـە مـن بســووتـم و ئـەو بـۆ رەقیب رۆشـن بێ
چلـۆن بە مۆری سلێمـــان سـەری سەوا، شـاکەم
کە جـــار و بـــارە لە دەستـی جنـــۆکەدا ون بێ
رەوا مـەبیـــنە خـودایـــا! لە باخـــی دڵبـــەردا
ئەمـن تـەریك و نەیـــارم خەریکی بـەیڕن بێ
بڵێ کە سێـــبەری بـاڵی هومـــا نەخـــا هەرگیـز!
لە ئـــەو دیـــارە، پـەری ژێردەسـی رمـووزن بـێ
بەیـــانی عەشـــق چ لازم پزوسکـــی ئاگـــریٚ دڵ
عەیـــانە خۆ لە وتـــارم کە چـــاوی دیتـــن بێ
قەتـم ئەوینـــی دیـــارت لە ســـەر بە دەر نـــاچێ
غەریبـــم و بە وەتـــەن دڵ قـــەرارە هێمـــن بێ
لە گوێنی سۆسەن ئەگەر چەن زمان بە«حافز» بێ
بە ســـانی خونچـــە لە حاست دەمی گرێچن بێ!
گوزەر بە چەشنی سەبـاشی نەبوو بە «کۆلیـل»ـی
بە ئەمری چەرخە کە دۆست لەگەڵ بە دژمـن بێ

خوش است خلوت اگر یار یـار من باشد
نه مـن بسـوزم و او شمـع انجمـن باشـد
من آن نگیـن سلیمـان به هیـچ نستـانم
کـه گاهـگاه بـر او دست اهـرمن بـاشد
روا مـدار خـدایا که در حریـم وصال
رقیـب محـرم و حرمـان نصیب من باشـد
همـای گو مفکـن سـایه‌ی شـرف هرگز
در آن دیـار که طوطی کم از زغن باشد
بیـان شوق چه حاجت که سـوز آتش دل
توان شناخت ز سـوزی که در سخن باشد
هـوای کـوی تو از سـر نمـی‌رود آری
غـریب را دل سرگشتـه با وطـن باشـد
به سـان سوسن اگر ده زبـان شود حافـظ
چو غنچـه پیش تواش مُهـر بر دهن باشد

چۆن شیعری تەڕی بۆ بێ، زەوقێ کە حەزین ماوە
وتمان لە غەم خاڵێ، دەشتێکی بەرین ماوە

لەو لێوە وەکوو لەعلەی گەر مۆری ئەمانم بێ
ئینسان و پەریزادم وەک با لە نگین ماوە

غەمگین مەبە ئەی دڵ! بۆ تانە و تەشەریّ ناکەس
گاهەس کە سەلاحی ژین بەو قینە مەتین ماوە

نەخشم بە حەرامی بێ! سوورەتگەری چین کاتێ
دەرکی قەڵەمێ ناکا، وەک سیحری موبین ماوە

من خوێنی دڵم بەرکەوت، ئەو جامی شەرابی سوور
قسمەت ئەمەیە و هەروان، تا تۆپی زەمین ماوە

دەستووری هەوەڵ وابوو پەوکێ لە گوڵاو و گوڵ
ئەم دڵبەری بازاڕی، ئەو خەڵوەنشین ماوە

ئامانە نەڵێن «حافز» رەندی لە سەری لاچوو
ئەم سەروەتە مێژینەی تا رۆژی پەسین ماوە

دەم تاڵە «عومەر» چەشنی فەرهاد هەتا رۆژێ
خوسرەو لە قەنی شیرین مێشی لە کەمین ماوە

کی شعـر تر انگیزد خاطر که حـزین باشد
یک نکته از این معنی گفتـیم و همین باشد
از لعـل تـو گـر یابـم انگشتـری زنهـار
صـد ملک سلیمـانم در زیر نگیـن باشد
غمنـاک نبـاید بود از طعن حسـود ای دل
شـاید که چو وابیـنی خیر تو در این باشد
هر کو نکنـد فهمی زین کلک خیـال‌انگیز
نقشش به حـرام ار خود صورتگر چین باشد
جـام می و خون دل هر یک به کسی دادند
در دایـره‌ی قسمـت اوضـاع چنـین باشد
در کـار گلاب و گـل حکـم ازلی این بود
کـاین شاهد بـازاری وان پرده‌نشیـن باشد
آن نیست که حافـظ را رندی بشـد از خاطر
کـاین سابقه‌ی پیشـین تا روز پسیـن باشد

بە خێری گوڵ کە خۆشتر کاتی وا نین
وەلێ بێ جامی ساقی خۆش‌سەفا نین

بزانی ڕێزی شادی! تا بزانی
لە سینگی هەر سەدەف گەوهەر چرا نین

شەرابی ناب و لەنجەی ساقی ئەوڕۆن
مەگەر یەک حەفتە گوڵ خاوەن کەوا نین

کە ئەوڕۆ جامی زێڕین پڕ لە لەعلی
مەفەرموو بێ‌زەڕ و لەعل و نەوا نین

دەسا یا شێخ پڕ لەو کووپە جامێ
لە سەر نێ! لەززەتی کەوسەر، کەوا نین

ئەگەر هاودەرسی ئێمەی خەت مەنووسە
کە مەشقی عەشقی نێو دەفتەر، ڕەوا نین

دڵت بۆ دڵبەرێ دانێ! کە حوسنی
لە بازنەی زێڕ و تیف‌تیفەو دەوا نین

لە بادەی عەشقی پاکم پێبە یارەب!
کە ئاوێتەی خەوی مەستی و بەلا نین

بە گیان و دڵ غولامی کۆی ئەوینم
ئەگەرچی یادی ئێمەی ئەو لە لا نین

بە تاجی عالەم‌ئاراکەی! کە خۆریش
شیاوی ئەفسەرێ، وەک تاجی شا نین

لە نەزمی «حافز»ت ڕەخنەی کەسێ گرت
بە بەحری گەوهەری شیعر ئاشنا نین

لە «کۆلیل»ێ نەپرسی با نەڵێن پێت
کەسێ هاوشانی شێتێکی وەها نین

خوش آمد گل و زآن خوش‌تر نباشد
که در دستت بجز ساغر نباشد
زمان خوشدلی دریاب و دُر یاب
که دایم در صدف گوهر نباشد
غنیمت دان و می خور در گلستان
که گل تا هفته‌ی دیگر نباشد
ایا پر لعل کرده جام زرین
ببخشا بر کسی کش زر نباشد
بیا ای شیخ و از خمخانه‌ی ما
شرابی خور که در کوثر نباشد
بشوی اوراق اگر همدرس مایی
که علم عشق در دفتر نباشد
ز من بنیوش و دل در شاهدی بند
که حسنش بسته‌ی زیور نباشد
شرابی بی‌خمارم بخش یا رب
که با وی هیچ دردسر نباشد
من از جان بنده‌ی سلطان اویسم
اگرچه یادش از چاکر نباشد
به تاج عالم آرایش که خورشید
چنین زیبنده‌ی افسر نباشد
کسی گیرد خطا بر نظم حافظ
که هیچش لطف در گوهر نباشد

بێ تۆ گوڵ و لالەزار خۆش نین
بێ ساقی و مەی بەهار خۆش نین
گۆشەی چەمەن و گوزەر لە گولزار
بێ کولم و دییەی خومار خۆش نین
گۆڤەند و زەماوەندی گوڵ و گیا
بێ دەنگی خۆشی هەزار خۆش نین
شەککەر دەمی نازەنین لەگەڵ بێ
بێ باخی بەی و هەنار خۆش نین
هەر وێنە بە دەستی عەقڵە رەسمی
وەك نەخشی روخی نیگار خۆش نین
کەم قیمەتە گیانی قەلبی «حافز»
ئەو مەفرەقە بۆ نیسار خۆش نین
«کۆلیل»م و کۆڵەواری دووری
دڵ بێ دییەنی دیار خۆش نین

گـــل بـــی رخ یـــار خوش نباشـــد
بـــی بـــاده بهـــار خوش نباشـــد
طـــرف چمـــن و طـــواف بستـــان
بـــی لالـــه عـــذار خوش نباشـــد
رقصیـــدن ســـرو و حـــالت گـــل
بـــی صـــوت هـــزار خوش نباشـــد
بـــا یـــار شکـــرلب گـــل‌انـــدام
بـــی بـــوس و کنـــار خوش نباشـــد
هـــر نقـــش که دست عقـــل بنـــدد
جـــز نقـــش نگـــار خوش نباشـــد
جـــان نقـــد محقـــر است حافـــظ
از بهـــر نثـــار خوش نباشـــد

سروە ئۆخەی بە نەسیمی قژی دڵدارەوە دێ
عالەمی کۆنە، تەڕ و تازە بە گوڵزارەوە دێ
ئەرخەوان ساغرە یاقوتییەکەی دا بە سەمەن
گوڵە خەشخاشە و نێرگز بە جوقەی لارەوە دێ
دەس‌درێژی غەمی هیجران لە سەری چوو بولبول
وا بەرەو خێوەتی گوڵ، زار، بە (هەی نار)ەوە دێ
گەر لە مزگەوتەوە بۆ مەیکەدە چوم، چونکە دەچوو
کاتم و واعیزەکەش باسی لە پێرارەوە دێ
ئەی‌دڵ ئەر جێژنی ئەمێستا بە سبەینێ بکەوێ
زامنی مانەوە کێن؟ کامە بە هاوارەوە دێ؟!
مانگی شابان هەڵی نۆشینە، کە وا تاوی شەراب
دادەچێ تا رەمەزان جێژنی لە پێوارەوە دێ!
سوحبەتی فرسەتە گوڵ تا لە دەر و دەشتە عەزیز!
بکە بۆنێکی دەنا باد بە خومپارەوە دێ
موتریبا کۆڕەکەمان دۆسی و ئەشعار و نەوان
کەم بڵێ چی چووە سوح، چی کە بە ئێوارەوە دێ
کەوتە رێ «حافز» ئەوا چوو ، قەدەمێ هەڵنە وەلای!
زوو وتی خۆی بە جەهان، تاقە بە هۆی یارەوە دێ
مەرگی «کۆلیل» بە سێدارە، ئەگەر مەیلی ئەتۆن
لە حەزی مەرگی وەها، رەقسی بە سەر دارەوە دێ

نفس باد صبا مشک فشان خواهد شد
عالم پیر دگرباره جوان خواهد شد
ارغوان جام عقیقی به سمن خواهد داد
چشم نرگس به شقایق نگران خواهد شد
این تطاول که کشید از غم هجران بلبل
تا سراپرده‌ی گل نعره‌زنان خواهد شد
گر ز مسجد به خرابات شدم خرده مگیر
مجلس وعظ دراز است و زمان خواهد شد
ای دل ار عشرت امروز به فردا فکنی
مایه‌ی نقد بقا را که ضمان خواهد شد
ماه شعبان منه از دست قدح کاین خورشید
از نظر تا شب عید رمضان خواهد شد
گل عزیز است غنیمت شمریدش صحبت
که به باغ آمد از این راه و از آن خواهد شد
مطربا مجلس انس است غزل خوان و سرود
چند گویی که چنین رفت و چنان خواهد شد
حافظ از بهر تو آمد سوی اقلیم وجود
قدمی نه به وداعش که روان خواهد شد

ئەوینی نێرگزی چاوی جووانانم لە سەر ناچێ
دەسووری ئاسمان وابوو، لە سەر ئەم عەشقە دەرناچێ

حەریف ئازاری زۆری کردم و ڕێی سوڵحی لێ بەستم
شوکور ناڵەی سەحەرخێزم بەرەو گەردون هەدەرناچێ

بە من ڕۆژی ئەزەڵ، ڕەندی نەبێ هیچی نەبەخشی پێم
ئەوەی ئەو ڕۆژە دابەش بوو لە خەرمانی قەدەر، ناچێ

لە ئاوازی دەف و نەی پاسەوان! تۆخوا نەکەی لۆمەم
کە دەنگی ساز و قانوونی شەرع بەو لۆمە سەر ناچێ

مەجاڵی من ئەوەن بوو هەر نهێنی عاشقی تۆ بم
کنار و ماچ و ئامێزت، بە نێو جەغز و چەمەر ناچێ

شەرابی ناب و خەڵوەت، دڵبەر و ساقی جەمن پێکۆ
ئەگەر نەفعێ نەبەی ئەوڕۆ، هەتا مردن زەرەر ناچێ

برینی سینەیی «حافز» بە ئەسرینت مەشۆ ئەی چاو
کە خوێنی تیری دڵداری، بە ئەشکی بێ‌هونەر ناچێ

دڵم تەنیا بە بەختی ڕەش لە بەر دیدەی ڕەشی خۆشە
ئەگەرچی چاوی قەترانی لە شەوگاری «عومەر» ناچێ

مرا مهر سیه چشمان ز سر بیرون نخواهد شد
قضای آسمان است این و دیگرگون نخواهد شد
رقیب آزارها فرمود و جای آشتی نگذاشت
مگر آه سحرخیزان سوی گردون نخواهد شد
مرا روز ازل کاری بجز رندی نفرمودند
هر آن قسمت که آنجا رفت از آن افزون نخواهد شد
خدا را محتسب ما را به فریاد دف و نی بخش
که ساز شرع از این افسانه بی‌قانون نخواهد شد
مجال من همین باشد که پنهان عشق او ورزم
کنار و بوس و آغوشش چه گویم چون نخواهد شد
شراب لعل و جای امن و یار مهربان ساقی
دلا کی به شود کارت اگر اکنون نخواهد شد
مشوی ای دیده نقش غم ز لوح سینه‌ی حافظ
که زخم تیغ دلدار است و رنگ خون نخواهد شد

رۆژی هیجـران و شەوی غەم لە شکۆی یـار هەڵات
فـالّی بەختـم لە گـەڵ ئەستێـرەیی دڵـدار هەڵات
ئەو هەموو فیـزە خەزان کردی بە زریـان و هـەوای
بـە شەمـالّێکی بەهـاری گەڵـی زۆردار هەڵات
خوایە شوکرت بە دنەی پێچ و شەدەی لارێ گوڵوک
نەگبـەتی تۆف و پلـوورەی یەخـی پاسـار هەڵات
رۆژی هیـوا کە لە مـزگەوتـی حەرەم دەم بە دوعـان
پێـی بڵێ روومـەتی دەرخـا، شـەوی شۆفار هەڵات
ئـەو پەرێشـانی و شـەوگارە درێـژەی غـەمـی دڵ
مەدەدی پەرچەمـی گوڵ هـات و هەموو زار، هەڵات
نیمـە ئێستـەش لە خـراوی فەلـەک، ئـەم بـڕوایە
کە پـەژارەی دڵ و تـرس و غـەمـی دیـدار هەڵات
کەرەمی ساقیـیە، یـاڕەب قەدەحـی پڕ لە شـەراب!
کـە مەترسـی لە خومـاری سـەری لاسـار هەڵات
کەس دڵی «حافـز»ی هەرچـەن لە دڵا رێگـە نـەدا
شوکری خوا لەشکری غـەم بێ‌حـەد و ئەژمار هەڵات
مـن و سـاقی لە چەمـەن بولبول و گوڵ دەس لە ملیـن
زەوقی «کۆلیـل» وەکوو خـۆری بـزەی یـار هەڵات

روز هجــران و شب فـرقت یــار آخـر شـد
زدم این فـال و گذشت اختر و کار آخر شد
آن همه نــاز و تنعـم که خـزان می‌فرمــود
عـــاقبت در قـــدم باد بهـــار آخـــر شد
شکـــر ایزد که به اقبـــال کلـــه گوشه‌ی گل
نخــوت بـــاد دی و شوکت خار آخـر شد
صبــح امیــد که بـد معتکـف پرده‌ی غیـب
گو بـرون آی کـه کار شب تــار آخــر شد
آن پریشـــانی شب‌هـــای دراز و غـــم دل
همـه در ســایه‌ی گیسوی نگـار آخــر شد
بـــاورم نیست ز بدعهـــدی ایـــام هنـــوز
قصـــه‌ی غصـــه که در دولت یـــار آخر شد
ساقیـا لطف نمـودی قدحت پر مـــی بـــاد
که به تدبیـــر تو تشویش خمـــار آخـر شد
در شمـــار ار چـه نیـاورد کسـی حافـظ را
شکـر کـــان محنت بی‌حد و شمار آخر شد

هەسارەیێ گوڵی کێشا، بە مانگسی مەجلیس بوو
که بۆ دەروونی رەمۆکم بە یار و مۆنس بوو
لە مەکتەبێ قەڵەمی یار مەشقی خەتتی نەکرد
بە عیلمی عیشوە سەر ئوستادی هەر مودەڕڕس بوو
بە سانی سروە دڵی عاشقی نەخۆش فیدای
نەسیمیroومەتی نەسرین و چاوی نەرگس بوو
لە ژووری تەختمی داناوە دڵبەرم بڕوا
هەژاری شاری ئەمیرم بە میری مەجلس بوو
حەزی لە ئاوی ژیان و شەرابی خوسرەو بوو
کەسێ کە جورعە خۆری دەستی بولفەوارس بوو
ئەمێستە ماڵی زەماوەندی سینگم ئاوایە
کە تاقی جووتە برۆکانتم موهەندس بوو
لە لێوی لێو بە خاتر خودا وەشۆرە شەراب
کە خاترم بە خەیاڵاتی ناڕەوا سس بوو
کریشمەکەت چ شەرابێکی دا بە گەل هەیڕۆ
نەما کە هۆش بە زانین و فام بێ‌حیس بوو
غەزەڵ بە چەشنی دوڕم پڕبەهایە چون لوتفی
پەسەندی ئێوەیە کڕیاری، وەرنە هەر مس بوو
لە چوونی مەیکەدە یاران دەخیلە دووری کەن
چون ئەم تەریقیە «حافز» بڕین و موفلس بوو
شەرابی چاوی گەڕانۆ گوڵی کریشمەگران
وتی حەرامە مەلا! مەی، «عومەر» ئەدی وس بوو

ستـــاره‌ای بدرخشیـــد و مـــاه مجلس شد
دل رمیـــده‌ی مـــا را رفیـــق و مـــونس شـــد
نگـار من که به مکتب نرفت و خـط ننوشت
به غمـــزه مسئلـه‌آمـوز صـد مـدرس شد
به بـوی او دل بیمـار عاشقـــان چـو صبـــا
فـــدای عـارض نسرین و چشم نرگس شد
به صـــدر مصطبه‌ام می‌نشـــاند اکنون دوست
گـــدای شهـر نگـــه کن که میـر مجلس شد
خیـــال آب خضـــر بست و جـــام اسکنـدر
به جـــرعه نوشـــی سلطـــان ابوالفوارس شد
طرب‌ســـرای محبـت کنـــون شود معمـور
که طـــاق ابـــروی یـــار منـــش مهندس شد
لب از ترشـــح می پـــاک کن بـرای خـــدا
که خاطـــرم به هـــزاران گنـه موسـوس شد
کرشمـــه‌ی تو شـــرابی به عاشقـــان پیمـود
که علـــم بی‌خبـــر افتاد و عقـل بی‌حس شد
چو زر عزیـــز وجـــود است نظـــم من آری
قبـــول دولتـــیان کیمیـــای ایـن مس شد
ز راه میکـــده یـــاران عنـــان بگردانیـــد
چرا که حافـظ از ایـن راه رفت و مفلس شد

تـوواوە گیـان کە بگا دڵ، بە کۆی مەرامی و هیچ
بە ئەم هەوایەوە سـووتـا خەیـاڵی خـامی و هیچ
وتی بە فێـــڵ، شـەوێ دەبمە میری مەجلیسی تۆ
لە شەوقی وادەکەیا بوومـە یەک غـولامی و هیچ
بە خڵتـەنۆش و قەڵـەندەر زڕاوە نێـوم چـون
پەیـامی دابـو قەڵـەندەر دەگـا بە کـامی و هیچ
ڕەوایـە باڵـــەتەپێ کـــردنی مـــەلی ئەمـــەلم
کە خـاڵی دانە دەبیـنێ لە جەغزی دامی و هیچ
بە ئەو هـەوایە بە مەستـی لە لێـوی مــاچ بدا
دەمێکە خوێن لە دڵم من، بەچەشنی جامی و هیچ
لە کۆی ئەوین مەنە قەت بێ‌دەلیلی ڕێ قەدەمێ!
کە من گەلێ غەمی ئەو چۆڵەڕێ، کوتامی و هیچ
چەنێ گەڕام خودایـا! لە ڕەمزی گەنجی ئەوین
بە غـەم لە خۆ بەدەراتـم لە هەر نەفـامی و هیچ
درێـغ و حەیف! بە ئـاواتی دەوڵەتی دیـەنی
قـەدێ نەمـا نەچـەمێـتۆ بە ئیحتـرامی و هیچ
هـەزار جـۆرە بە «حافـز» دەمی تەویـر و ڕجـان
بـە ئـەو ئومێـدە ببـێ ئـەو دەلالـە رامـی و هیچ
وەنەوشە بۆ چییە مل کەچ لە لێوی جۆ، «کۆلیـل»!
شکـایەتـی بەڕەزا دێ بکـا لـە مـامـی و هیچ

گداخت جان که شود کار دل تمام و نشد
بسوختیم در این آرزوی خام و نشد
به لابه گفت شبی میر مجلس تو شوم
شدم به رغبت خویشش کمین غلام و نشد
پیام داد که خواهم نشست با رندان
بشد به رندی و دردی کشیم نام و نشد
رواست در بر اگر می‌طپد کبوتر دل
که دید در ره خود تاب و پیچ دام و نشد
بدان هوس که به مستی ببوسم آن لب لعل
چه خون که در دلم افتاد همچو جام و نشد
به کوی عشق منه بی‌دلیل راه قدم
که من به خویش نمودم صد اهتمام و نشد
فغان که در طلب گنج نامه‌ی مقصود
شدم خراب جهانی ز غم تمام و نشد
دریغ و درد که در جستجوی گنج حضور
بسی شدم به گدایی بر کرام و نشد
هزار حیله برانگیخت حافظ از سر فکر
در آن هوس که شود آن نگار رام و نشد

گەل دەسـی چـاکەی بڕاوە، خێـڵی یـارانم لە کوێن
خۆشەویستی کەی بەسەرچوو عەشقی جارانم لە کوێن
ئاوی ژیـن لیخن، ئەرێ خـزری موبارەک پـێ لە کوێی
شاخی گوڵ خوێن قەی دەکـاتۆ بـای بەهارانم لە کوێن
هیچ کـەس نالـێ کە حەققـی وا لەسـەر ئـانم گوڵێ
کـوا ئەمـەگ‌دارانـی پێـزانم، بەرارانـم لە کوێن
گەوهـەرێ چەن سـاڵە دەرنـایێ لە کـانی حـاتەمێ
ڕۆژی ڕون، سـروەی بەیـان، ڕێژانـی بـارانم لە کوێن
شـاری یـاران و وڵاتـی عاشقـان بـوو زێـدەکەم
عـاشقی کەنگـێ وەلا چـوو شـاریـارانم لە کوێن
گـۆی جوامێـرێ لە بەینـا، هەڵسـوکەوتێـکی نەمـا
کەس بە مەیـدان نایـە ئاخـۆ شـاسووارانـم لە کوێن
سـەد هەزاران خونچـە پشکووت و مەلێ ئۆفـی نەکرد
چێ لە بولبـول بێـژی قەومـابێ، دڵارانـم لە کوێن
عوودی زوهـرەش دەنگـی نـایە، هەستی ساقی ساز نین
مەستی بـادەی خەستـی دەستـی چاو خومارانم لە کوێن
کەس لە رازی حـەق نەبـوو زانـا دە «حافـز» بەس بڵـێ
کـێ دەزانـێ دەوری پێشـوی ڕۆژگـارانم لە کوێن
مەیکە با «کۆلیـل»ـی ئەم شـارەش لە بەر خۆیـۆ بڵـێ
لاوی کـوردی دەسفـرۆش‌و وێڵـی شارانم لە کوێن

یـــاری انـدر کس نمی‌بینـــیم یـــاران را چه شـــد
دوستـــی کـی آخـر آمـد دوستـــداران را چه شد
آب حیـوان تیره‌گون شد خضـر فـرخ‌پی کجاست
خون چکیـــد از شـــاخ گـل باد بهـــاران را چه شد
کس نمی‌گویـــد که یـــاری داشت حـــق دوستـــی
حق‌شنـــاســـان را چه حـال افتـــاد یاران را چه شد
لعلــی از کـــان مـروت برنیـــامـد ســـال‌هـــاست
تابـش خورشیـــد و سعـــی بـاد و باران را چه شد
شهـــر یـــاران بود و خـــاک مهربـــانان این دیـــار
مهـــربانی کی ســـر آمد شهـریـــاران را چه شد
گـــوی توفیـــق و کـــرامت در میـــان افکنـــده‌اند
کس به میـــدان در نمـــی‌آید ســـواران را چه شد
صدهـــزاران گل شکفت و بانگ مرغـی برنخاست
عندلیبـــان را چه پیـش آمـد هـــزاران را چه شد
زهره سازی خوش نمی‌سازد مگر عودش بسوخت
کس نـــدارد ذوق مستـــی میگســـاران را چه شد
حافـظ اســرار الهـــی کس نمی‌دانـــد خمـــوش
از کـه می‌پرســـی کـه دور روزگـــاران را چه شد

ئەوشـــەوە سۆفی بەجێی خەڵــوە لە مەیخــانە بوو
وەك منــی پەیمــان‌شکێــن عاشقی پەیمــانە بوو
دوێکـە رژانـی بەهـۆی جەهلـەوە زاهیـد شەراب
یەك قومــی ئەورۆ لە مــەی نۆشی و فـەرزانە بوو
خۆش بە خەوی هاتبــوو دلّبــەری دەورانی پێــش
ریش سپی، سـەر لە نـۆ، عــاشـق و دێــوانە بوو
تـوولـە نـمـامێــکی دی رێـگــری دیـن و دەرون
وێــڵ لە دووی ئاشنـــا و خێـــڵ، بـە بێگـــانە بوو
ئاگری سەر کوڵمی گوڵ بەربووە بولّبوڵ وەکوو
روومــەتی رەخشــانی شـــەم ئافــەتی پەروانە بوو
زایە نەبـوو خـــوا شوکـور، شیـوەنی رۆژ و شەوم
بـەرهــەمی بـارانی چاو گەوهـــەری تـاقـانە بوو
خوێنـدی کە ساقی بە چاو، ئایەتی سیحر و فسوون
کــۆڕی تەلیــلە و دوعـای، ئێمـــە بە ئەفســانە بوو
«حـافـز» ئەمێـستا لە نێـو کۆشـکی شکۆی دلّبـەرە
دڵ پــەڕ و بـــاڵی نەمــا، گیـــانی بە گیــانـانە بوو
دەوڵـەتە چـاوی تەڕی ئەو کەسە «کۆلیــل»ـی تۆن
بـارە لەسەر شـانـی لەش، ئـەو دڵـە تــۆی لا نەبوو

زاهـــد خلوت‌نشیـــن دوش به میخـــانه شـــد
از ســر پیمـــان بـــرفت بـا ســـر پیمـــانه شـــد
صوفی مجلس که دی جام و قدح می‌شکست
بـــاز به یک جـــرعه مـی عاقـل و فـــرزانه شد
شاهـــد عهـــد شبـاب آمـــده بـودش به خـواب
بـــاز به پیـــرانه ســـر عاشـــق و دیـــوانه شـــد
مغـــبچه‌ای می‌گذشـــت راهـــزن دیـــن و دل
در پـــی آن آشنـــا از همـــه بیگـــانه شـــد
آتـش رخســـار گـــل خـــرمن بلبـــل بسوخت
چهـــره‌ی خنـــدان شمـــع آفت پروانـــه شد
گریـــه‌ی شـــام و سحـــر شکر که ضایع نگشت
قطـــره‌ی بـــاران مـــا گـــوهر یکـــدانه شد
نرگس ســـاقی بخـــواند آیـــت افســـونگری
حلقـــه‌ی اوراد مـــا مجلـــس افســـانه شـــد
منـــزل حافظ کنـــون بارگـــه پـــادشـــاست
دل بر دلـــدار رفـــت جـــان بر جانـــانه شد

دوێشــەو وەزیـری زانـا پەیکی بەشــارەتی هـات
ئەورۆ کە شـا بە شـایی، ئەبـرۆی ئیشــارەتی هــات
جەستەم بە ئاوی سووری، چاوم بە خشت و گڵ کەن
وێرانــە ماڵــی گیــانم کــاتی عەمــارەتی هــات
ئەو گفتمــانە بوویــان، یــاران لە جــەوڕی زولفــی
یەک نوکتە بوو لە شــەرحی مەتنی شەرارەتی هات
رووسـووری بـادە عـابـا! داپۆشـــە عەیبــم ئامـــان
بێعەیب یــارەکەم چــون عەزمــی زیــارەتی هات
ئەورۆ پلــەی جەمــاڵــی هەر دڵبــەرێ دەبـێ رون
چـون مانگـی مەجلیس‌ئــارا، نۆبەی سەدارەتی هات
مێــرووولەیێ بچــووکی، هیممــەت گەیـانده تەختی
یــارێ، فەلەک لە بەختــی بەرزی حەقــارەتی هات
ئەی دڵ بە تیــری چــاوی ئیمــان و دیـن دەپێـکێ
هۆشت ببــێ کـــەوانی، جــادوو بە غـــارەتی هات
تــاوان زۆرە «حافــز»! بەخشیــن لە شــا تەڵەب کـە
جوامێــرە بۆ کەســانێ وەک تــۆ جەسارەتی هـات
کاتی بەهـــاری دڵ هــات، ئاڵای رۆژ سـەرکەوت
فەرهــادی تەبعی «کۆلیــل» شیــرین عیبارەتی هات

دوش از جنـاب آصف پیـک بشارت آمد

کز حضـرت سلیمـان عشـرت اشـارت آمد

خـاک وجود ما را از آب دیـده گـل کـن

ویـران‌سـرای دل را گـاه عمـارت آمد

این شـرح بی‌نهـایت کز زلف یار گفتـند

حرفـی‌ست از هـزاران کـاندر عبارت آمد

عیبـم بپـوش زنهـار ای خرقه‌ی مـی‌آلود

کـان پـاک پاکـدامن بهـر زیـارت آمد

امـروز جـای هر کس پیـدا شود ز خوبان

کـان مـاه مجلس‌افـروز اندر صدارت آمد

بر تخت جم که تاجش معراج آسمان است

همت نگـر که مـوری با آن حقـارت آمد

از چشم شوخش ای دل ایمان خود نگـه‌دار

کـان جادوی کمانـکش بر عزم غـارت آمد

آلـوده‌ای تو حافـظ فیضی ز شـاه درخـواه

کـان عنصـر سمـاحت بهـر طهـارت آمد

دریاست مجلس او دریاب وقت و دُر یـاب

هـان ای زیان رسیـده وقت تجـارت آمد

عەشقت سەرومالّی هەلّوەدایی
وەسلّت خەوی کالّی هەلّوەدایی
زۆرێ بە خەیالّی وەسلّی غەرقن
چی دەچنەوە، حالّی هەلّوەدایی
بنوێنە دلّی! کە نەیکوتابێ
سەرکولّمی بە خالّی هەلّوەدایی
نەمبوو خەبەرێ لە خۆم و وەسلّم
جەم بوو کە خەیالّی هەلّوەدایی
گوێمان کە بە هەر تەرەف دەبوو باز
ئاواز و هەوالّی هەلّوەدایی
شکیا بە جەلالی سەربلّیندی
کێ گەییە کەمالّی هەلّوەدایی
گیان و لەشی «حافز»ت لە عەشقا
وەک تازە نەهالّی هەلّوەدایی
سەر تا قەدەمی وجوودی «کۆلیل»
زامار و شەلّالّی هەلّوەدایی

عشــق تـو نهـــال حیـــرت آمــد
وصــل تو کمـــال حیـــرت آمــد
بس غرقـــه‌ی حـــال وصــل کاخــر
هــم بر سر حـــال حیـــرت آمــد
یـــک دل بنمـــا کـــه در ره او
بر چهـــره نه خـــال حیـــرت آمــد
نه وصـــل بمـــاند و نـــه واصــل
آنجــا که خیـــال حیـــرت آمــد
از هــر طرفـــی که گـــوش کـــردم
آواز ســــؤال حیــــرت آمــد
شــــد منهـــزم از کمـــال عـــزت
آن را کــه جــلال حیـــرت آمــد
ســـر تا قـــدم وجـــود حافـــظ
در عشــق نهـــال حیـــرت آمــد

خەمی ئەبرۆی لە رکاتی هەوەڵا کەوتەوە بیر
چوومە حاڵێ کە هەژاندم دڵی مێحراوی هەژیر
لە من ئیتر تەڵەبی سەبری دڵ و هۆش مەکەن
گشتی رامالێیە تۆفانی سەری مەستی کەویر
رۆژی هەڵهاتووە بادە و لە چەمەن مەستە هەزار
سەردەمی عاشقییەو بەرهەمی جەولانی تەویر
بۆی ئەوین‌داری ئەبیسم لە خولی تۆپی زەمین
کە سەبا هاتەوە شاد و گوڵی شادی بووە میر
لە دەس ئیقبال شکایەت مەکە ئەی بووکی ئەدەب
پەردەئارا بە! کە زاوای هونەر بوو بە دەبیر
دڵڕفێنانی گوڵ و گیا بە گوپی ئاڵەوە هات
دڵبەری من بە جەمالی ئەزەلی زولفی عەبیر
دارەبەر پشتی لە ژێر باری گرانا بووە خەم
سەوڵ ئازادە لە غەم، خۆزگە بە ئازادە و ژیر!
تێ‌چریکێنە لە «حافز» غەزەلێ خۆش چاوەش!
تا بڵێم کاتی جووانی هەوەڵم هاتەوە بیر
وەک سەرم، گوڵ بە دەمی باوە دەرەقسێ «کۆلیل»!
ئەمە یانی نییە گوێ‌ڕایەڵی تۆ، بولبولی پیر

در نمـــازم خـــم ابـروی تو بـا یـــاد آمد
حـالتی رفت که محـــراب به فریـــاد آمد

از من اکنـون طمـع صبر و دل و هوش مدار
کآن تحمـــل که تو دیـدی همه بر بـاد آمد

بـاده صـافی شد و مرغـان چمن مست شدند
موســـم عاشـــقی و کـــار بـه بنیـــاد آمد

بوی بهبـــود ز اوضـــاع جهـــان می‌شنـــوم
شـــادی آورد گل و بـــاد صبا شـــاد آمد

ای عـــروس هنـــر از بخت شکـــایت منـــما
حجلـــه‌ی حسن بیـــارای کـه دامـــاد آمـد

دلفـــریبـــان نبـــاتی همـــه زیـور بستـــند
دلبـــر مـــاست که بـا حسـن خـــداداد آمد

زیـر بارنـــد درختـــان کـه تعلـــق دارند
ای خوشـــا ســـرو که از بـار غـــم آزاد آمد

مطـــرب از گفته‌ی حافظ غزلی نغز بخوان
تـــا بگویم که ز عهـــد طربـــم یـــاد آمد

مۆژدە ئەی دڵ! نەفەسی پاکی سەبا هاتەوە باز
مەلی خۆش‌خوێن و خەبەر، وا لە سەبا هاتەوە باز
دەنگە داوودییەکەت گوڵ بدە! بولبول لە سەحەر
کە سولەیمانە گوڵ و گۆڤەنە، شا هاتەوە باز
عارفێ نین بە زمانی گوڵی سۆسەنێ بدوێ
تا بڵێ چۆنە کە چوو، بۆ بە ڕەزا هاتەوە باز
کەرەم و لوتفی خوداوەند لەگەڵمانە کە ئەو
مانگی دوو حەوتە لەگەڵ عەهد و وەفا هاتەوە باز
لالە بۆی خۆشی لە مەی بیستبو، زوو سەر لە بەیان
بە دڵێ داغەوە بۆ لوتفی دەوا هاتەوە باز
چاوەڕێی قافڵە هەر ماوە هەتا ئەو دەمە دڵ
وتی ئۆخەی کە جەرەس دەم بە هەرا هاتەوە باز
گەرچی «حافز» دڵی شکیابو کە پەیمانی شکاند
دەشتی دەستی کەرەمی پڕ لە سەفا هاتەوە باز
مەستی چاوی بەڵەک و بەژنی نیگارێکم ئەڵێی
شیعری «کۆلیل»ـە دەمی، پڕ لە نەوا هاتەوە باز

مـژده ای دل کـه دگـر بـاد صبـا بازآمـد

هـدهـد خوش‌خبـر از طرف سبـا بازآمد

بـر کش ای مـرغ سحـر نغمـه‌ی داوودی باز

کـه سلیمـان گـل از بـاد هـوا بـازآمد

عـارفی کـو که کنـد فهـم زبـان سوسن

تا بپـرسد که چـرا رفت و چـرا بـازآمد

مردمـی کرد و کـرم لطف خـداداد به من

کـآن بت مـاه‌رخ از راه وفـا بـازآمـد

لالـه بوی مـی نوشیـن بشنـید از دم صبح

داغ دل بـود به امیـد دوا بـازآمد

چشـم من در ره ایـن قافلـه‌ی راه بمـاند

تـا به گـوش دلـم آواز درا بـازآمـد

گرچه حافظ در رنجش زد و پیمان بشکست

لطـف او بیـن که به لطـف از در ما بازآمد

سەبـا بە خــزمەتی پیـری لەعل‌فـرۆش گەیـی
کە وەرزی گۆوەنی خۆشی، بەهاری نۆش گەیی

زەمان وەکوو دەمی عیسا دەمە و زەمیـن خۆش‌بۆ
بـڕا بە بەر چەمەنا گوڵ، بە مـەل خورۆش گەیی

تەنووری لالە بە فـوویێکی سـروە وا گڕێ سەند
کە غەرقی ئارەقـە خونچەو سەمەن بەجۆش گەیی

لە مـن ببیســی ئەبێ خـۆش بپـێوی ئەم دونیـا
کە ئەم قسـەم لە سرۆشێ، سەحەر بە هۆش گەیی

لە بیـری تەفرەقە دەربێ بە خـاتری جــەم‌بوون
جنـۆکە دەرکـە لە دڵ! وا فریشتـە خۆش گەیی

لە دەم مــەلی سوحی، ئاخـۆ چ بیستبوو سۆسـەن
کە دەهـزمـانی گـرێ دا، مەگەر سرۆش گەیی؟!

حەرامـە سوحبـەتی زاهیــد لە مەجلیسی یـاران
دەبێ پییـاڵە وەشـارن کە خەرقــەپۆش گەیی

لە خــانەقـاوە دەچـێ «خــاجە» بۆ خــەرابـاتێ
کە شێــخی مەستی ریا هەر لەوێ بە هۆش گەیی

نەدەی نەیـار بە مەیخانە رێ! وەکـوو «کۆلیــل»
کە ئەو بەهەشتــە بە یـارانی دڵپــەرۆش گەیی

صبا به تهنیت پیر می فروش آمد
که موسم طرب و عیش و ناز و نوش آمد
هوا مسیح نفس گشت و باد نافه گشای
درخت سبز شد و مرغ در خروش آمد
تنور لاله چنان برفروخت باد بهار
که غنچه غرق عرق گشت و گل به جوش آمد
به گوش هوش نیوش از من و به عشرت کوش
که این سخن سحر از هاتفم به گوش آمد
ز فکر تفرقه بازآی تا شوی مجموع
به حکم آن که چو شد اهرمن سروش آمد
ز مرغ صبح ندانم که سوسن آزاد
چه گوش کرد که با ده زبان خموش آمد
چه جای صحبت نامحرم است مجلس انس
سر پیاله بپوشان که خرقه‌پوش آمد
ز خانقاه به میخانه می‌رود حافظ
مگر ز مستی زهد ریا به هوش آمد

بەختــی یــارم لە سەحـەر دەم بە بـزەی ژینەوە هات
وتی خەو بەسیــەتی! خوسرەو کە بە شیرینـەوە هات
قەدەحێ خەست وەخۆ، مەست تەماشا کە! کە چۆن
دلّبــەری شـۆخ بـە ئاڕایش و تەمکیــنەوە هات
موژدە ئەی خەلّوەنشیــن! عاشقی بۆی خۆشی بەهـار
مامــزی دەشتــی خوتـەن مایـە، لە ماچینــەوە هات
ئــابــڕوویان بە گرین کــەوتەتە دەس ســووتەدلاّن
مــەدەدی نــالّە بە دەم عاشــقی بێ‌تینــەوە هات
کۆتــری دلّ بــووە شـەیـدا بە کــەوان ئەبـرۆیێ
لـەوە ترســی نیـیە راوچـی کە بە شاهیــنەوە هات
بێــنە مـەی ساقی غەمـی یـار و نەیــارێک مەخۆ
خـوا شوکــور دژ ئەوە چـوو، دۆس بە ئاییــنەوە هات
بێ‌وەفــایی لە فەلــەک دیوە، کە شیــن گێڕی بەهار
زوو بـە دەم یاســەمەن و نێــرگز و نەسرینـەوە هات
تا لە بولبــول غەزەلّی «حافــز»ی شەو سروە شنەوت
بە هەناســەی گولّـی نێــو باخـی سەحەربینەوە هات
وەکـو بیستووتە لە «کۆلیـل»ـی ئەوین سـەد کەڕەتیش
مــەم بە ئەم باخــە بە بۆنـەی دییـەنی زینــەوە هات

سحـــرم دولت بیـــدار بـه بالیـــن آمـد
گفت برخیـــز که آن خســرو شیـرین آمد
قدحی درکش و سرخوش به تمـاشا بخـرام
تـا ببـینی کـه نگـارت به چه آییـــن آمد
مژدگـــانی بده ای خلـــوتی نافـــه‌گشای
که ز صحـــرای ختـــن آهـــوی مشکین آمد
گـــریه آبـی بـه رخ سوختگـان بـازآورد
نـــاله فـــریادرس عـــاشق مسکیـــن آمد
مرغ دل بـــاز هـــوادار کمـــان ابروئی‌ست
ای کبـــوتر نگـــران بـــاش که شاهین آمد
ساقیا می بده و غم مخور از دشمن و دوست
که به کـــام دل مـا آن بشـــد و ایـــن آمد
رســـم بدعهـــدی ایـام چو دیـد ابر بهار
گریـــه‌اش بر سمـــن و سنبـل و نســـرین آمد
چون صبـا گفتـــه‌ی حافـظ بشنید از بلبـل
عنبـــرافشـــان به تمـــاشای ریـاحیـــن آمد

نە هەرکە روومەتی رەخشانە دلبەری زانی
نە هەرچی جامە، لە جامی سکەندەری زانی
نە هەر کلاوکەچیێ، توند و خاوەنی سامان
نەریتی دلبەری ئادابی ریبەری زانی
وەکوو گەدا بە کرێ بەندەگی نەکەی! کێ ئەوین
بە گیان و دڵ رەوشی بەندەپەروەری زانی
غولامی هیممەتی ئەو رەندە ژیر و ئازایەم
هەزارە گەرچی، وەلێ کیمیاگەری زانی
هونەر وەفایە بە عەهد و گرانە ئەزموونی
کە بێهونەر لە خەویشا ستەمگەری زانی
دەسی وەشان لە دلی شێت و نەمدەزانی من
کە ئادەمی نەوەیێ، سەنعەتی پەری زانی
هەزار جارە تەسکتر لە مووت ئەم نوکتە
نە هەرکەسێ سەری تاشی، قەلەندەری زانی
گلێنەیی نەزەرم وا لە جەغزی خالەکەتا
کە نرخی گەوهەری یەکتامی گەوهەری زانی
بە کولم و قامەتی هەرکەس دەلال و سالارە
دەبێ بە حاکمی عالەم، کە دلبەری زانی
لە شیعری دلگری «حافز» بلیمەتێ حالێن
کە تەبعی ناسک و ئاخەوتنی دەری زانی
غەزەلرەوانم و عاشق بە قافیەی کوردێ
کە سەر لە شیعری «عومەر» وەزنی سەروەری زانی

نه هر که چهره برافروخت دلبری داند
نه هر که آینه سازد سکندری داند

نه هر که طرف کله کج نهاد و تند نشست
کلاهداری و آیین سروری داند

تو بندگی چو گدایان به شرط مزد مکن
که دوست خود روش بنده‌پروری داند

غلام همت آن رند عافیت سوزم
که در گداصفتی کیمیاگری داند

وفا و عهد نکو باشد ار بیاموزی
وگرنه هر که تو بینی ستمگری داند

بباختم دل دیوانه و ندانستم
که آدمی بچه‌ای شیوه‌ی پری داند

هزار نکته‌ی باریک‌تر ز مو اینجاست
نه هر که سر بتراشد قلندری داند

مدار نقطه‌ی بینش ز خال توست مرا
که قدر گوهر یکدانه جوهری داند

به قد و چهره هر آن‌کس که شاه خوبان شد
جهان بگیرد اگر دادگستری داند

ز شعر دلکش حافظ کسی بود آگاه
که لطف طبع و سخن گفتن دری داند

رازداری دڵــە کێ پــاک بە کــۆی یــار دەچێ
هەرکــە ئەم کــارە نەزانــێ لە دەسی کــار دەچێ
مەکە مەنعــی دڵ ئەگــەرچی لە حیجــابێ وەدەرات
خوایە شوکرت! کە لە پەردەی شک و ئینکار دەچێ
ریشی سۆفــی کە لە مەیــخانە بــو خۆی هــاتەوە باز
هەر جبــەیٚ‌من لە گرێــوی مــەی و خەممار دەچێ
شێخــە ئێستــا دزی شــار و نیــیە نــاوێکی کەچی
شــەرحی سووکی منی بێــچارە بە هەر شار دەچێ
هــەر شەرابێ لە بلــوورین کــەفی تۆمــان دەگرت
ئێستــە خوێنــی دڵــە لەم چــاوە گوهــەروار دەچێ
مەگەر ئەو دڵمە نەبێ عەشقــی ئەتــۆی نەخشە لە تۆ
دڵــی زاهیــد بە ســەعاتێک لە ســەد یــار دەچێ
گوڵــی نێــرگز کە وەکــوو چاوی ئەتۆی پێ نەکرا
دیــدە بیمــــار چلۆن هــاتووە، بیمــــار دەچــێ
لە نەوای ئەشــق و ئەویــن خۆش‌تری گیانم نەشنەوت
سۆزی سازێ کە بە گوێی ئەم گومەزەی یار دەچێ
ئەو عەبــا کۆنە کە ســەد عەیبــی دەپۆشیــم ئەویش
چوو بە رەهنــی مــەی و ساقی، وەکــو زیننار دەچێ
مــات و حەیران لە جەماڵت بووە سوورەتگەری چین
ئێستــەش ئەم بــاسە بە ژووری دەر و دیــوار دەچێ
واولــی «خاجە»! نەبوو دڵ، بە نیگای زوڵفــی کە چوو
هەر وەهــا خۆشــە، کەسێ شێــتە گرفتــار دەچێ
شــــەوی ئــاواتی «عومەر» زولفی پەرێشــانیە چون
رۆژی روونــاکی بە ژێر پەرچــەمی شەوگــار دەچێ

هر که شد محرم دل در حرم یار بماند
وآن‌که این کار ندانست در انکار بماند
اگر از پرده برون شد دل من عیب مکن
شکر ایزد که نه در پرده‌ی پندار بماند
صوفیان واستدند از گرو می همه رخت
دلق ما بود که در خانه‌ی خمار بماند
محتسب شیخ شد و فسق خود از یاد ببرد
قصه‌ی ماست که در هر سر بازار بماند
هر می لعل کز آن دست بلورین ستدیم
آب حسرت شد و در چشم گهربار بماند
جز دل من کز ازل تا به ابد عاشق رفت
جاودان کس نشنیدیم که در کار بماند
گشت بیمار که چون چشم تو گردد نرگس
شیوه‌ی تو نشدش حاصل و بیمار بماند
از صدای سخن عشق ندیدم خوش‌تر
یادگاری که در این گنبد دوار بماند
داشتم دلقی و صد عیب مرا می‌پوشید
خرقه‌ی رهن می و مطرب شد و زنار بماند
بر جمال تو چنان صورت چین حیران شد
که حدیثش همه‌جا در در و دیوار بماند
به تماشاگه زلفش دل حافظ روزی
شد که بازآید و جاوید گرفتار بماند

لە ئێـوە موژدە، کە شەوگاری غـەم دەچێ بۆ خۆی
وەهـــا نەمـــاوە دەم و واشـــە هـەم دەچێ بۆ خۆی
ئەگـــەرچی یــار لە مـن چـــاوی حورمـــەتی تۆرا
مەگەر رەقیـبی ئەمن موحتـــەرەم دەچێ بۆ خۆی؟!
کـە پەردەدار قـەلاچۆ دەکا بە شێــرێ، هـەمـوو
تەنـانە خەڵکی حەرەم هەم بە جـەم، دەچێ بۆ خۆی
نەگونجە شوکر و سکــاڵا لەدەستی چاك و خراو
کە بەرگی دەفتـــەری ژین بێ‌ڕەقــەم دەچێ بۆ خۆی
نـــەوای مەجلیسی جەمشیـد ئەمەی دەوت مەیگێڕ!
کە بێـنە جـامی بلـوورین! کە جـەم دەچێ بۆ خۆی
چ دەرفەتێـکە ویسـاڵی پەپـوولە بۆ شـەم شـەو!
کە ئەم زەمـــاوەنە هـەم، سوبحـدەم، دەچێ بۆ خۆی
دڵی هـــەژار بە جێ بێــنە، دەوڵەمەن! وەك خــۆت
کە بانگــی پـــارە، تەڵا، هـەم درەم، دەچـێ بـۆ خۆی
لە ســـەردەری فەلـەکی شیـن لە زێڕە خەتێ سوور
کە غەیـری بەخششی دەستی کەرەم، دەچێ بۆ خۆی
بە لوتفی حـەزرەتـی ئـازیـز «حـافـــز»! بێ‌شـک
نەرێتـــی زڵـم و نیشــانی ستـــەم، دەچێ بۆ خۆی
بە لەعلی لێــوی بپـێون شەکەر! وەکـــوو «کۆلیـل»
کە ژەهـــری تـــاڵی شـــەرابی ئەلەم، دەچێ بۆ خۆی

رسیـــد مژده که ایـــام غـــم نخواهـــد مـــاند
چنـــان نمـــاند چنـــین نیـــز هم نخـــواهد ماند

من ار چـه در نظـــر یـــار خاکســـار شـــدم
رقیـــب نیـــز چنـــین محتـــرم نخـــواهد ماند

چو پـــردەدار به شمـــشیر مـــیزنـــد همـــه را
کسی مقیـــم حریـــم حـــرم نخـــواهد ماند

چه جای شکر و شکایت ز نقش نیک و بد است
چو بر صحیـــفەی هستـــی رقـــم نخـــواهد ماند

ســـرود مجلس جمشیـــد گفتـــەاند این بـود
که جـــام بـــاده بیـــاور که جم نخـــواهد ماند

غنیمتـــی شمـــر ای شمـــع وصـــل پـروانـــه
کـه این معامـــله تـا صبحـــدم نخـــواهد ماند

توانگـــرا دل درویـــش خـــود بـه دســـت آور
کـه مخـــزن زر و گنـــج درم نخـــواهد ماند

بدیـــن رواق زبـــرجـــد نـوشتـــەاند بـــه زر
کـه جـــز نکـــویی اهـــل کـرم نـــخواهد ماند

ز مهـــربانی جانـــان طمـــع مبـــر حافـــظ
که نقش جـــور و نشـــان ستم نخـــواهد ماند

ئەی لێوەکەت بە خەندە پەنی دا بە شەکر و قەن
تۆخوا دڵم بەڕێ کە! بزەت هەڵکە لە چیمەن
توویا بە بەژنی کورتە، سەری بۆ نەوی دەکا
لەم باسە سا گوزەرکە! نەبێ با بە چۆن و چەن
پێت خۆشە چاو نەبێتە چەمی خوێنی پڕ خوڕۆش
مەسپێرە دڵ بە لێوی دەلالانی گوڵبەدەن
گەر نازە یا ریایە، بە هەرچێکی نێو ئەبەی
نیمانە باوەڕ ئێمە بە شێخانی خۆ پەسەن
ئاگەی لە حاڵمان نییە هەرکەس نەبوو دڵی
نالانی، چەشنی ئێمە گرفتاری تۆی کەمەن
دڵ پڕ لە ئەشتیایە کە هەڵبێ هەتاوی رووت
وەك ئەسپەنەر بسووتێ هەتا گیانی ئەنجومەن
لەو جێگە دڵبەری مە دەمی شەکری گوڵ دەکا
ئەی پستە بێمەتەق بە! کە لچ شۆڕی، دەبیە پەن
«حافز»! کە تورکی عیشوە بە تۆ تەرکی ناکرێ
بێژم کە جێت لە کوێیە؟ لە خارەزمە یا خوجەن
«کۆلیل» مەستی موشکی غەزالی خەتایەتی
بۆیێ لە داوی زولفییە خۆشتر لە کۆی خوتەن

ای پسته‌ی تو خنده زده بر حدیث قند
مشتاقم از برای خدا یک شکر بخند
طوبی ز قامت تو نیارد که دم زند
زین قصه بگذرم که سخن می‌شود بلند
خواهی که برنخیزدت از دیده رود خون
دل در وفای صحبت رود کسان مبند
گر جلوه می‌نمایی و گر طعنه می‌زنی
ما نیستیم معتقد شیخ خودپسند
ز آشفتگی حال من آگاه کی شود
آن را که دل نگشت گرفتار این کمند
بازار شوق گرم شد آن سروقد کجاست
تا جان خود بر آتش رویش کنم سپند
جایی که یار ما به شکرخنده دم زند
ای پسته کیستی تو خدا را به خود مخند
حافظ چو ترک غمزه‌ی ترکان نمی‌کنی
دانی کجاست جای تو خوارزم یا خجند

وەرە دەستی من و داوێنەکەت ئەی سەروی بوڵەند
کە قەد و قامەتی واڵات رەگ و ریشەمی کەند

نامەوێ موتریب و مەی رووبەنەکەت لادە کەمێ
ئاگری رووت هەڵمخاتەوە با چەشنی سپەند

جامی بەربووکی بەخت رووومەتی تاکێك نییە
مەگەر ئەو کوڵمە بە تۆزی سمی ئەسپت، گوڵی سەند

نەکوژی مامزە تاتارییەکەم راوچی ئەمان!
بکە لەو چاوە رەشەی شەرم و مەیالێنە کەمەند

کردم ئیقراری غەمت هەرچی دەبێ بێڵە ببێ
نییە سەبری پترم تاملی دڵ تا کەی و چەند

خاکەسارێکی وەکوو من کە لە جێ کەوتووە چۆن
سەرکەوێ ماچی لە دیواری شکۆی کۆشکی بوڵەند

«حافز»!! دڵ لە دەسی زولفی رەشی مەگرەوە باز
چونکە دێوانە وەها چاکە بمێنێت لە بەند

ئەو قەد و قامەت و سەر وێنە «عومەر»! دڵتی رفاند
کاری دۆنارییە یا سەروی چەمانی هەمەوەند

بعـــد از این دست من و دامـن آن سرو بلند
که به بـالای چمـان از بـن و بیخـم بر کنـد
حــاجت مطرب و مـی نیست تو برقع بگشـا
که به رقــص آوردم آتش رویـت چو سپند
هیــچ رویی نشـود آینـه‌ی حجـله‌ی بخت
مگــر آن روی که مالنـــد در آن سـم سمند
گفتم اســرار غمت هر چـه بود گو می‌باش
صبر از این بیش ندارم چه کنم تا کی و چند
مکش آن آهــوی مشکیــن مــرا ای صیــاد
شرم از آن چشم سیـــه دار و مبندش به کمند
من خــاکی که از این در نتــوانم برخـاست
از کجــا بوســه زنم بر لب آن قصــر بلنــد
باز مستــان دل از آن گیسوی مشکین حافظ
زان کــه دیوانه همــان به که بود اندر بنــد

تەمەنێ چوون و هەواڵی خەتی گوڵفامی نەبوو
مەحرەمێکی نەبو ئەو دڵمە کە پەیغامی نەبوو
پێشکاوم لە گەیشتن بە دیاری گوڵی رووی
ماتڵی یەک قەدەمێ بوم، کە بەرەو لامی نەبوو
مەی رژا جام و لە روو رووبەنی فڕداوە گوڵوک
فرسەتی بەزمە، فەلەک هات و سبەی جامی نەبوو
قەنی تێکەڵ بە گوڵ ئەم زامە لە دڵ لا نابا
ماچی جوێناوییە دەرمان، کە کزەی فامی نەبوو
زاهید ئارام لە کۆڵانی رەقیبان گوزەرا
سوحبەتی رەند و قەڵەندەر دەمی ئارامی نەبوو
عەیبی بادەت کە هەموو وت هونەری کامە بڵێ
دەمی حاشا و فریوت کە مەزە و تامی نەبوو
ئەم هەزارانی دەری مەیکەدە یارانی خودان
دۆسی ئەو چاو لە دەسی خێڵی (کالأنعام)ی نەبوو
پیری مەیخانە بە مەیۆشی چ خۆش وت کە مەڵێ
حاڵی دڵ بەو کەسە هەرگیز دڵی ناکامی نەبوو
ئارەزوی خۆری دەمت «حافز»ی سووتان و کەچی
رۆژی کامت گوڵەتاوێکی لە ناکامی نەبوو
نەزمی «کۆلیل» وەکوو قامەتی مەوزوونە، بەڵام
شیعری کەچبین هونەری بەژنی دڵارامی نەبوو

حسب حالی ننوشتی و شد ایامی چند
محرمی کو که فرستم به تو پیغامی چند

ما بدان مقصد عالی نتوانیم رسید
هم مگر پیش نهد لطف شما گامی چند

چون می از خم به سبو رفت و گل افکند نقاب
فرصت عیش نگه‌دار و بزن جامی چند

قند آمیخته با گل نه علاج دل ماست
بوسه‌ای چند برآمیز به دشنامی چند

زاهد از کوچه‌ی رندان به سلامت بگذر
تا خرابت نکند صحبت بدنامی چند

عیب می جمله چو گفتی هنرش نیز بگو
نفی حکمت مکن از بهر دل عامی چند

ای گدایان خرابات خدا یار شماست
چشم انعام مدارید ز انعامی چند

پیر میخانه چه خوش گفت به دُردی کش خویش
که مگو حال دل سوخته با خامی چند

حافظ از شوق رخ مهر فروغ تو بسوخت
کامگارا نظری کن سوی ناکامی چند

سەحەری دوێنەشەوێ دۆس لە غەم دامی نەجات
شەوی تاریک و دەمی وشکی من و ئاوی حەیات
خۆمی لێسەندەوە دڵ، نووری ئەوین مەوجی ئەدا
کە جەماڵی سیفەتی، عەشقی حەقم بوو بە خەڵات
چ بەیانێکی موبارەک، چ شەوێکی بە شکۆ
ئەو شەوی قەدر و خەڵاتەم، وەک ئەڵێن جێژنی بەرات
لەمە بەولا دڵ و من جامی جەهانبینی موراد
چون لە ئەو جامەوە دیتوومە جەماڵێک لە زات
من ئەگەر دەستی مەبەستم لە ملە و خۆشە دڵم
کەرەمی فەرمووە دڵبەر بە هەژارێک زەکات
بە من ئەو ڕۆژە درا، دەوڵەت و سامانی وەها
کە قڕی خستە سپای زۆر و ستەم سەبر و سوبات
ئەو هەمووو شەربەتە شیرینە دەچۆڕێ لە قەڵەم
بەرهەمی شاخە نەباتێکە، لە شاکاری خەبات
هیممەتی «حافز» و دۆعای سەحەری چاکان بوو
کە لە زیندانی غەم و سووڕی فەلەک، دامی نەجات
بولبول و قومری و «کۆلیل» و گوڵ و عەشقی دەرون
بە دەنووک و غەزەڵ و بەژن و نەوا، دێنە سەنات

دوش وقت سحـــر از غصــه نجـــاتم دادند

واندر آن ظلمت شب آب حیاتم دادند

بیخود از شعشعه‌ی پرتو ذاتم کردند

باده از جام تجلی صفاتم دادند

چه مبارک سحری بود و چه فرخنده شبی

آن شب قدر که این تازه براتم دادند

بعد از این روی من و آینه‌ی وصف جمال

که در آن‌جا خبر از جلوه‌ی ذاتم دادند

من اگر کامروا گشتم و خوش‌دل چه عجب

مستحق بودم و این‌ها به زکاتم دادند

هاتف آن روز به من مژده‌ی این دولت داد

که بدان جور و جفا صبر و ثباتم دادند

این همه شهد و شکر کز سخنم می‌ریزد

اجر صبری‌ست کز آن شاخ نباتم دادند

همت حافظ و انفاس سحرخیزان بود

که ز بند غم ایام نجاتم دادند

دیم بە خەو فەوجی مەلەك، مەوج لە مەیخانە درا
گڵـی ئـادەم بە گوڵـی بـادە لە پەیمـانە درا
عـالەمی غەیب لە نێـو خەڵـوەتی پاکا لەگەڵ ئەم
رێنشینـەت، بە کـەرەم شەربـەتی جـانانە درا
ئاسمـانیش لە ژێـر بـاری ئەمـانەت چۆوە دەر
وەی کـە ئەم بـارە بە کـۆڵی منی دێـوانە درا
شـەڕی حەفتـاد و دو مەزهەب بە نەزانینەوە هـات
زاری حـەق لالـە هەمـوو هەر دەمی ئەفسـانە درا
لە بەر ئەو ئاشتیـیەی کـردی لەگەڵ ئێـمە ئەویـن
مـەی بە سـۆفی لە سەمـاعا وەکـو شوکرانە درا
ئاگـر ئەو ئاگـرە نیـن پێـدەکەنێ شەم بە گڕی
ئاگـر ئەو پۆلـە شـەرارەن کـە لە پـەروانە درا
کەس خەیـاڵی وەکو «حافـز» لە جەماڵا نەنوانـد
لەوەتـا زولفـی قسـەی دڵ بە قەڵـەم شانە درا
مەبە «کۆلیـل» وەکـوو تاقمـی دەم پڕ لە ئـەوین
ئیشـی وا یەعنـی لە دڵ تۆمـەتی بڵحـانە درا

دوش دیــدم که ملایــک در میخانه زدند

گــل آدم بســرشتــند و بـه پیمـــانه زدنـد

ساکنـــان حـــرم ستـر و عفــاف ملکــوت

بـا مــن راه‌نشیـــن بــاده‌ی مستـــانه زدنـد

آسمــــان بـار امـــانت نتـــوانست کشیـد

قرعـــه‌ی کــار به نــام من دیــوانه زدند

جنــگ هفتــاد و دو ملت همــه را عذر بنـه

چون ندیــدند حقیــقت ره افســانه زدند

شکــر ایزد که میــان من و او صلـح افتاد

صوفیـــان رقص‌کنـان ساغـر شکرانه زدند

آتش آن نیست که از شعله‌ی او خندد شمع

آتش آن است که در خـرمـن پروانـه زدند

کس چو حافظ نگشاد از رخ اندیشـه نقـاب

تا سـر زلف سخــن را به قلــم شانــه زدند

زێڕناسێکم ئەوێ، دڵ مەحەکی وەزن و عەیار
تا بە مزگەوت نەچن قەڵبفرۆشانی نەیار
مەسڵەحەت وایە هەموو دەس لە هەموو کار بشۆن
بێنە ژێر حوکمی فەلەکنازی خەمی کاکوڵی یار
پرچی ساقی حەرەمی دەستی حەریفانە ئەگەر
فەلەک ئەو عەهدە بهێڵێت لە سەر زولفی قەرار
هێزی تەقوا مەنووێنن بە دەلالان کە لەوان
شاسوارێک دەپێچێتەوە سەد شۆڕەسوار
خوایە ئەم شۆخسووارانە چ خوێنڕێژ و مەسن
کە بە پەیکانی برۆ دێنە کەمینی دڵی شار
هەڵپەڕین، شیعری تەڕ و ناڵەیی نەی، خۆشە بەڵام
لەوە خۆشتر کە بنێی دەست لە نێو دەستی نیگار
«حافز»! ئەو خەڵکە نەوەی چەرخن و بێبەین و بەقا
ئەگەرت مومکینە وا چاترە زوو بچیە کەنار
گیانی «کۆلیل» بە قوربانی دییەی ئەو کەسە بێ
کە هەژاندی دڵی چەرخی فەلەک و هەوری بەهار

نقـــدها را بـــود آیـــا که عیـــاری گیـــرند
تا همـــه صومعـــه‌داران پی کـــاری گیـــرند
مصلحت دید من آن است که یاران همه کـار
بگـــذارند و خـــم طـــره‌ی یـــاری گیـــرند
خـوش گرفتـــند حریفـــان سر زلـف ســاقی
گر فلکـشان بگـــذارد که قـــراری گیـــرند
قـــوت بازوی پرهیـــز به خوبـــان مفـــروش
که در این خیـــل حصـــاری به سـواری گیرند
یـــا رب این بچه‌ی ترکان چه دلیـرند به خون
که به تیـــر مـژه هر لحظـه شکـــاری گیـــرند
رقـــص بر شعـــر تـــر و نالـــه‌ی نی خوش باشـد
خاصـه رقصی که در آن دست نگاری گیـرند
حافـــظ ابنـــای زمـــان را غـم مسکینـان نیست
زین میـــان گر بتـــوان بـــه که کنـــاری گیرند

پیـــری موغـــان بە چـــاکە ئەگـەر مـەی عەتـا دەکـا
رەحمـــــی خـــــوداش زۆرە دەمێـــــنی بەڵا دەکـــا
ســـاقی بە عەدڵی بـادە گـــەدا مەس کە! چونکە ئەو
دەمپیســـە دڵ حەســـوودە، بە مەجلیـس جەفـــا دەکـا
ئەڵبـــەت کـە لـــەم غەمـــانە دەگـا کـاتی ئەمـانێ
ســـۆفی بەلـێـــنی داوە ئەمـــانەت ئـــەدا دەکـــا
گەر گەنجـە یا نە رەنجـە قەنـاعەت کە، ئەی حەکیـم!
چون دەستـی ئەو لە نێـوە ذەنـا کێ وەهـــا دەکـا
بـەو کـــارگـــایە عیـــلم و هونـــەر رێگـــە نابەڵـــەد
لاوازە فـــامی، هـــەرکە فـــزوولی لـەوا دەکـــا
موتـریب ســـەدا هەڵێـنە! کـە بـێ وادە کـەس نەمرد
ئاهـــەنگی ئەم هەواتـــە دەرون پڕسەفـــا دەکـــا
ئێمـەی کە دەردی عەشق و بروسـکەی خومـار کوشت
یـا وەسڵـــی دۆســـە چـــارە وە یا مـــەی دەوا دەکـــا
«حافز» بە عەشقی سووت و بە مەی هۆشی چوو لە سەر
لە کوێن مەسیحـی لێـــوی؟! کە ســـەر لە نۆ چـا دەکا
زۆری شـەهیـــــد داوە بـــە بـــــارامی دوو بـــرۆی
ئەشکـی «عومــەر»، کە ئەورۆ، ورەی خوێنبەهـا دەکا

گر می فـــروش حــاجت رنــدان روا کنــد
ایـزد گنـــه ببخشـــد و دفـــع بـــلا کنـــد
ســـاقی به جـــام عـــدل بده بـــاده تـا گـــدا
غیـــرت نیـــاورد که جهـــان پر بـــلا کنـــد
حقـــا کز این غمـــان برســـد مـــژده‌ی امـــان
گـــر سالکـــی به عهـــد امـــانت وفـــا کنـــد
گر رنـــج پیش آیـــد و گر راحـــت ای حکیم
نسبت مکـن به غیـــر که این‌هـــا خـــدا کنـــد
در کارخـــانه‌ای که ره عقـــل و فضـــل نیست
فهـــم ضعیـــف رای فضـــولی چـــرا کنـــد
مطـــرب بســـاز پرده که کس بی‌اجـــل نمـــرد
وآن‌کـو نه ایـــن ترانـــه ســـراید خطـــا کنـــد
مـــا را که درد عشـــق و بـــلای خمـــار کشت
یا وصـــل دوست یـــا مـی صـــافی دوا کنـــد
جان رفت در سر می و حافظ به عشق سوخت
عیسـیِ دمـی کجـاست که احیـای مـا کنـــد

دەرون بنـــالّـە! کـە هـەر نـالّـە کـارەبـایە لـە دڵ
پـلاری نێـوەشـــەوێ دەفـعـــی سـەد بەڵایە لە دڵ
مـەلامـــەتی دمـــی دلّبـــەر بە عـاشقـــانه رەوا
کریشمـەیێ قـەرەبـوی سـەد کەڕەت جەفایە لە دڵ
لە خـــاك تـا فەلە کول ئەتلّەسی حیجـاب نیـــیە
کەسـێ کە خـــادەمی جـامی جەهـاننومایە لە دڵ
دەمی مەسیحـــە ئـــەوین و دەسی موبـارەکی ئەو
وەلـێ کـە دەرد نەبـوو کـەی دەوا شفـــایە لە دڵ
نیـازی دڵ بدە دەستی خـودا بە خـــاتری عەشـق
کە رەحـــم ئەگەر چـووە قـاتی، خودایە مایە لە دڵ
مەلـــوولی بەختـــی خـەوالّـووم خـوایـە بێـداریێ!
لـــە بـــەربـەیـــانی تەمەنـــا بکــا دوعـــایە لە دڵ
تـوواوە «حافـــز»و بۆنێـــکی زولفـــی یـاری نەبیست
دەلّێـــن کە دەولّەتی وەسلّـی سەبـا، سەبـایە لە دڵ
بە سۆزی گیـــانی شـــەرم شـــەرمەزارە «کۆلیـــل»ـی
کە کولّمی ناسکی، رووشـــاوی سەد هەوایە لە دڵ

دلا بســـوز که ســـوز تو کــارهــا بکنــد
نیـــاز نیــم شبـــی دفـــع صـد بــلا بکنـد
عتـــاب یـــار پری‌چهـــره عاشقـــانه بکش
که یک کرشمـــــه تلافـــی صـد جفـا بکند
ز ملـــک تـــا ملکـــوتش حجـــاب بردارند
هــر آن کـه خدمت جـــام جهـــان‌نما بکند
طبیب عشق مسیحـــادم است و مشفـــق لیک
چـــو درد در تـــو نبیـــند که را دوا بکنـــد
تو با خدای خود انــداز کار و دل خوش دار
که رحـــم اگر نکنـــد مدعـــی خـــدا بکند
ز بخت خفتـــه ملـــولم بـــود که بیـــداری
به وقت فـــاتحـه‌ی صبـــح یک دعـــا بکند
بســـوخت حافظ و بویی به زلف یـــار نبرد
مگـــر دلالـــت ایـن دولتـــش صبـــا بکنـد

لە من رەقیب لەبەر دڵ، نەزەر بە عەیب ئەدا
زمانی تانە لە ئەسراری دەستی غەیب ئەدا
کەماڵی لوتفی دلاری ببینە! نە جورمی گوناح
کە هەر کە عاشقی خۆ بێ، هونەر بە عەیب ئەدا
نەسیمی عەتری بەهەشتی، دەمێ دەچێ نەفەسی
کە خاکی دەرکی خەرابات سەر لە جەیب ئەدا
وەها بە نازەوە ساقی کەلێنی دین دەبەسێ
پلاری لۆمە لە مینای، هەر (سوهەیب) ئەدا
کلێلی گەنجی سەعادەت بە لێوی ئەهلی دڵە
هەزارە ئەو کەسە لەم شووشە بەردی رەیب ئەدا
شووانی عاشقە مووسا، یەقین دەگا بە موراد
کە حەوت ساڵە بە دڵ رەنج بۆ شوعەیب ئەدا
لە دیدە خوێن دەتکێنێ حەکایەتی «حافز»
دەمێ کە شەرحی شەباب و جەنابی شەیب ئەدا
دەبێ لە گۆچ کراوی ئەوین نەپرسی «عومەر»!
وتاری موعجیزە بۆ؟! بۆ بەنی کولەیب ئەدا

مرا به رندی و عشق آن فضول عیب کند
که اعتراض بر اسرار علم غیب کند
کمال سرّ محبت ببین نه نقص گناه
که هر که بی‌هنر افتد نظر به عیب کند
ز عطر حور بهشت آن نفس برآید بوی
که خاک میکده‌ی ما عبیر جیب کند
چنان زند ره اسلام غمزه‌ی ساقی
که اجتناب ز صهبا مگر صهیب کند
کلید گنج سعادت قبول اهل دل است
مباد آن که در این نکته شک و ریب کند
شبان وادی ایمن گهی رسد به مراد
که چند سال به جان خدمت شعیب کند
ز دیده خون بچکاند فسانه‌ی حافظ
چو یاد وقت زمان شباب و شیب کند

لە سـەرم بـاڵی هوما گەشت و گـوزارێکی هەیە
بۆیە دڵبـەر لەگـەڵم قـەوڵ و قـەرارێکی هـەیە
چاو ئەگەرچی لە دەسی داوە دوڕ و گەوهەری خۆ
کە لە دڵ خوێـن دەمژێ، عەزمی نیسارێکی هەیە
دوێشەوم بوو لە دڵ ئەم خۆزگە، کە بدوێ لەگەڵم
یەک سورۆشـێک وتی لوتفی بەهـارێکی هەیە
هەرکە زاتی نیـیە دەم بـا لە قسـەو باسـی دڵـم
سا مەگەر سروە کە ئەو چەرخ و مەدارێکی هەیە
نەزەری دیدەمـە، شاهێـنی شکـاری دڵـی یـار
مەسـەلێ بـاوە کە هـەر بـاز شکـارێکی هەیە
کەمە ئـەو رەنـدە کە بۆ یـار لـە خۆ بێـتە دەرێ
عـاشق ئەوڕۆکە عەجـەب فیـز و دەمارێکی هەیە
کوا جووامێـرێ بە جامـێ لە زەماوەنـدی سەخـای
غەمڕەوێـن بێ لە دڵـی هەرکە خومـارێکی هەیە
لە سـەبا نایە شنـەی وەسڵی ئەتۆ یـا خـەبەری
لانیـکەم مەرگی رەقیـبم، کە شـەرارێکی هەیە
«حافـز»! ئەوڕۆکە ئەگەر دوور لە دەرکی نەکـەوی
دێ زەمـانێ لە کنـارت کە گوزارێـکی هەیە
بۆ منـی گـردەنشینـێک کە «کۆلیـل»ی ئەتـۆم
هـەر ئـەوەم چـاکە بڵێـن گۆشـەکنارێکی هەیە

طایر دولت اگر باز گذاری بکند
یار بازآید و با وصل قراری بکند
دیده را دستگه در و گهر گر چه نماند
بخورد خونی و تدبیر نثاری بکند
دوش گفتم بکند لعل لبش چاره‌ی من
هاتف غیب ندا داد که آری بکند
کس نیارد بر او دم زند از قصه‌ی ما
مگرش باد صبا گوش گذاری بکند
داده‌ام باز نظر را به تذروی پرواز
بازخواند مگرش نقش و شکاری بکند
شهر خالی‌ست ز عشاق بود کز طرفی
مردی از خویش برون آید و کاری بکند
کو کریمی که ز بزم طربش غمزده‌ای
جرعه‌ای درکشد و دفع خماری بکند
یا وفا یا خبر وصل تو یا مرگ رقیب
بود آیا که فلک زین دو سه کاری بکند
حافظا گر نروی از در او هم روزی
گذری بر سرت از گوشه کناری بکند

قەڵــەمی ئێــوە زەمــانێ کە لە من یــاد ئەکات
دڵی ئەم کۆیلە لە بەندی خەفەت ئــازاد ئەکات
قاسیـدی ئێوە کە لا بێ لە بەلا! کوفـرە مەگــەر
شـاد کـا دڵ بە سـلاوێ کە هەموو شـاد ئەکات
سینگی وێرانمـە ئەو گەنجە کە تۆ بۆی ئەگەڕی
خـــاوەنی هــۆش لە وێــرانەوە ئـابـاد ئەکات
خوسـرەوێ لایەقی شیـرینە کە شەرمێ لە وەفای
زامی رووسووری سەری سەروەری فەرهاد ئەکات
نوێژی سەد ســاڵە ســەوابی نیــیە بۆ شام وەکوو
یەک سەعاتێک لە عومری کە بەگەل داد ئەکات
نــازی تازەی رەگی بونیــادمی هێــناوە لە بێــخ
تـا بزانـــم بە کریشمـــەیشی چ بونیـــاد ئەکات
گەوهـــەری پاکی ئەتۆ دوورە لە تاریفـــی قەڵەم
پاخــەسوو چی لە جەماڵێــکی خـوداداد ئەکات
رێـــم نەبــردوون لە شیــراز بە ئــازیــز خـۆشـا
«حافز» ئەو رۆژە هەوای دڵبــەری بەغداد ئەکات
داد و بێــداد چ کەڵکی هەیە «کۆلیل»! کە دۆس
وەکـو دژمن لە دەرون خەنجەری بێــداد ئەکات

کلک مشکین تو روزی که ز ما یاد کند
ببرد اجر دو صد بنده که آزاد کند
قاصد منزل سلمی که سلامت بادش
چه شود گر به سلامی دل ما شاد کند
امتحان کن که بسی گنج مرادت بدهند
گر خرابی چو مرا لطف تو آباد کند
یا رب اندر دل آن خسرو شیرین انداز
که به رحمت گذری بر سر فرهاد کند
شاه را به بود از طاعت صدساله و زهد
قدر یک ساعته عمری که در او داد کند
حالیا عشوه‌ی ناز تو ز بنیادم برد
تا دگرباره حکیمانه چه بنیاد کند
گوهر پاک تو از مدحت ما مستغنی‌ست
فکر مشاطه چه با حسن خداداد کند
ره نبردیم به مقصود خود اندر شیراز
خرم آن روز که حافظ ره بغداد کند

ئاخــۆ کەسێکی وا دەبــێ لوتفــی هـــەواداری بکــات
نەک وەک منی پەیمانشکێن، فرمێسکی دڵ جاری بکات
ئەووەڵ بە ناڵــەی نــاخ و نــەی دڵ پڕ بکا پەیغـامەکەی
ئەمجـا بە جـامێ پڕ لە مـەی سـاقی وەفـاداری بکـات
دڵبــەر کە گیانم سوو لە رێی، کـامی ئەوێن ژەنـراوە لێی
هێشتـــا ئومێـــدم ماوە پێـی رۆژێ کە دڵـــداری بکات
پێـم وت لە کاکـوڵ یەک گـرێ بۆچی بە من وا ناکـرێ
فەرمـوی کە خۆم فەرمـوومە پێ بەم شێـوە تەڕڕاڕی بکات
سەرمەست و رەند و نوکتـەگۆ، بێــژن بە شێخی دەم گورۆ
گوێ کەڕ لە عەشق و هەست و بۆ، تا تەرکی وەشیاری بکات
بۆ من هەژاری بێنیشــان چۆن یاری وەک ئێوەی جووان؟
سوڵتــان چلۆن عیشوەی عەیــان بۆ رەنـدی بازاڕی بکات
ئاســانە بۆم جـەور و ســتـەم لەو زولفـە خەملاوەت بە خەم
زینـدانی پرچی تۆی چ غەم، هەرکەس کە عەییاری بکات
غەم لەشکەری هێــنا سەرم، سووتــاندی بەژن و پەیکـەرم
دڵبـەر مەگەر وەک دوکتـەرم دەرمــان و تیمــاری بکات
«حافـز»! لە مەکری چاوی ئەو خۆ لادە، هــاتوو داوی ئەو
یــانــی کە پـرچــی خــاوی ئەو ناجۆری مۆجــاری بکات
«کۆلیــل»ـی بەژنی دڵبـەرم شاگردی زەخمـی خەنجـەرم
هاومــاڵی بەحری ئەحمـەرم گەر گەوهـەرم یـاری بکات

آن کیست کز روی کرم با ما وفاداری کند
بر جای بدکاری چو من یک‌دم نکوکاری کند
اول به بانگ نای و نی آرد به دل پیغام وی
وآن‌گه به یک پیمانه می با من وفاداری کند
دلبر که جان فرسود از او کام دلم نگشود از او
نومید نتوان بود از او باشد که دلداری کند
گفتم گره نگشوده‌ام زان طره تا من بوده‌ام
گفتا منش فرموده‌ام تا با تو طراری کند
پشمینه‌پوش تندخو از عشق نشنیده‌است بو
از مستی‌اش رمزی بگو تا ترک هشیاری کند
چون من گدای بی‌نشان مشکل بود یاری چنان
سلطان کجا عیش نهان با رند بازاری کند
زان طره‌ی پرپیچ و خم سهل است اگر بینم ستم
از بند و زنجیرش چه غم هرکس که عیاری کند
شد لشکر غم بی‌عدد از بخت می‌خواهم مدد
تا فخر دین عبدالصمد باشد که غمخواری کند
با چشم پرنیرنگ او حافظ مکن آهنگ او
کآن طره‌ی شبرنگ او بسیار طراری کند

سـەروی تەڕی ئێمـە چلـۆن مەیلی چەمـەن وەلا دەنێ
دەس لە ملـی گوڵێ نیـیە و یـادی سەمـەن وەلا دەنـێ
دوێنـە گلەم لە پرچی بوو مەکری دەمی شەکـری ڕژان
ئەو ڕەشـە کەچقـەرارە خۆی ڕەسمی ڕەسـەن وەلا دەنێ
تا دڵـی وێـڵ گێڵـی من ڕۆییـە چیـنی زوڵفـی ئـەو
ئەو سەفـەرەی درێـژە وا عـەزمـی وەتـەن وەلا دەنێ
گوێـی بە گـڕی دڵـی منـی قـاشی برۆی نـەداوە قەت
دەس بە کەوانـە چـاوی و پرچـی کەمـەن وەلا دەنێ
گێـژە سەرم لە سـروە چۆن بۆنی دەمت دەبـا، کەچی
ڕێ گوزەرت لە چـاندنی، میسـکی خـوتەن وەلا دەنێ
زوڵفـی وەنەوشـی وا بـە دەم بـاوە دڵی نەرمـی منیش
بێـت و بە یـادی ئـەو نەبـێ، عەشقـی تەمەن وەلا دەنێ
دڵ بـە دیـاری ڕوومـەتی ڕۆیـی و گیـانمی نەبـرد
گیـان لە هـەواری خزمـەتی، خزمەتی تـەن وەلا دەنێ
کێـیە هەمـوو لەشـی نەکـا چەشنی بلووری مـەی بە دەم
سـاقی ئەگـەر خڵتـە بە دەس سینـە لە بـەن وەلا دەنێ
سـووکـی مەبینـە ئـاوی ڕوم! بێ کـەرەمی سرشکـی من
هـەورە تریشقـە بێ گومـان دوڕڕی عـەدەن وەلا دەنێ
«حافـز»ی پەنـد نەشنـەوا خوێنی بـە نـازی تـۆ ڕژا
مەرگی شیـاوە هەرکـەسێ پیـری سوخـەن وەلا دەنێ
زوڵفی ئەگەر قوبووڵـی کا گۆیە «عومـەر» سەری وەکوو
مێشـی ژیـانی بۆ قـەنی چـاڵی زەقـەن وەلا دەنێ

سرو چمان من چرا میل چمن نمی‌کند

همدم گل نمی‌شود یاد سمن نمی‌کند

دی گله‌ای ز طره‌اش کردم و از سر فسوس

گفت که این سیاه کج گوش به من نمی‌کند

تا دل هرزه‌گرد من رفت به چین زلف او

زان سفر دراز خود عزم وطن نمی‌کند

پیش کمان ابرویش لابه همی‌کنم ولی

گوش کشیده‌است از آن گوش به من نمی‌کند

با همه عطف دامنت آیدم از صبا عجب

کز گذر تو خاک را مشک ختن نمی‌کند

چون ز نسیم می‌شود زلف بنفشه پرشکن

وه که دلم چه یاد از آن عهدشکن نمی‌کند

دل به امید روی او همدم جان نمی‌شود

جان به هوای کوی او خدمت تن نمی‌کند

ساقی سیم ساق من گر همه درد می‌دهد

کیست که تن چو جام می جمله دهن نمی‌کند

دستخوش جفا مکن آب رخم که فیض ابر

بی مدد سرشک من دُرّ عدن نمی‌کند

کشته‌ی غمزه‌ی تو شد حافظ ناشنیده پند

تیغ سزاست هر که را درد سخن نمی‌کند

لە ئەوینـــی مـن و تـۆ بێ‌هـونـەران واق و وڕن
گەوهـــەری من ئەمــە بوو ئێـوە بە چەنـدی دەبڕن؟
مەرکـەزی جەغـزی وجوودن گەلی وەشیـار بەڵام
عەشـق ئەزانێ کە لە ئـەو دایــەرەدا شێت و شڕن
رووـمـــەتی یـار نەتەنیـا لە دییــەم مـانگـەشـەوە
مانـگ و خۆریش بە ئەو ئایـەنە هەر گەرم و گوڕن
عەهـدی ئێمە و شەکەری لێوی بوتان عەقدی خودان
ئێمــە مۆغیـن و ئەمـانەش لە دڵـــی تـار گـڕن
بێ مـەی و موتـریب و بێ فلس و هەوادار و خەمیـن
خەڵکـە! ئەو خەرقـە بە جامێـکی پڕم لـێ بکـڕن
چۆن دەگـا شەمشـە بە خـۆرێ کە لە نێو جامی ئەوا
سـەد وەکوو یۆسفـی میسری لەگەڕی مشت و مڕن
لافی عەشـق و گلــەکردن لە ئەویـن مــافی درۆن
عــاشقانێـکی وەهــا موستەحـەقی قـات و قـڕن
هەر مـــەگەر مەکـتـەبی چـاوی رەشی تۆم فێر بکات
ئەگیـــنا مەستـی و تەقـــوا بە سـەری ئێمــە خـڕن
کـە بە ئارامگـــەی ئـەرواح بـەرێ، بـا نـەفـەست
بۆ نیسـارت سـەری هەستـی بە دەســی خۆ دەبڕن
چ بـو زاهیـد لە قسـەی «حافـز»ی وەشیـار نەگات
دێـو هەر زیـزە لــەوەی سینـگی لە قورئـان پڕن
ئاگـــەیان ئـەر لە دڵـی ئێمـە ببێ دیـدە مەسـان
لە گــرەو گرتنـی بەر مـاڵی فلان سـەرد و سـڕن
دڵی «کۆلیل» ئەگەر سـەوزە بە یـادی گوڵی رووت
لەشـی لاوازی رەش و شینە وەکـوو کێوی (خڕ)ن

در نظربازی ما بی‌خبران حیرانند
من چنینم که نمودم دگر ایشان دانند

عاقلان نقطه‌ی پرگار وجودند ولی
عشق داند که در این دایره سرگردانند

جلوه‌گاه رخ او دیده‌ی من تنها نیست
ماه و خورشید همین آینه می‌گردانند

عهد ما با لب شیرین‌دهنان بست خدا
ما همه بنده و این قوم خداوندانند

مفلسانیم و هوای می و مطرب داریم
آه اگر خرقه‌ی پشمین به گرو نستانند

وصل خورشید به شب‌پرّه‌ی اعمی نرسد
که در آن آینه صاحب‌نظران حیرانند

لاف عشق و گله از یار زهی لاف دروغ
عشقبازان چنین مستحق هجرانند

مگرم چشم سیاه تو بیاموزد کار
ور نه مستوری و مستی همه‌کس نتوانند

گر به نزهتگه ارواح برد بوی تو باد
عقل و جان گوهر هستی به نثار افشانند

زاهد ار رندی حافظ نکند فهم چه شد
دیو بگریزد از آن قوم که قرآن خوانند

گر شوند آگه از اندیشه‌ی ما مغبچگان
بعد از این خرقه‌ی صوفی به گرو نستانند

که یـــاران دادەنیشن، تـۆزی غەمبـاری دەتـۆرێنـن
پەری‌ڕوویـان به چیـنی هەنیـه سەبری دڵ دەشۆرێنن
به فتـراقی جەفـــا هەر دڵ که هەڵـواسن بەری‌نادەن
له سومبـول تـا گرێیـێ باز ئەکـەن سەد دڵ دەخنکێنن
ئەگـــەر ســاتێ لەگەڵما نیشتبێتن دەس بە جێ هەستان
نمـامی ئـارەزوو هـەردەم له دەشتی سیـنه دەڕوێنـن
به گەوهەر نادەن ئەشکی گۆشەگیران، ئەر ببێ دەرکێ
بەڕاسی گەر سەحەرخێـزان بناسن رووم‌ەت ئەنوێنن
له چـاوم لەعلی روممـانی دەبـارێ، پێکـەنن وەختێ
کـه دەڕوانـن لـه چێـرەم رازی دڵـداری ئەدرکێـنن
ئەوانەی مەڵهـەمی زامی ئەویـن ئاسان و سووک ئەگرن
له چـاڵی پووچـەڵی پێچـی خەیـاڵا سەر دەگەوزێنن
وەکـوو مەنسووری سـەردارن کەسـانێ وا له سەر دارن
له پێـی دار و تەنـافی ئێـوە «حافز» بێ‌سـەر و شوێنن
رەقیـبانم به ئاسـانەت نیـاز ئێـنن، که نـاز ئێـنن
لـه تێکـۆشـانی ئـاوا، بـۆ دەوا گێـژن، دەڕاوێنـن
«عومەر» کاتێ تەنـافی پەرچەمی ئێوەی له گـەردن بێ
وەکوو قومـری له خۆشی سومبولستـانت هەر ئەخوێنن

سمـــن‌بویـان غبــار غــم چو بنشینـــند بنشـانند
پری‌رویــان قــرار از دل چو بستیــزند بستـانند
به فتــراک جفــا دل‌هــا چو بربنــدند بربنـدند
ز زلف عنبــرین جــان‌ها چو بگشایند بفشانند
به عمــری یک نفس با مـا چو بنشینند برخیزند
نهــال شوق در خــاطر چو برخیــزند بنشــانند
سرشک گوشه‌گیــران را چو دریابند دُر یابنـد
رخ مهــر از سحرخیــزان نگرداننـد اگر داننـد
ز چشمـم لعل رمـانی چو می‌خندنـد می‌بارنـد
ز رویـم راز پنهـانی چو می‌بینـــند می‌خواننـــد
دوای درد عاشـــق را کسـی کـو سهــل پندارد
ز فکـر آنـان که در تدبیــر درماننــد در ماننـد
چو منصور از مراد آنـــان که بردارنـد بر دارند
بدین درگاه حافـظ را چو می‌خواننـد می‌رانند
در این حضرت چو مشتاقان نیاز آرند ناز آرند
کـه بـا این درد اگر دربنــد درماننــد درماننــد

غولامی نێرگزی مەستت لە تاجدارانن
خراوی ساغەری لێوت لە هۆشیارانن
لە تۆ سەبا، لە من ئەشکی گلار جاسووسە
دەنا کە دلبەر و عاشق لە رازدارانن
لە لابەلای دو زولفت نەزەر کە! کاتێ گوزەر
کە چەن لە راس و چەپت چاوی تەزیەبارانن!
بڕۆ بە چەشنی سەبا! بۆ وەنەوشەزار و بزا
کە دەس‌درێژیی زولفت تەنافی یارانن
بەهەشت بۆ مەیە زاهید نە تۆ، دەزانی بۆچ؟
شیاوی عەفوی خواوەن گوناح‌کارانن
نە هەر ئەمن غەزەلی کولمی تۆ دەلێم و بەس
بوێژی باخی گولت قومری و هەزارانن
دەسی ئەمن مەگەر ئەی خزری خۆش‌قەدەم بگری
کە من پیادەم و یاران هەموو سووارانن
بچن لە مەیکەدە روومەت بە ئەرخەوانی کەن
مەڕۆنە تەکیە کە جێگەی ریا تەبارانن
رەها نەبێ دلی «حافز» لە داوی زولفانت!
کە دیلی داوی ئەتۆ بازی رۆژگارانن
بە لەش «عومەر» وەکو زولفی، خەمین و لوولاوە
بە دڵ مەلوولی قەف و لوولی جووتە مارانن

غلام نرگس مست تو تاجدارانند
خراب باده‌ی لعل تو هوشیارانند
تو را صبا و مرا آب دیده شد غماز
وگرنه عاشق و معشوق رازدارانند
ز زیر زلف دوتا چون گذر کنی بنگر
که از یمین و یسارت چه سوگوارانند
گذار کن چو صبا بر بنفشه‌زار و ببین
که از تطاول زلفت چه بی‌قرارانند
نصیب ماست بهشت ای خداشناس برو
که مستحق کرامت گناهکارانند
نه من بر آن گل عارض غزل‌سرایم و بس
که عندلیب تو از هر طرف هزارانند
تو دستگیر شو ای خضر پی خجسته که من
پیاده می‌روم و همرهان سوارانند
بیا به میکده و چهره ارغوانی کن
مرو به صومعه کآنجا سیاه کارانند
خلاص حافظ از آن زلف تابدار مباد
که بستگان کمند تو رستگارانند

ئاخۆ کەسێ لە گڵ بە نەزەر کیمیا دەکات
لوتفێ بە دڵ لە گۆشەیی چاوێ عەتا دەکات؟
دەردی دەرون وەشارە کە دوکتور بە کەشمە زۆر
خوا چارەسازی کارە، گ دەردێ دەوا دەکات
دلبەر نیقاو پۆشە لە چاوی مە نادیار
هەرکەس بلێ چ رەنگە حەکایەت لە با دەکات
دواڕۆژی خێری هەرکە بە پارێز و هۆش نین
ئەو کارە چاکە، لوتفی ئەوین بۆتی چا دەکات
دڵ شارەزا بە! چونکە لە کاتی هەڕاجی عەشق
ئەهلی نەزەر مامەڵە لە لای ئاشنا دەکات
ئەورۆ لە ژێری پەردەوە زاهید خەریکە، بەس
هەر پەردە هەڵدراوە هەمووکەس رەها دەکات
پۆلاش بەم هەواڵە بکا ناڵە سەیر نین
عاشق شکایەتی دڵی خۆ خۆش ئەدا دەکات
مەی خۆ! کە سەد گونا بە نهێنی لە تاعەتی
سۆفی، گەلێ رەواترە وەختێ ریا دەکات
بۆنی کراسی یوسفی دڵ دێ وەلێ گەلێ
ترسم لە نابرایە تەماحی کەوا دەکات
مەیخانە جێ مەیێلە لەوێ چونکە ئەهلی دڵ
بۆ تۆ تەمەن بە عەشقەوە، سەرفی دوعا دەکات
دوورم لە چاوی پیسی بەغێلان، بە سەرکە! چون
حاتەم کەرەم بە خاتری لوتفی خودا دەکات
«حافز»! هەمیشە رۆژی وەسڵ دەرفەتی نییە
سوڵتان کە کەم نەزەر بە هەژار و گەدا دەکات
دڵخۆشی عەفوی ئێوەیە «کۆلیل» بێ گومان
هەرکەس لە نەسلی ئادەمە بێشک خەتا دەکات

آنـان که خـاک را به نظـر کیمیـا کنـند
آیا بود که گوشـه‌ی چشمی به مـا کنـند
دردم نهفتـه بـه ز طبیـبان مـدعـی
باشـد کـه از خـزانه‌ی غیـبم دوا کنـند
معشـوق چون نقـاب ز رخ در نمی‌کشـد
هـر کس حکـایتی به تصـور چـرا کنند
چون حسن عاقبت نه به رندی و زاهدی‌ست
آن بـه که کـار خود به عنـایت رهـا کنند
بی‌معـرفت مبـاش که در من یزید عشق
اهـل نظـر معـامـله با آشنـا کنـند
حـالی درون پـرده بسـی فتـنه می‌رود
تا آن زمـان که پـرده برافتـد چه‌هـا کنـند
گر سنگ از این حدیث بنـالد عجب مدار
صـاحب‌دلان حکـایت دل خـوش ادا کنند
مـی خور که صد گناه ز اغیـار در حجاب
بهتـر ز طـاعتی که به روی و ریـا کنـند
پیـراهنی که آیـد از او بـوی یوسفـم
ترسـم بـرادران غیـورش قبـا کنـند
بگـذر به کوی میکـده تا زمـره‌ی حضورِ
اوقـات خود ز بهر تو صرف دعـا کنـند
پنهان ز حاسـدان به خودم خوان که منعمان
خیـر نهـان برای رضـای خـدا کنـند
حافـظ دوام وصـل میسـر نمی‌شـود
شـاهان کم التفـات به حـال گـدا کنند

گەر وەها هەر دڵبەری کەن قەشمەران
دین ئەدا بۆ لاتەری شێخی زەمان
شاگوڵی بەژنت لە هەر جێ دەرکەوێ
شانشینی چاوی مەستی شۆخەکان
ئەی بە باڵا وەک سنەوبەر، خۆش بژێ!
بەر لەوەی تیرت جەمۆ کەن بۆ کەوان
عاشقێ حوکمی بە سەر خۆیا نییە
من غوڵامم ئەمری ئێوەم پێ رەوان
وەک دڵۆپێکم لەبەر چاوا نییە
هاتنی تۆفانی نووحی نەوحەخان
بێتە هەڵپەرکێ کە یارم خەڵکی عەرش
تا قیامەت کەف بە تۆقلەی چەپڵەدان
خەڵکی چاوانم شەلاڵی خوێنە خوێن
کەی، لەکوێ؟دژمن دەسی وا داوەشان
خۆش دەساچێنن لەگەڵ غەم ئەهلی دڵ
ئاوری دووری کە بۆ گاور دەوان
«حافز»! هەڵکێشە ئاخی نیوەشەو
جامەکەت با ساف بێ چەشنی بەیان
ناڵە ناڵی دڵ لە ماڵی خاڵی شین
بۆ «عومەر» تا رۆژی مەحشەر کارەبان

شاهـــدان گر دلبـری زین‌سـان کـنـند
زاهـــدان را رخنـــه در ایمـــان کنـــند

هر کجـا آن شـاخ نرگس بشکفـد
گل‌رخـــانش دیـده نرگس‌دان کنند

ای جـوان ســـروقـــد گویـی ببـــر
پیش از آن کز قامتـت چوگان کنند

عاشقـــان را بر سر خود حکـم نیست
هرچـــه فرمـــان تو باشـــد آن کـنـــند

پیش چشمم کمتـر است از قطـره‌ای
این حکـــایت‌ها که از طوفـــان کنند

یـــار ما چـون گیـــرد آغاز سمـــاع
قدسیـان بر عرش دست افشان کنند

مردم چشمـــم به خـون آغشتـه شـد
در کجــا این ظــلم بر انســان کـنـند

خوش بـرآ با غصه‌ای دل کـاهل راز
عیش خـوش در بوته‌ی هجران کنند

سر مکـــش حافـــظ ز آه نیـــم شب
تا چو صبحـــت آینـه رخشـان کـنـند

پێم وت کەیم دو لێو و دەمت شادمان ئەکەن
فەرموی کە کاری واتە، لەگەڵدا بە گیان ئەکەن
پێم وت خەراجی میسرە دەڵێ لێوەکەت، بزەم
فەرموی کە بەم قەرارە دو لێوم زیان ئەکەن
پێم وت کە کێ بە سیفری دەمت رێ دەبا، وتی
ئەم نوختە نەخت و باسی گەلی نوختەزان ئەکەن
پێم وت کە بتپەرس مەبە، را بێ لەگەڵ خودا!
فەرموی لە کۆی ئەوین بە ئەم و ئەو ژیان ئەکەن
پێم وت کە عەشقی مەیکەدە غەم لا دەبا لە دڵ
فەرموی خۆش ئەو کەسانە دەرون کامەران ئەکەن
پێم وت شەراب و خەرقە بە مەزهەب حەرامە خۆ
فەرموی عەمەڵ بە مەکتەبی پیری موغان ئەکەن
پێم وت لە سێوی لێوەکەتی پیر، دەسکەوێ
فەرموی بە ماچ، هانی وەکوو تۆ جووان ئەکەن
پێم وت چ کات خاجە وەوی ماچ ئەکا، وتی
ئەو کاتە مانگ و موشتەری پێکۆ قسان ئەکەن
پێم وت لە ناخی «حافز»ە ویردی دەوامی ئەو
فەرموی مەلەک لە عەرشەوە وەک تۆ بەیان ئەکەن
پێم وت «عومەر» کەویرە، دەرون وشکە بۆ دەمت
فەرموی بەهاری ئێمە، حەز لە مێرگوڵان ئەکەن

گفتم کـی ام دهـان و لبت کامـران کنند
گفتا به چشـم هرچه تو گویی چنان کنـند
گفتم خـراج مصـر طلـب می کنـد لبـت
گفتـا در این معاملـه کمتـر زیـان کنـند
گفتم به نقطـه‌ی دهنت خـود که بـرد راه
گفت این حکایتی‌ست که با نکته‌دان کنـند
گفتم صنـم پرست مشو بـا صمـد نشیـن
گفتـا به کوی عشـق هم این و هم آن کنند
گفتم هـوای میکـده غـم می‌بـرد ز دل
گفتا خوش آن کسان که دلی شادمان کنند
گفتم شراب و خرقـه نه آییـن مذهب است
گفت این عمـل به مذهـب پیـر مغان کنند
گفتم ز لعـل نوش لبـان پیـر را چه سـود
گفتـا به بوسـه‌ی شکـرینش جـوان کنـند
گفتم که خواجه کی به سـر حجلـه می‌رود
گفت آن زمان که مشتری و مه قـران کنند
گفتم دعـای دولـت او ورد حافـظ اَسـت
گفت این دعـا ملایک هفـت آسمـان کنند

واعیــزان بۆچـی بە رۆژا چەشنـی تیشـكی مینـبەرن
شـەو كە دادێ نـازكێشی چاوی مەست و قەشمـەرن
كەس وەلامێـكی نەدامـۆ چی وتم بۆچـی كە شێـخ
تۆبەكـاری زۆرە، خـۆی كەمتـر لە بیـری مەحشەرن
رەنگـە باوەڕیـان نەبێ هەرگیـز بە ڕۆژی داوەری
ئەم دەغـەڵكارانە بۆیـێ چـەت لـە دەغڵـی داوەرن
خـوایە بەم نۆكیسە كـەردارانە سـەرداری نـەدەی!
چونكـە سەرمـەست و خـراوی چەن كەرێكـی نۆكەرن
ئەی هەژاری خانەقـا! مەیخـانە رووگـەی ئارەزوون
چون لەوێ ئـاوێ ئەدەن، خۆش‌تر لە ئاوی كەوسەرن
حوسنی بێ‌پـایـانی ئـەو هەرچـەن دەكـا تالانـی دڵ
غەیبـیانێ وەك پـەری زینـدوو بە لێـوی دڵبـەرن
ئەی مەلەك! سوژدەی ئەوین لازم لە دەركی مەیكەدەن
چـون گڵـی ئـادەم هەویـری عەشقی بادەی ئەحمەرن
دەم بەیـان بەزم و هەرایێ خۆش لە عەرشۆ هاتە گوێم
قودسیـان ئەشعـاری «حافـز»یان لە سینگـا دەفتـەرن
بۆیـە «كۆلیـل» و خەمیـنی تـۆی خـواوەن كـردووم
كـوردەواری با نەڵێـن رۆمـی ئەویـن بێ‌قەیسـەرن

واعظان کاین جلوه در محراب و منبر می‌کنند
چون به خلوت می‌روند آن کار دیگر می‌کنند
مشکلی دارم ز دانشمند مجلس بازپرس
توبه‌فرمایان چرا خود توبه کمتر می‌کنند
گوییا باور نمی‌دارند روز داوری
کاین همه قلب و دغل در کار داور می‌کنند
یا رب این نودولتان را با خر خودشان نشان
کاین همه ناز از غلام ترک و استر می‌کنند
ای گدای خانقه برجه که در دیر مغان
می‌دهند آبی که دل‌ها را توانگر می‌کنند
حسن بی‌پایان او چندان که عاشق می‌کشد
زمره‌ی دیگر به عشق از غیب سر بر می‌کنند
بر در میخانه عشق ای ملک تسبیح گوی
کاندر آن‌جا طینت آدم مخمر می‌کنند
صبحدم از عرش می‌آمد خروشی عقل گفت
قدسیان گویی که شعر حافظ از بر می‌کنند

ئەم دەنگی چەنگ و سـازە دەزانی تەویر ئەکەن
نەدیـار ئەڵێن کە بـادە وەخۆ، مەس ئەسیر ئەکەن
ڕێگـا بە عەشق دەگـرن و تـاڵان ئەکەن دەروون
لاوان بە عەیب سـەرکوت و پیـران زەویر ئەکەن
قەڵبـە و پەتک گ ڕێسی تەشی دەستیانِ و چی
ئێستەش بە مێشکی پووچەڵی خۆ هەر حەریر ئەکەن
ئێـژن نە دەم نە گـوێ بە، لە ڕەمـزی ئەوینی دڵ
حەوخوانە ڕازی ئێمـە، لە یەک خوانی گیر ئەکەن
ژەنـراوە دەرکی دیـدار لە کـۆڕی نەسەق گـران
تـا ئـەو لەوێـوە بۆ مە چ جـۆرێ تەویـر ئەکەن
بێکـار کـاتی پیـری موغـان هـەر هـەدەر ئـەدەن
ئـەم سۆفیـانە سەیـرە کە شـۆخی بە پیـر ئەکەن!
سـەد دڵ بـە یـەک نـەزەر بە غوڵامی دەبێ وەلێ
شـاهێـنی ئەو گـرانی لە حـاسی نەچیـر ئەکـەن
خێڵـێ خەریکی هەوڵـە، هیـلاکی گەییـن بە یـار
عێلێ لە چارەنووسی ئەزەل فیکـر و بیـر ئەکـەن
باوەڕ نەکەی دەخیلـە بە عەهد و بەڵێنـی چـەرخ!
ئـەم کـارخـانە تاکـو هـەتـا بێ، تەغیـر ئەکەن
مەی خـۆوە شێـخ و «حافـز»و دارۆغە چونکـە بۆ
مەکـر و ڕیـا و داوە قسـەی مـاس و شیـر ئەکـەن
«کۆلیل» ئەشا! کە چەرخی فەلەک چۆنە دەورەکەی
بـۆ گێـل چەنـدە سـافە چ لێڵـی بە ژێـر ئەکەن

دانـی که چنگ و عـود چه تقریر می‌کنند
پنهـان خوریـد بـاده که تعـزیر می‌کنـند

نامـوس عشـق و رونـق عشـاق می‌برنـد
عیب جـوان و سرزنـش پیـر می‌کنـند

جز قلب تیـره هیچ نشـد حاصـل و هنوز
باطـل در این خیـال که اکسیـر می‌کنـند

گوینـد رمـز عشق مگوییـد و مشنـوید
مشکـل حکایتی‌ست که تقـریر می‌کنـند

مـا از بـرون در شـده مغـرور صد فـریب
تـا خـود درون پـرده چه تدبیـر می‌کنـند

تشـویش وقت پیـر مغـان می‌دهنـد بـاز
این سالکـان نگـر که چه بـا پیـر می‌کنـند

صد ملک دل به نیـم نظـر می‌توان خریـد
خوبـان در این معـاملـه تقصیر می‌کنـند

قومی به جـد و جهـد نهـادند وصل دوست
قـومـی دگـر حوالـه به تقـدیر می‌کنـند

فی‌الجملـه اعتمـاد مکن بر ثبـات دهـر
کـاین کارخانه‌ای‌ست که تغیـیر می‌کنـند

می خور که شیخ و حافظ و مفتی و محتسب
چون نیـک بنگری همـه تزویـر می‌کنـند

شەراوی خالیس و ساقی دو بەندی خۆش هەدەفن
که هەر بلیمەتی دونیا لە داویان کەنەفن
ئەگەرچی عاشقی مەست و لە ڕێگە لاری منم
هەزار شوکری خودا شارە راسەکەی لە سەفن
جەفا لە ڕێڕەوی دەروێشی ئێوەدا نییە قەت
دە تێکە جامی شەرابت! کە شێخ بێ تەرەفن
بە سووک مەگرە هەژاری ئەوین کە سوڵتانی
بە بێ کڵاو و کەمەربەند و خوسرەوی شەرەفن
لە خۆ بە زێوەر و زەڕ دەرمەچۆ ئەجەل کە بگا
هەزار گەوهەر و دوڕ قیمەتی لەتێ خەزەفن
ڕەوا مەبینە جەفا چون هەموو کەس‌وکارت
دەچن، کە سەڵتەنەتی دڵبەری، بەدەر لە کەفن
غوڵامی هیممەتی ئەو خڵتەنۆشە یەکڕەنگەم
کە لا، لە دڵڕەش و شینپۆشەکانی بێ‌سەدەفن
مەچۆ بە مەیکەدە زاهید! مەگەر بە مەرجی ئەدەب
کە ڕێڕەوانی ئەوێ مەحرەمانی (لا تَخَف)ن
گەلێ گرینگە ئەوین «حافز»! دە سا مەدەدێ
کە عاشقان دەبەسن ڕێ لە هەرکە ناخەلەفن
«عومەر»! هەتا فەلەکی شین دەبێ ئەمانە دەبن
بە زاری رەش لە گەل و گوڵ، لە عەشقی دڵ ئەگەفن

شراب بی‌غش و ساقی خوش دو دام رهند
که زیرکان جهان از کمندشان نرهند

من ار چه عاشقم و رند و مست و نامه سیاه
هزار شکر که یاران شهر بی گنهند

جفا نه پیشه‌ی درویشی‌ست و راهروی
بیار باده که این سالکان نه مرد رهند

مبین حقیر گدایان عشق را کاین قوم
شهان بی کمر و خسروان بی کُلهند

به هوش باش که هنگام باد استغنا
هزار خرمن طاعت به نیم جو ننهند

مکن که کوکبه‌ی دلبری شکسته شود
چو بندگان بگریزند و چاکران بجهند

غلام همت دُردی‌کشان یکرنگم
نه آن گروه که ازرق لباس و دل سیهند

قدم منه به خرابات جز به شرط ادب
که سالکان درش محرمان پادشهند

جناب عشق بلند است همتی حافظ
که عاشقان ره بی‌همتان به خود ندهند

کـــاتی ئاخۆ کەیە مەیخـــانە، سەبـــا! بـــاز کەنۆ
بە لـــەز ئەو کۆلّـــە گرێیـــەم، لە دلاّ بـــاز کەنۆ؟
ئە گـــەر ئەم بەستـــنە بۆ زاهیـــدی خۆبینە، دەبێ
دلّـی هیـــوا بە بەزە و لوتفـی خـــودا بـــاز کەنۆ
بە شقی سینگی گەلی مەستانی سەحەر، زۆر نییە
قوفلّـی ئەو دەرکە بە ئیعجازی دوعا بـــاز کەنۆ
تاســەنامەی رەشی مەستـــانە بنووسن لە شـــەراب
بـــادەنۆشـــان لە گرێ، زولف هەتـــا بـــاز کەنۆ
پەلکەیی چەنگ بە هۆی مەرگی کچی رەز ببڕن
تا حەریفـــان شەتی خوێنین بە چەمـــا بـــاز کەنۆ
ژەندیـــان دەرکی خەرابـــات هەلّـینەگری خـــودا!
کە دوکانی کەرەســـەی فێـــلّ و ریا بـــاز کەنۆ
«حافز»! ئەم خەرقەیە پۆشاتە سبەی دەردەکـــەوێ
کـــە چ خاجێـــکە بە تۆ، بێتو عـــەبا بـــاز کەنۆ
«عومـــەر»! ئەورۆکە درۆ، مەکر و ریا، پڕبـــرەوە
زوو بە زووا! چووکە دوکانێکی وەها بـــاز کەنۆ

بود آیـــا که در میکـــده‌ها بگشاینـــد
گــــره از کــار فروبستـــه‌ی ما بگشایند

اگر از بهـر دل زاهـــد خودبین بستـــند
دل قـــوی دار که از بهر خـدا بگشایند

به صفــای دل رندان صبـوحـی‌زدگـان
بس در بسته به مفتـــاح دعـا بگشـــایند

نامـــه‌ی تعـــزیت دختـــر رز بنویسیـد
تا همـــه مغبچگـــان زلف دوتا بگشایند

گیسوی چنگ ببـرید به مرگ می ناب
تا حریفـان همه خون از مژه‌ها بگشـایند

در میخـــانه ببستـــند خـــدایـــا مپسند
که در خـــانه‌ی تزویـــر و ریا بگشاینـد

حافظ این خرقه که داری تو ببینی فردا
که چه زنّـــار ز زیرش به دَغـــا بگشایند

تەمـەن و دەفتـەری ژینـم لە خەتـی مەی‌دا بوو
پیـــری مەیخـــانە وەهـا مەشقـــمی بۆ دا دابوو
مـەدەدی پیـــری خەرابـاتە بە کۆڕی مەستـــان
ناشـــرینی عەمـــەڵی ئێمـە کە بەو شیـــوا بوو
دەفتەری فەزڵ و هونەر، پاکی بە مەی پاکۆ کەن!
چونــکە ئەو چەرخـە دژی عالەمی دڵزانـا بوو
نمەکی لێو ئەگە جوان‌بینی لە شۆخان بخە دەس!
ئەمە پەنــدی کەسی زانـا، لە ژیـان ئاگـا بوو
دڵ دەســـووڕا وەکـو پەڕگـار بە دەوری خۆیـــا
وە لە ئەو جەغــزەیە سەرگەشتە لە سەر تا پا بوو
بە غەمی یـــارەوە نەیــچی لە هەوایێـکی ئەژەنـد
کە هەموو ژیر و بـزان خوێن لە دییـەی چۆڕابوو
هەر وەکوو گوڵ دەگەشامۆ لە قەراخ و دەمی جۆ
سێــبەری ســەروی تــەڕی تا لە سـەرم باڵا بوو
پیری رووسوور ئەگەرم ئیزنی دەبوو شەرحم ئەدا
دڵـی شیـــن‌پۆش چەنێ پیس لە شـــەو ئاڵا بوو
بە سکــەی رووکــەشی «حافز» نییە رازی، ئازیـز
چون سەبـارەت بە مسـی زێـڕنووێـن بیـــنا بوو
کەی وتـــم لایــەقی تۆ نەختی دڵـی «کۆلیـــل»ـە
من دەڵێــم لاقـەکولـــەم بۆ دییـەنت هێنـــابوو

سالها دفتر ما در گرو صهبا بود
رونق میکده از درس و دعای ما بود
نیکی پیر مغان بین که چو ما بدمستان
هرچه کردیم به چشم کرمش زیبا بود
دفتر دانش ما جمله بشویید به می
که فلک دیدم و در قصد دل دانا بود
از بتان آن طلب ار حسن‌شناسی ای دل
کاین کسی گفت که در علم نظر بینا بود
دل چو پرگار به هر سو دورانی می کرد
واندر آن دایره سرگشته‌ی پابرجا بود
مطرب از درد محبت عملی می‌پرداخت
که حکیمان جهان را مژه خون‌پالا بود
می‌شکفتم ز طرب زان‌که چو گل بر لب جوی
بر سرم سایه‌ی آن سرو سهی‌بالا بود
پیر گلرنگ من اندر حق ازرق پوشان
رخصت خبث نداد ار نه حکایت‌ها بود
قلب اندوده‌ی حافظ بر او خرج نشد
کاین معامل به همه‌ی عیب نهان بینا بود

خۆزگە بەو ڕۆژە نهێنی بە منت بوو نەزەرێ
بوو لە هەنیەم لە ئەوینی خەت و خاڵت ئەسەرێ
خۆزگە بەو ڕۆژە بە چاوی هەڕەشەی تا دەمیکوشت
لێوی عیسا لە دەمی ژینی دەدامێ شەکەرێ
خۆزگە بەو ڕۆژە لە گۆوەندی گوڵ و بوڵبولی دڵ
هەر خودا بوون و من و دڵبەر و بادە و سەحەرێ
خۆش زەمانێ گوڵی کێشابو شەمی ڕوومەتی تۆ
بۆ پەپوولەی دڵی بێباکم و مەشقی هونەرێ
خۆزگە بەو ڕۆژە لە کۆڕی ئەدەب و بووکی حەیا
جێ لە ساغەر نەبو مەستانە کەنینێ لە سەرێ
خۆش زەمانێ لە قەدەح پێدەکەنی کیژی شەراب
بوو لە بەینی من و لێوت بەر و بۆی چەن گوهەرێ
خۆزگە بەو ڕۆژە کە عەزمی سەفەرت بوو لە سەرا
مانگی نۆ دەبوە وزەنگی بە حەزی هەمسەفەرێ
خۆزگە بەو ڕۆژە کە سەرخۆشی دەری مەیکەدە بووم
چم کەم ئەوڕۆ لە مزەوتن، نەبو لەو جێ خەبەرێ
خۆزگە بەو ڕۆژە کە «حافز» بە سەلیقەی دڵی تۆ
گەوهەری شیعری لە چاوانە دەهێنایە دەرێ
خۆزگە دووبارە لە پای (کوچکە موراد)ا «عومەر»ت
بە خەویش ئەر بووە دەیبوو لە جەماڵت نەزەرێ

یـــاد باد آن‌کـــه نهـــانت نظـــری با مـــا بود
رقـــم مهـــر تو بر چهـــره‌ی مـا پیـــدا بود
یـــاد باد آن‌که چو چشمت به عتابم می‌کشت
معجـــز عیسویـــت در لب شکـــرخـــا بـود
یـــاد باد آن‌که صبـوحی زده در مجلس انس
جـــز مـــن و یـــار نبـودیم و خـــدا با ما بود
یـــاد باد آن‌که رخت شمع طرب می‌افروخت
ویـن دل سوختـــه پروانـــه‌ی نـــاپروا بـود
یـــاد باد آن‌که در آن بزمگـــه خلـق و ادب
آن‌کـــه او خنـــده‌ی مستـــانه زدی صهبا بود
یـــاد باد آن که چو یاقوت قـدح خنده زدی
در میـــان مـن و لعـل تـو حکـــایت‌ها بـود
یـــاد باد آن‌کـه نگـــارم چو کمـــر بـربستی
در رکـــابش مـه نـو پیـک جهـــان‌پیمـــا بود
یـــاد باد آن‌کـه خرابـــات‌نشیـن بودم و مست
وآن‌چه در مسجـدم امروز کم است آن‌جا بود
یـــاد باد آن‌که به اصـــلاح شمـــا می‌شد راست
نظـــم هـــر گوهـــر ناسفتـــه که حافـــظ را بود

تا لە بەینــی دڵ و مەیخــانە و مــەی مــاوە ژووان
ســەری تەعزیمی من و خاکی دەری پیــری موغـان
حەڵقە لە گوێی هەوەڵین ڕۆژی ئەوم، ئێستەش ئەڵێم
لە ســەر ئەو باوەڕە تـا ڕۆژی حەشــر دێمـە مەیـان
کە بە گڵکۆی ئەمنت بوو گــوزەرێ رووٚکــە لە دڵ!
چونکە کـابەی گەلـی ڕەنـدانە لە سەر تۆپی جەهــان
وس بە ئەی زاهیدی زل کوێر و نەسەق زل! چ دەڵێی
لەشـی بێــدڵ خەبــەری چۆنە لە بێ نـام و نیشــان
جوانی عاشق کوژم ئەوڕۆکە روخی مەستی نووانــد
تــا بزانیــن لە چــاوی چ کەســێ خوێنــە ڕەوان
چاوم ئەو کــاتە بە عەشقت کە لە گــۆڕایە ســەری
تـا دەمی ڕۆژی قیــامەت بە تەمــایە و نیگــەران
بەختی «حافــز» کە بە ئەم شێــوە بکا کۆمــەکی دڵ
زولفـی دڵبــەر دەشنێــتۆ بە هەنــاسەی دیگــەران
مەکتەبی زولفی رەشی تۆی بە دڵــە، بۆیە «عومــەر»
عاشقــێ کەوتــە لە بــەر پێــتە هەتا ڕۆژی نەمــان

تا ز میخانه و می نام و نشان خواهد بود
سر ما خاک ره پیر مغان خواهد بود
حلقه‌ی پیر مغان از ازلم در گوش است
بر همانیم که بودیم و همان خواهد بود
بر سر تربت ما چون گذری همت خواه
که زیارتگه رندان جهان خواهد بود
برو ای زاهد خودبین که ز چشم من و تو
راز این پرده نهان است و نهان خواهد بود
ترک عاشق‌کش من مست برون رفت امروز
تا دگر خون که از دیده روان خواهد بود
چشمم آن دم که ز شوق تو نهد سر به لحد
تا دم صبح قیامت نگران خواهد بود
بخت حافظ گر از این گونه مدد خواهد کرد
زلف معشوقه به دست دگران خواهد بود

مەیلی جـــارانت بە یـــاران ســـەر لە ئەوڕۆ ســـەرتـروو
شـــۆرەتی لوتفـت لەگەڵـــمانا گەلـێ مەحشـــەرتـروو
باســی دڵـــداری لە کـــۆڕی عاشقـــان یادی بەخێـــر
خۆزگە بەو کاتـــەی کە لێـوت پڕ قەن و شەککەرتروو
بەر لـــەوەی ئەم میچـە سەوز و شیـــنە راکێشن لە ژوور
چـــاوی من تـــاقی برۆی گیـــانانی خۆش مەنـزەرتـروو
هەر هـەوەڵ ڕۆژی ئـەزەڵ تا دواشـــەوی ژینگەی ئەبەد
خۆشـــەویستیی یـــار و پەیمـــان و بەڵێـن سەروەرتروو
سێـــبەری دڵبـــەر کە چەتری کەوتە سەر عاشق چ بوو
ئەو لە دیـــوانی غەزەڵـــدا چون لە ئەم هۆنـــەرتـروو
گەرچـی تالآنـی دڵ و دینـــی دەکـــردم چـــاوی یـــار
بـــاز من وەسفـی خـــدەی جوانـی ئەوم پێ ســـەرتروو
نوکتـــەیێکی پێ وتـــم شێـــتێ لە بەر ئـــەرکی شەهـــا
چوومـە سەر هەر سفـــرەیێ دیم خوانی خوایی بەرتروو
گەرچی تەزوێـحت چـــراوۆ زاهیـــدا بمبـــوورە! چون
دەستی مەیگێـــرم لە دەس بوو، ئەو لە تۆ قەشمـــەرتروو
گەر شەوی قەدرم سەحەر، نۆشیوە مەی مەنعم مەکـەن!
یـــاری مەستـــم حـــازر و جامێـــکی مـەی حازرتروو
شیعـــری «حافز» ئەودەمـــەی ئادەم بەهەشتـــی پێ درا
بۆ گـــوڵ و نەســـرین لە ســـروەی بەربـــەیان یـاوەرتروو
(ئەشعـەری) شەرحی ئوسووڵی مەتنـــی بالآتـی نەکـرد
گەنجول‌ئەشعاری «عومـــەر» لەو بەژنـەدا ئەشعـــەرتروو

پیش از اینت بیش از این اندیشه‌ی عشاق بود
مهرورزی تو با ما شهره‌ی آفاق بود
یاد باد آن صحبت شب‌ها که با نوشین‌لبان
بحث سرّ عشق و ذکر حلقه‌ی عشاق بود
پیش از این کاین سقف سبز و طاق مینا برکشند
منظر چشم مرا ابروی جانان طاق بود
از دم صبح ازل تا آخر شام ابد
دوستی و مهر بر یک عهد و یک میثاق بود
سایه‌ی معشوق اگر افتاد بر عاشق چه شد
ما به او محتاج بودیم او به ما مشتاق بود
حسن مه‌رویان مجلس گرچه دل می‌برد و دین
بحث ما در لطف طبع و خوبی اخلاق بود
بر در شاهم گدایی نکته‌ای در کار کرد
گفت بر هر خوان که بنشستم خدا رزاق بود
رشته‌ی تسبیح اگر بگسست معذورم بدار
دستم اندر دامن ساقی سیمین ساق بود
در شب قدر ار صبوحی کرده‌ام عیبم مکن
سرخوش آمد یار و جامی بر کنار طاق بود
شعر حافظ در زمان آدم اندر باغ خلد
دفتر نسرین و گل را زینت اوراق بود

خۆزگــە بەو ڕۆژە لە کۆی ئێــوە دڵــم حاسڵــی بوو
چــاو بە سورمە و کلی ژێر پــاتەوە نووری دڵــی بوو
بێ‌ریا، پاک، بەهۆی هەمدەمی وەک سۆسەن و گوڵ
لە دڵــت چــی بــو، لەســەر زاری ئەمــن مەنــزڵی بوو
کە قســەی عەقڵــی دەگێــڕایەوە دڵ بۆ ئــەم و ئــەو
کۆمەکی عەشقی لەبەر بوو ئەگە خۆی موشکڵی بوو
دەس‌درێــژی فەلــەک و تۆڕ و کەڵــەک پڕ لە دڵــم
وەی لە ئەو حەســـرەتە بۆ کۆڕ و گــەلی عاقڵــی بوو
دڵ بەڵێنــی بە ژیـــان دابــو کە بێ‌دۆس نــەژێت
چی‌دەکـــرێ کە خەبـــاتی مــن و دڵ مێملــی بوو
دوێنــەشەو چوومە خەرابات بەهــۆی چاوت و دیم
کووپە مــەی پا لە گــڵ و خوێنــی دڵی مۆکڵــی بوو
فــرە داچــوم کە بزانــم چیــیە هــۆی ئێشــی فیـــراق
ســـەری زانـــا بە نەزانیـــن نــەزەرێ کاملـــی بوو
کلکــەوانەی دەســی پیـــرۆزەیی پیــرۆزی ئــەوین
خۆش درەوشــایەوە ئەممــا تەمـــەنی شــاگوڵی بوو
دیتــە قەسپــەی کەوی دەنگ‌خۆش و خەرامان چلۆن
«خاجــە»! پەنجــەی دڕی شاهێنی بــەلا ماتڵــی بوو؟!
بەختــی «کۆلیـــل» دەبێ دەس لە ملــی مەیلــی نەبێ
ئەو کە بەژنێ کەڵەگەت ئەم قەد و دەستێ کوڵی بوو

یاد باد آن‌که سر کوی توام منزل بود
دیده را روشنی از خاک درت حاصل بود

راست چون سوسن و گل از اثر صحبت پاک
بر زبان بود مرا آن‌چه تو را در دل بود

دل چو از پیر خرد نقل معانی می‌کرد
عشق می‌گفت به شرح آن‌چه بر او مشکل بود

آه از آن جور و تطاول که در این دامگه است
آه از آن سوز و نیازی که در آن محفل بود

در دلم بود که بی‌دوست نباشم هرگز
چه توان کرد که سعی من و دل باطل بود

دوش بر یاد حریفان به خرابات شدم
خم می دیدم خون در دل و پا در گل بود

بس بگشتم که بپرسم سبب درد فراق
مفتی عقل در این مسئله لایعقل بود

راستی خاتم فیروزه‌ی بواسحاقی
خوش درخشید ولی دولت مستعجل بود

دیدی آن قهقهه‌ی کبک خرامان حافظ
که ز سرپنجه‌ی شاهین قضا غافل بود

دڵ بلووقی سەفـــەری عەشقـــی لە پێـــدا چەمـەرە
جەوری تۆشی کە لە سـەر بێ لە وزەی ئەو بەدەرە
نە جەفـــــاشێـوەیە لێـوت نە شیــاوی دەمی تـۆن
ئەو شتـــانەی کە لە رێبـــازی وەفـــادا خەتـــەرە
سپی ئەو چـــاوە کە گریانی ئەوین کوێـری نەکا
شەوەزەنگ ئەو دڵە خاڵی لە شەمی عەشقی سەرە!
سێــبەری زولفی رەشـی دەوڵەت و سامانە لە سەر
قـــەل و قـــالاو لە شـــاباڵی هومـــا بێخەبـــەرە
مەکە لۆمـــەم! لەوە هـــاتوومەتە کۆی پیری موغان
خانـــەقا، شێخ دەڵـێ پڕ لە سـەری بێسـەمەرە
دڵی پـاکت کە نەبێ کـــابە و بوتـــخانە یەکـن
بەرەکـــەت نیـــن لە دڵێکـــا چەپەڵ و کەچنـەزەرە
«حافز»! ئەورۆکە لەسەر تەختی، لە ئەرکی حـەرەما
تاجـی عیلم و ئەدەبت چون وەکو شاهان لە سـەرە
هونـەر ئێستـاکە لە کـۆی بێهونـەران وا لە گرێو
بۆیە «کۆلیـل»ـی هونەرمـەندی سەقـز بێهونـەرە

خستگان را چو طلب باشد و قوت نبود
گر تو بیداد کنی شرط مروت نبود
ما جفا از تو ندیدیم و تو خود نپسندی
آن‌چه در مذهب ارباب طریقت نبود
خیره آن دیده که آبش نبرد گریه‌ی عشق
تیره آن دل که در او شمع محبت نبود
دولت از مرغ همایون طلب و سایه‌ی او
زان‌که با زاغ و زغن شهپر دولت نبود
گر مدد خواستم از پیر مغان عیب مکن
شیخ ما گفت که در صومعه همت نبود
چون طهارت نبود کعبه و بتخانه یکی‌ست
نبود خیر در آن خانه که عصمت نبود
حافظا علم و ادب ورز که در مجلس شاه
هر که را نیست ادب لایق صحبت نبود

کوشتنی گیانی شەکەت قسمەتی شەوتیری نەبوو
دڵی بێمیهری دەنا رەحمی بە نێچیری نەبوو
چۆن لە زەنجیرەیی زولفت منی شەیدا وەدەرێم
کە وەک ئەو پەرچەمە شێتێ غوڵ و زەنجیری نەبوو
خوایە ئەو گەوهەری ئاوێنەیی روخسارییە چین
کە لەوا هەوری هەناسەم دەمی تەئسیری نەبوو
مەکە مەنعم کە لە مزگەوتەوە بۆ مەیکەدە چووم!
چون شناسا بە دەمی ئێوە، ئەوێ پیری نەبوو
نازەنینتر لە چەمەن گوڵ وەکو بەژنت نەڕووا
نەمەکینتر وەکو تۆ، ژینگە لە تەسویری نەبوو
تا هەمیسان وەکو سروەت سەحەرێ بێمە حوزوور
دوێنەشەو سینە مەگەرناڵەیی شەوگیری نەبوو
سۆزت ئەی ئاوری هیجران! لە دڵم ئەونە جەمە
غەیری سووتانی وەکوو شەم سەری تەدبیری نەبوو
ئایەتێ بوو غەمی تۆ، بۆ دڵی «حافز» لە غەزەب
ئەوکەسەی دیتمی ئەڵبەتتە کە تەفسیری نەبوو
دڵی ئاوارەیی «کۆلیل» ئەوەن خوێنی رژاند
دەستی لوقمانی غەزەڵ قودرەتی تەعمیری نەبوو

قتل این خسته به شمشیر تو تقدیر نبود
ور نه هیچ از دل بی‌رحم تو تقصیر نبود
من دیوانه چو زلف تو رها می کردم
هیچ لایق‌ترم از حلقه‌ی زنجیر نبود
یا رب این آینه‌ی حسن چه جوهر دارد
که در او آه مرا قوت تأثیر نبود
سر ز حسرت به در میکده‌ها بر گردم
چون شناسای تو در صومعه یک پیر نبود
نازنین‌تر ز قدت در چمن ناز نرست
خوش‌تر از نقش تو در عالم تصویر نبود
تا مگر همچو صبا باز به کوی تو رسم
حاصلم دوش بجز ناله‌ی شبگیر نبود
آن کشیدم ز تو ای آتش هجران که چو شمع
جز فنای خودم از دست تو تدبیر نبود
آیتی بود عذاب انده حافظ بی تو
که بر هیچ کسش حاجت تفسیر نبود

باسی کۆڕی شەوی پێشوو بە خەمی مووتەوە بوو
تا دڵی شەو قسە لەرزانە بە گێسووتەوە بوو
شەتی خوێنینی مژۆڵت لە دڵم کرد و کەچی
دڵ لە نێو ماڵی کەوان، تاقی برۆی جووتەوە بوو
سروە خوا کۆمەکی خێری! کە لە کۆی دۆسەوە هات
غەیری ئەو هەر کەسی‌تر قوفڵی بە یاقووتەوە بوو
خەبەرێکی نەبو دونیا لە شەڕ و شۆڕی ئەوین
شەڕی عالەم بە کریشمەی گوڵی جادووتەوە بوو
دڵی ئاوارە بەدەر بوو لە گەڕی بەند و کەمەن
داوی رێگەی بە گرێی پەرچەمی هێندووتەوە بوو
هاتە دەر دڵ لە قەفەس، دوگمە ترازا لە کەوات
ئاخر ئەو گیانی بە کۆی سینگی سپی و رووتەوە بوو
وەرە سەر توربەتی «حافز» بە بەڵێنێکی کە دات
چونکە تا مەرگی بە ئاواتی گوڵی رووتەوە بوو
خەو بە چاوی دڵی «کۆلیل» نەچوو قەت لە ژیان
رۆژ و شەو هۆشی بە دوو چاوی خەواڵووتەوە بوو

دوش در حلقه‌ی ما قصه‌ی گیسوی تو بود

تا دل شب سخن از سلسله‌ی موی تو بود

دل که از ناوک مژگان تو در خون می گشت

باز مشتاق کمانخانه‌ی ابروی تو بود

هم عفاالله صبا کز تو پیامی می‌داد

ور نه در کس نرسیدیم که از کوی تو بود

عالم از شور و شر عشق خبر هیچ نداشت

فتنه‌انگیز جهان غمزه‌ی جادوی تو بود

من سرگشته هم از اهل سلامت بودم

دام راهم شکن طرّه‌ی هندوی تو بود

بگشا بند قبا تا بگشاید دل من

که گشادی که مرا بود ز پهلوی تو بود

به وفای تو که بر تربت حافظ بگذر

کز جهان می‌شد و در آرزوی روی تو بود

دوێنەشـــەو زیز دەهـــات و رقی هەستـا بوو ئەویـن
خوایــە لە کوێی‌تری گڕ دابـو دڵێ زار و غەمیــن!
ڕەمزی ئاشـــق کوژی و ڕەسمی شلێــژاندنی شـــار
پڕ بە بەژنی ئـەوی دوورانــدبو خەییـاتی بەریـن
گوڵی دابوو بە شـەمی ڕوومەتی، پێی وآبوو هەمـوو
ئێمـە ئەسپـەننەری سەر ئاگـری ڕوخســاری ئەوین
هەرچـەن ئەیوت بە ڕواڵــەت کە بە زارت دەکـوژم
نـەزەرێکـــی لە دڵـــۆ بـوو بە دڵــی پڕ لە بریـــن
ڕێی بە دین گرتبوو زولفی شەوی ئەو دڵڕەقـە وەك
هەڵێـــگرسانبو سکڵ و گـڕی سـەر کولمی بەتیـن
دڵ گەلێ خوێنی دەسێـنابـو، دییـەم پـــاکی ڕژانـد!
خوایــە کێ کـردی و کێ بردی لە سەر تۆپی زەمین!
یـــار مەفـــرۆشە بە دینـــار کە قـــازانجی نەکـرد
یۆسفـی ئەو کەسـە گـۆڕاوە بە قۆشـەی حەڵـەبین
خــۆش بە «حافز» وتی ئەم خەرقــە بڕۆ گڕ بـدە زووا!
ئەم دەغــەڵناسییە چۆن فێــر بووە یاڕەب گوڵی ژین
زێـــڕی ناخــالیسی ئەم خێـــڵە بەغێـــڵەش بە منـــن
بۆیە «کۆلیـــل»ـم و جێمـــاو لە عێـلی مـەم و زیـن

دوش می‌آمد و رخساره برافروخته بود
تا کجا باز دل غمزده‌ای سوخته بود
رسم عاشق کشی و شیوه‌ی شهرآشوبی
جامه‌ای بود که بر قامت او دوخته بود
جان عشاق سپند رخ خود می‌دانست
و آتش چهره بدین کار برافروخته بود
گرچه می‌گفت که زارت بکشم می‌دیدم
که نهانش نظری با من دل‌سوخته بود
کفر زلفش ره دین می‌زد و آن سنگین‌دل
در پی‌اش مشعلی از چهره برافروخته بود
دل بسی خون به کف آورد ولی دیده بریخت
الله الله که تلف کرد و که اندوخته بود
یار مفروش به دنیا که بسی سود نکرد
آن که یوسف به زر ناسره بفروخته بود
گفت و خوش گفت برو خرقه بسوزان حافظ
یا رب این قلب‌شناسی ز که آموخته بود

یەک دو جـــامێکم بەیـــانی دوێنـــە بۆ ڕێ کەوتبـــوو
وەک شـــەرابی لێـــوی ساقیـــم پڕ بە دڵ پێ کەوتبـــوو
دڵبـــەری گەنجـی بە مەستی ئارەزوم بوو وەرگەڕێ
چون تەڵاقـی سێ بـــەسێ بوو تـازە هەر سێ کەوتبوو
هـــەر مەقـــامێکم لە عەشقـــا پشکنیـــبێ عاقیـــبەت
دیـــم لە دەرکی هەر دڵێـــکا یەک مـەراقێ کەوتبوو
ڕێـــڕەوی عەشقـــم، پەیاپەی بێـــنە ساقی جامەکەت!
هەرکە عاشـــق بوو بە دەم، لەم ڕێگە بێ پێ کەوتبوو
خۆش خەوێکم دیوە شەو، مزگێنیێ ئەی خەوبژێـر!
دیـم کە ڕۆژی ڕون لەگەڵما هـاودراوسێ کەوتبوو
هەرچی هەوڵـمـــدا لە دەستی چـاوی بچمە گۆشەیێ
تاقـــەتی سەبـــرم لە ســـەر تـــاقی برۆی جـێ کەوتبوو
خـــاوەنی شان و شکۆی دین، گەر نەبوو با شاهـی من
کـــاری ئاییـــن و وڵات ئاخـــۆ بـەرەو کـوێ کەوتبوو
ئەو دەمـــەی «حافز» کە شیعـــری وا پەرێشانی دەوت
بـــاڵی ئەفکـــاری بە داوی ئـــارەزوو تێـــکەوتبوو
هۆشی کاڵ و کرچی من «کۆلیل»ـی پرچی کاڵی بوو
چونکە دڵ زووتر بە جەغزی زولفی کاڵـێ کەوتبوو

یک دو جامم دی سحرگه اتفاق افتاده بود
وز لب ساقی شرابم در مذاق افتاده بود

از سر مستی دگر با شاهد عهد شباب
رجعتی می‌خواستم لیکن طلاق افتاده بود

در مقامات طریقت هر کجا کردیم سیر
عافیت را با نظربازی فراق افتاده بود

ساقیا جام دمادم ده که در سیر طریق
هر که عاشق وش نیامد در نفاق افتاده بود

ای معبر مژده‌ای فرما که دوشم آفتاب
در شکرخواب صبوحی هم وثاق افتاده بود

نقش می‌بستم که گیرم گوشه‌ای زان چشم مست
طاقت و صبر از خم ابروش طاق افتاده بود

گر نکردی نصرت دین شاه یحیی از کرم
کار ملک و دین ز نظم و اتّساق افتاده بود

حافظ آن ساعت که این نظم پریشان می‌نوشت
طایر فکرش به دام اشتیاق افتاده بود

ئێستەش ئەو دڵمە شەمی عەشقی نەهانێکە کەبوو
سینە سەندووقی حەز و میهری جووانێکە کە بوو
عاشقی ئێوە لە پاکانی ئەمانەتداره
چاو بە فرمێسک و دەرون پڕ لە غەمانێکە کە بوو
هەر سەبا شایەتە بۆ ئێمە کە شەو تا بە سەحەر
عەتری زولفت نەفەس و هاودەمی گیانێکە کە بوو
لەعل و گەوهەر نییە کڕیاری، دەنا خۆر وەکو خۆی
لە گەروی بەردی ڕەقا گەوهەرە کانێکە کە بوو
دیتنی لازمە کوژراوی کریشمەت، وەرە چون
دڵی بێچارە هەمان دڵنیگەرانێکە کە بوو
ڕەنگی خوێنی گەشی ئێمەی دەسڕی یار، بەڵام
وەکو جاران لە گوڵی لێوی، نیشانێکە کە بوو
وتم ئیتر نییە چاوی ڕەشی ڕێگر بە کەسێ
ساڵەها ڕۆیی و ئەو دەس بە کەوانێکە کە بوو
«حافز»!! بێژە کە فرمێسکی ڕەوانت لە چییە
تا بزانن کە هەر ئەو ئاوی ڕەوانێکە کە بوو
دڵی بێژنگ وەکوو سینەیی «کۆلیل» نەبێ
تیری برژانگی هەر ئەو نووکە سەنانێکە کە بوو

گوهر مخزن اسرار همان است که بود
حقه‌ی مهر بدان مهر و نشان است که بود
عاشقان زمره‌ی ارباب امانت باشند
لاجرم چشم گهربار همان است که بود
از صبا پرس که ما را همه شب تا دم صبح
بوی زلف تو همان مونس جان است که بود
طالب لعل و گهر نیست وگرنه خورشید
همچنان در عمل معدن و کان است که بود
کشته‌ی غمزه‌ی خود را به زیارت دریاب
زآن‌که بیچاره همان دل‌نگران است که بود
رنگ خون دل ما را که نهان می‌داری
همچنان در لب لعل تو عیان است که بود
زلف هندوی تو گفتم که دگر ره نزنند
سال‌ها رفت و بدان سیرت و سان است که بود
حافظا بازنما قصه‌ی خونابه‌ی چشم
که بر این چشمه همان آب روان است که بود

دیتــم خەوێکی خۆش کە لە دەستم پیێــاڵە بوو
یەعنی کە کــاری ئێمـــە بە چـاوت حـەواڵە بوو
چـل ساڵــــە رەنج و دەردی ئەچێــژین و عاقیبەت
دەرمـــانی دڵ بە شووشــە شەرابــی دە ســاڵە بوو
نامــەی مورادی سیـــنە لە بەختــم کە بوو رجـــا
زانیـــم لە کاکـولّی رەش و زولفـــی قەبـاڵە بوو
کــاتی سەحەر خومـاری خەفەت وەختە بمکوژێ
شــەنسم لەگەڵ بـو ئەو دەمــە مەی پڕ پیێـاڵە بوو
هەرکـەس نمـــامی عەشـق و ئەوینی نەبوو لە دڵ
وەک بــا رەشــی خــەزان و جەنــابی هەڵاڵە بوو
بۆیــێ لە ئەرکی مەیکەدە هەر خوێن ئەخۆم مودام
سفـــرەی قـــەدەر بڵاوە قــەزام ئەم نەواڵــە بوو
کــازێوە دەم بو چوومـە چەمـــەن، ئەو دەمـــانە وا
مورغی سەحـەر بە تاســەوە سـەرگەرمی نــاڵە بوو
دەیوت چ تەبعــی دڵــگرە «حافــز» لە وەسفی شــا
هەر تەک خەتێکی ئەم غـەزەلەی سەد ریساڵە بوو
ئەو یـــارە شــاسوارە کە شێــری فەلەک لـە لای
رۆژی نەبــەرد و هەڵـمــەتی بەرخــێ منــاڵە بوو
شیعری «عومەر» لەگەڵ سەحەری روومەتی، یەکێ
مانگــی پڕ و ئــەوی کە، لە دەوری بە هاڵـــە بوو

دیدم به خواب خوش که به دستم پیاله بود
تعبیر رفت و کار به دولت حواله بود
چهل سال رنج و غصه کشیدیم و عاقبت
تدبیر ما به دست شراب دوساله بود
آن نافه‌ی مراد که می‌خواستم ز بخت
در چین زلف آن بت مشکین کلاله بود
از دست برده بود خمار غمم سحر
دولت مساعد آمد و می در پیاله بود
بر آستان میکده خون می‌خورم مدام
روزی ما ز خوان قدر این نواله بود
هر کو نکاشت مهر و ز خوبی گلی نچید
در رهگذار باد نگهبان لاله بود
بر طرف گلشنم گذر افتاد وقت صبح
آن دم که کار مرغ سحر آه و ناله بود
دیدیم شعر دلکش حافظ به مدح شاه
یک بیت از این قصیده به از صد رساله بود
آن شاه تندحمله که خورشید شیرگیر
پیشش به روز معرکه کمتر غزاله بود

لە ئەرکی مەیکەدە یـــارەب سەحەر چ مەشغەڵە بوو
نیگـــار و ســاقی و شەمــدان و شــەم لە مــامەڵە بوو
کەلامــی گیـانە ئەوینــم، نە حــەرف و بــاس بە زار
فەقــەت بە ئۆفــێ دەف و نەی نیــاز و کەڵکەڵە بوو
بەیـانی کــۆڕی جنـــون سـەر لە دەرسی مەدرەسەیە
نە قیـل و قــاڵی فەقێــن و نە مەشقــی تەشقـەڵە بوو
دڵـم بە غەمـــــزەیی ســـاقی کەمــێ کــراوە بەلاّم
لە بەختــی ناحــەزە فیکـری گلــەم لە سەر جەڵە بوو
هەزار و یەك ســـەری وەك سامری لە مێگەلی تۆن
شــووانی ساحـری چــاوت گەلێـکی سیســەڵە بوو
وتــم حەواڵــە کە ماچــێ لە لێـــوی گوڵ بە دەمت
کەنـی وتـی لەگەڵـت کـەی وەهــامە مـامــەڵـە بوو
شوکور هەســارەیی بەختــم هەڵاتبـوو شــەوی پێش
لە بەینـــی مانگــی پڕ و روومــەتت موقـــابەڵە بوو
دەمـی نیگــار کە دەرمـــانی دەردی «حافــز»ە دادا!
لە کـاتی لوتف و سەخاوەت، چ تەنگ حەوسەڵە بوو
بە مانگی یەکشـــەوە «کۆلیـل» ئەگەر بڵێ چ خەمی!
دەڵــێ بە حوکمــی بـرۆی ئەو نمــامە سـەوزەڵە بوو

به کوی میکده یا رب سحر چه مشغله بود
که جوش شاهد و ساقی و شمع و مشعله بود

حدیث عشق که از حرف و صوت مستغنی‌ست
به ناله‌ی دف و نی در خروش و ولوله بود

مباحثی که در آن مجلس جنون می‌رفت
ورای مدرسه و قال و قیل مسئله بود

دل از کرشمه‌ی ساقی به شکر بود ولی
ز نامساعدی بختش اندکی گله بود

قیاس کردم و آن چشم جادوانه‌ی مست
هزار ساحر چون سامریش در گله بود

بگفتمش به لبم بوسه‌ای حوالت کن
به خنده گفت کی‌ات با من این معامله بود

ز اخترم نظری سعد در ره است که دوش
میان ماه و رخ یار من مقابله بود

دهان یار که درمان درد حافظ داشت
فغان که وقت مروت چه تنگ حوصله بود

ئەو یـــارە کە مەنـــزڵ بە ئـەوم، مـــاڵە پـــەری بوو
بێ‌خـەوش سـەراپـا لە هەمـــوو عەیب بـەری بوو
دڵ مـــایەوە لەم شـــارە کە بـۆی بەژنـــی بنۆشـێ
بێـــچارە دڵـــی ئێمــە کە یـــاری سەفـــەری بوو
نەک هــەر لە دڵی من فەلــەک ئەو پـەردەیە لادا
ئەم چەرخــە لە بەر پــەردەدڕی و فیتـنەگەری بوو
مەحبـــووبی مـن ئـەو دڵبـــەرە زانـــایە کە بـەژنی
ســـەروی تەڕ و ڕۆشـن سـەر و حوسنی نەزەری بوو
ئیقبـــاڵی شـــەڕم بوو، کە لە دەس مانگی دەرێنـــام
دەورانـــە! کـە وا دەوڵــەتی بەختـم قەمـــەری بوو
هەی‌هەی لە دڵی دەرکە گـەدا! شـا کە لە موڵکی
حوسنـا کەمـەری زێـڕ و زەڕین تاجی، سەری بوو
ڕۆژانی خۆش ئەو کـاتە، لەگەڵ ئێـوە بەسـەر چوو
باقـــی تەمــەنم پووچ، هەمـــوو بێ‌خەبـــەری بوو
خۆش بوو لە کەناری گوڵ و نەسرین و خـوڕەی ئاو
هـــاوار کە ئـەو گەنجـە ڕەوانـــەم سپـــەری بوو
بولبـــول وەرە مەخوێنـــە ئەدی، بمـــرە لە داخـــا!
گوڵ زولفـی پەرێشـانی بە ســروەی سەحەری بوو
هەر گەنجـــی مورادێکـی خـودا بەخشییە «حافز»
ویردی سەحـــەر و زیکـری شـەوانەی، ئەسەری بوو
ئەو شـــانە کە ئـەو پەرچـــەم و ئەگریجـــەیە دادا
شیعـر و قەڵەمی کـوردی و عەشقی «عومەر»ی بوو

آن یـــار کز او خـــانه‌ی ما جـای پـری بود
سر تـــا قدمش چون پـری از عیب بـری بود
دل گفت فـــرو کش کنم این شهـر به بویش
بیچـــاره نـدانست که یـــارش سفـری بود
تنهـــا نه ز راز دل مـــن پــــرده برافتــــاد
تـــا بود فلک شیـــوه‌ی او پـــرده‌دری بود
منظـــور خردمنـــــد من آن مـــاه که او را
با حســـن ادب شیـــوه‌ی صـاحب‌نظری بود
از چنگ مـن‌اش اختـــر بدمهـــر به در برد
آری چـه کنـــم دولـت دور قمـــری بود
عـــذری بنـــه ای دل که تو درویشـــی و او را
در مملکـــت حســـن ســـر تاجـــوری بود
اوقات خوش آن بود که با دوست به سر رفت
بـــاقی همه بی‌حاصـــلی و بی‌خبـــری بود
خوش بود لب آب و گـــل و سبـــزه و نسرین
افســـوس که آن گنـــج روان رهگـــذری بود
خود را بکش ای بلبل از این رشک که گل را
با بـــاد صبـــا وقت سحـــر جلوه گـــری بود
هر گنج سعـــادت که خـــدا داد به حافـــظ
از یمـــن دعـــای شب و ورد سحـــری بود

موسوڵمانـــان دڵێــکم بوو زەمـــانێ
که دەمگوت بێنە سەر دەیگوت کە هانێ
بە گێــژاوی غەمــێ هەر گـا دەکـەوتم
لە بیـــر و رای ئـــەوم دابـــوو ئەمـانێ
دڵێ هـــاودەرد و کـــات و دەمشنـاسێ
ستـــوونی پشتـی هەر پیـــر و جـــووانێ
لە دەستـم چوو لە کۆی گیـــانان خودایا
چ دڵـــگر بوو وەهـــا شوێـــن و مەکانێ!
هونـەروەر عەیبی مەحـرورومی لەسـەریە
مرۆڤــێ وەک منی مەحـــرووم کـوانێ
وەرن گیـــانی پەرێشـــانێ دەوا کــەن!
کە مەڵهـــەم بوو بزەی فیکـرت زەمـانێ
ئەویـــن فێـری قســـەی شیــرینی کردم
کە فەرهـــــادم لە کـــۆڕی عاشقـــانێ
مەڵێن ئیـــتر کە «حافـــز» نوکتـــە سەنجە
کە جەهلـــی تێکـــەڵاوی بوو عەیـــانێ
کە «کۆلیـل»ـێ نەکا تەفسیری (وەللـەیل)
چلـۆن شێتـێکی وەک مەجنـون دەزانێ

مسلمانان مرا وقتی دلی بود
که با وی گفتمی گر مشکلی بود

به گردابی چو می‌افتادم از غم
به تدبیرش امید ساحلی بود

دلی همدرد و یاری مصلحت بین
که استظهار هر اهل دلی بود

ز من ضایع شد اندر کوی جانان
چه دامن گیر یا رب منزلی بود

هنر بی‌عیب حرمان نیست لیکن
ز من محروم‌تر کی سائلی بود

بر این جان پریشان رحمت آرید
که وقتی کاردانی کاملی بود

مرا تا عشق تعلیم سخن کرد
حدیثم نکته‌ی هر محفلی بود

مگو دیگر که حافظ نکته‌دان است
که ما دیدیم و محکم جاهلی بود

هەرکەسێ ڕۆژی ئەزەڵ بەختی سولەیمانی هەیە
تا ئەبەد جامی جەم و زولفی پەرێشانی هەیە
من هەر ئەو لەحزەی تەمامو تەرکی مەیئۆشی بکەم
لێم یەقین بوو کاری وا باری پەشیمانی هەیە
چاکە وا وەك سوێسنەش بەرماڵی سەوزم کردە کۆڵ
کێ بە خەرقەی مەی شەلاڵی شانم ئیمانی هەیە
بێجەماڵی جامی مەی خەلوەتنشینی سەختە بۆم
کامە گۆشەی ئەهلی دڵ بێ مۆمی نوورانی هەیە؟!
با نەبێ گەوهەر نیشان جامت، شەراب ئەر خالسە
بۆ قەڵەندەر مەی جەماڵی لەعلی ڕوممانی هەیە
من کە دەروێشم، بە چاوی سوکیێو مەڕوانە بۆم
چون گەدای ئەم زێدی ئێمە حوکمی سوڵتانی هەیە
گەر بە هیوای ئابڕووی ئەی دڵ لەگەڵ فیزن مەچۆ!
هەرکە خۆهەڵکێشە پێناسەی بە ملپانی هەیە
مەجلیسی شیعر و بەهار و عەشق و ڕەندین چاوەکەم
مەی لە دەس دڵبەر نەگرتن سەر گرانجانی هەیە
خۆشەویسێ دوێ وتی «حافز» نهێنی مەی دەخۆن
گیانەکەم هەر کاری عەیبێ ڕەمزی پەنهانی هەیە
مەستی بادەی کیژی کەرکووکیم و «کۆلیل»ی بزەی
بووکی کوردستان هەزاران نەخشی بۆ مانی هەیە

در ازل هـــر کـو به فیـــض دولــت ارزانی بود
تـا ابـــد جـــام مرادش همـــدم جـــانی بود
من همـان ساعت که از مـی خواستم شد توبه‌کـار
گفتـــم این شـــاخ ار دهـد بـاری پشیمـانی بود
خود گرفتـم کافکنم سجاده چون سوسن به دوش
همچو گـل بر خـــرقه‌ی رنگ می مسلمـــانی بود
بی‌چــــراغ جـــام در خلوت نمی‌یـــارم نشست
زآن‌کـه کنج اهـــل دل بایـــد که نـــورانی بود
همت عـــالی طلب جـــام مرصع گو مبـــاش
رنـــد را آب عنـــب یاقـــوت رمـــانی بود
گرچــــه بی‌سامـــان نمـایـد کار ما سهلش مبین
کانـــدر این کشور گدایی رشک سلطـــانی بود
نیک‌نـــامی خواهی ای دل با بـــدان صحبت مدار
خودپسنـــدی جـــان من برهـــان نـــادانی بود
مجلس انس و بهـــار و بحث شعـــر اندر میـــان
نستـــدن جـــام می از جانـــان گران‌جانی بود
دی عزیـــزی گفت حافـــظ می‌خورد پنهان شراب
ای عـــزیز من نه عیب آن بـــه که پنهـــانی بود

که ئێستـــه گوڵ له نەبـون هـاته مێـر گوڵانی وجوود
وەنەوشـــه خۆش سەری بۆ دانەوی بە عەزمی سوجوود
بنۆشـــه جامـی سوحـانەت! بە ناڵـــەیی دەف و نـــەی
وەلێســه غەوغــەوی ســاقی! بە سۆزی سینـەیی عوود
زەمــانی خۆش نییە گوڵ، بێ شەراب و یـار و روباب
ژیــانی وەک من و تۆ کورتــه چون لە باخــی وجود
لە شـــەوقی روومـــەتی گـوڵ وێنـەی ئاسمانە زەوی
بە بەختــی رۆشـــن و رەوتــی هەســارەیی مەسعوود
لە دەستی دڵبـــەری ناســـک‌لەش و مەسیــح‌نەفـەس
بنۆشـــه مـەی! مەکــه بـاس و حەکــایەتێ لە سەموود
بە فەسڵــی سۆسەن و گوڵ، خەڵوەتی ئەوینـــه چەمـەن
وەلــێ کە مـــردنی بولبــول لە رێگـــەدایە چ سوود
کە گــوڵ‌سوواری سەبـا بوو سەحـــەر سولەیمـان‌سا
لە ناخــــی بولبـــوله پەرداخـــە نەغمـــەیی داوود
لە بــاخ تازە وەکـــەن رەسمــی دینــی ســـەردەشتی
گوڵاڵـــە ئێستـــه کە کردوویــەتۆ ئاگـــری نەمرووود
تەڵەب کە جــامی شــەرابی سەحـەر! بە یـادی وەزیر
عەزیـزی موڵکی سولەیمان ستوونی دین (مەحموود)
شیـاوی مەجلیسی «حافــز» بە حورمـەتی هونـــەری
شــەراب و ســاقی و یــارە و هەوای خــۆش و سروود
بە ئاگری شـــەوی یەڵـــدا دڵی «عومـــەر» بکــە داخ
دەنــا لە زڵمـی شــەوی زولفــەکەت دەبێتە شوهوود

کنون که در چمن آمد گل از عدم به وجود
بنفشه در قدم او نهاد سر به سجود

بنوش جام صبوحی به ناله‌ی دف و چنگ
ببوس غبغب ساقی به نغمه‌ی نی و عود

به دور گل منشین بی شراب و شاهد و چنگ
که همچو روز بقا هفته‌ای بود معدود

شد از خروج ریاحین چو آسمان روشن
زمین به اختر میمون و طالع مسعود

ز دست شاهد نازک عذار عیسی دم
شراب نوش و رها کن حدیث عاد و ثمود

جهان چو خلد برین شد به دور سوسن و گل
ولی چه سود که در وی نه ممکن است خلود

چو گل سوار شود بر هوا سلیمان وار
سحر که مرغ درآید به نغمه‌ی داوود

به باغ تازه کن آیین دین زردشتی
کنون که لاله برافروخت آتش نمرود

بخواه جام صبوحی به یاد آصف عهد
وزیر ملک سلیمان عماد دین محمود

بود که مجلس حافظ به یمن تربیتش
هر آن‌چه می‌طلبد جمله باشدش موجود

خوێنــی دڵــم چەنێکــە بە روودا رەوا دەچــێ
چـەن ساڵــە ئەم پلوسکــی گــلارانە وا دەچێ؟!
گەنجــێ لە گیانمــایە ئەوینــێکە سـەر بە مـۆر
بێت و بچــێ لە سیــنە خەزێنـەی سەفـا دەچێ
خۆر بۆیە چـاکی کردووە یێـخەی کراسـی خۆ
یــارم دەڵێن بە عیشـوە بە ئاسـۆی کـەوا دەچــێ
سەر خاکی بەر دو پێتە، مەنێ دەستی رەد لە رووی!
سـەربەرزە سەر، دەمـێ کە لە ژێـر خاکی پا دەچێ
لافــاوە ئــاوی دیــدە لە رێ لادە، وا مەچـۆ!
دڵ هــەر چەنت لە بــەردە، بە سێـلاوی وا دەچێ
نێــوانی ئەشک و ئێمــە شــەو و رۆژە مــاجــەرا
بۆچی کە بـەر لە سیــنە بە جـۆی دڵبــەرا دەچێ
«حافــز» دەچێــتە مەیکــەدە دایـم بە عەشقـی دڵ
دەروێش چــۆن بە تەکیــە بە سیدق و وەفا دەچێ
«کۆلیــل» دڵگـرانە کە ســۆفی دەمــەو بەیــان
مەیخـانە چۆڵ ئەکـات و بەرەو خـانــەقا دەچێ

از دیــده خون دل همــه بر روی مــا رود
بر روی مــا ز دیــده چه گویم چه‌ها رود

مــا در درون سینــه هــوایی نهفتــه‌ایم
بر بــاد اگر رود دل مــا زان هــوا رود

خورشید خاوری کند از رشک جامه چاک
گر مــاه مهــرپرور من در قبــا رود

بر خــاک راه یــار نهادیم روی خویش
بر روی مــا رواســت اگــر آشنــا رود

سیــل است آب دیده و هر کس که بگذرد
گر خود دلش ز سنگ بود هــم ز جــا رود

ما را به آب دیــده شب و روز ماجــراست
زان رهگــذر که بر ســر کویش چــرا رود

حافــظ به کوی میکــده دایم به صدق دل
چون صوفیــان صومعــه‌دار از صفــا رود

که دەس لە سومبولی دلبەر ئەدەم بە قار، دەچێ
کە لوتف و بەخششی داوا دەکەم لە شار، دەچێ
خەمی برۆ بە درۆ تا دەنێتە بەردەسی دڵ
هیلالی یەکشەوە ئاسا، نیقابدار دەچێ
بە شەو شەرابم ئەداتێ کە مەست و بێخەو بم
بە رۆژ ئەگەر گلەمەن بم، بە خەونی پار دەچێ
چ پڕ لە فیتنەیە رێگەی ئەوینی دڵ، یاران!
ملی شکاوە لە ئەم رێ کەسێ بە غار دەچێ
غوباری مەیکەدە نادەم بە کۆشکی سەڵتەنەتی
هەزاری ئەم دەرە تا عەرشی کردگار دەچێ
کە جەوهەری رەشی زولفت تەواوە، نامە سپین
بەیانە، هەستە! کە وا رەنگی زولفی تار دەچێ
هەوا دەچێتە سەری تۆقلە، وا لە جامی شەراب
کلاوداری و حوکمی لەبەر دەمار دەچێ
وجوود پەردەیە «حافز»! فەنا بە، لادە لە خۆ!
خۆشا کەسێ کە بە بێلەش بەرەو نیگار دەچێ
«عومەر» لە بولبولی پرسی تەبیعەتی گوڵ چین؟
وتی بەداخەوە عەینەن وەکوو بەهار دەچێ

چو دست بر سر زلفش زنم به تاب رود
ور آشتی طلبم با سر عتاب رود
چو ماه نو ره بیچارگان نظاره
زند به گوشه‌ی ابرو و در نقاب رود
شب شراب خرابم کند به بیداری
وگر به روز شکایت کنم به خواب رود
طریق عشق پرآشوب و فتنه است ای دل
بیفتد آن‌که در این راه با شتاب رود
گدایی در جانان به سلطنت مفروش
کسی ز سایه‌ی این در به آفتاب رود
سوادنامه‌ی موی سیاه چون طی شد
بیاض کم نشود گر صد انتخاب رود
حباب را چوفتد باد نخوت اندر سر
کلاه‌داریش اندر سر شراب رود
حجاب راه تویی حافظ از میان برخیز
خوشا کسی که در این راه بی‌حجاب رود

کێ لە کۆی ئێوە دەتۆرێت، پەرێشانە دڵی
خەجڵ و بێ سەر و سامان و پەشیمانە دڵی
کاروانێ نەفەسی گەرمی ئەوینی لەگەڵە
هەڵسوکەوتی بە شکۆ، پڕ سەر و سامانە دڵی
نووری ئیمانە موریدێ دەگەیێنێ بە موراد
کێ بە مەنزڵ نەگەیێ ئەڵبەتە وێرانە دڵی
بگرە کامێ لە شەراب و دەمی ئازیز، دەمێ
ژینی دۆڕاندووە بێکار، گرانجانە دڵی
ئەی دەلیلی دڵی گومبوو، مەدەدێ تۆ بی و خوا!
شارەزا، یاوەر و دڵسۆزی غەریبانە دڵی
حوکمی پاکی و چەپەڵی ڕۆژی سەرەنجامە فەقەت
لە دەمی ئاخری خۆ هەرکە لە ڕامانە دڵی
«حافز»! بادە لە چاوانەیی حیکمەت بکە نۆش
هەرکە لەو کانییە دەخواتەوە زۆرزانە دڵی
هەوری یادت لە سەری سینە هەڵیداوە، کە خۆش
چاوی «کۆلیل» خەریکی پەڵەبارانە دڵی

از ســر کوی تو هر کــو به مــلالت بــرود

نرود کــارش و آخــر به خجـالت بــرود

کــاروانی که بـود بدرقــهاش حفظ خـدا

بـه تجمــل بنشینـــد بـه جــلالت بــرود

ســالک از نور هدایت ببــرد راه به دوست

که به جــایی نرســد گر به ضلالت بــرود

کــام خود آخر عمر از مــی و معشوق بگیر

حیف اوقــات که یک سر به بطالت بــرود

ای دلیــل دل گمــگشته خــدا را مـددی

که غـــریب ار نبــرد ره به دلالت بــرود

حکم مستوری و مستی همه بر خــاتم تست

کس ندانست که آخــر به چه حالت بــرود

حافظ از چشمهی حکمت به کف آور جامی

بو که از لــوح دلت نقش جهــالت بــرود

سیـــنە نەخشیـــنە بە یـادت، سەر و سامانم ئەتۆی
بەش بە حاڵی دڵی خۆ سەروی خەرامانم ئەتۆی
لە دڵی وێڵمی یــادت فەلەک و جــەوری نەبرد
بە خەیــاڵی دەمی تۆ مــاوم و هۆی مـانم ئەتۆی
لە ئەزەڵ بەستــەیی زولفت بووە دڵ تا ئەبەدیش
مل کەچی عەهــدم و نەشکاو لە پەیمــانم ئەتۆی
لە دڵی ئێمــە ئەوەی بــاری غەمی سەختە دەچێ
هەر غەمی ئەووەڵ و ئاخر وەکـو جارانـم ئەتۆی
عەشقی ئێــوەم لە دڵ و گیان بووە جێگیــر وەها
کە سەریشـم بە بڕین چێ، لە دڵ و گیـانم ئەتۆی
گەر دڵـم وێڵــە لە دووی ئێـوە نەخۆشیــنی هەیە
چییە چـارەم کە ئەزەڵ چارە و دەرمــانم ئەتۆی
پێت ئەگەر خۆشە وەکوو «خاجە» دڵئاوارە نەبی
حەز لە شۆخێ مەکە! خاترجەمی دەورانم ئەتۆی
لەوەتا بوومــەتە «کۆلیــل»ـی ئەوین تـۆم لە دڵـی
ئـەرزی بێ ئـاوی بەهــارم، پەڵە بــارانم ئەتۆی

هرگـزم نقش تو از لوح دل و جـان نـرود
هرگـز از یـاد من آن سـرو خرامان نـرود

از دمـــاغ مـن سرگشتــه خیـــال دهنـت
به جفـــای فلك و غصـــه‌ی دوران نـرود

در ازل بست دلـــم بـا ســر زلفـت پیـوند
تا ابـد سـر نکشـد و از سر پیمــان نـرود

هرچه جز بار غمت بر دل مسکیـن من است
بـــرود از دل مـــن وز دل مـــن آن نـرود

آن‌چنان مهر توام در دل و جان جای گرفت
که اگر ســر بــرود از دل و از جان نـرود

گـر رود از پی خوبـان دل من معذور است
درد دارد چــه کنـد کز پی درمـان نـرود

هرکه خواهد که چو حافظ نشود سرگردان
دل به خوبـان ندهـد و از پی ایشـان نـرود

خۆشا دڵێ کە بە عومری لە سەر نەزەر ناچێ
بە هەر سەرایە کە بیبەن بە بێ‌خەبەر ناچێ
بە شەکری لێوی ئەوم چاترن تەماح نەکەم
وەلێ مەحاڵە، چ مێشێ بەرەو شەکەر ناچێ؟!
رەشی مەشۆوە لە چاوی غەمین بە ئەسرینم
نیشانی خاڵتی هەرگیز نەزەر لە دەر ناچێ
بە چەشنی سروە درێغی نەسیمی خۆش مەکە لێم!
ژیان کە بێ سەری زولفت لە سەر بە سەر ناچێ
دڵا! مەمێنەوە هەر هەرزەگێڵ و بێ‌خاوەن
کە کار و باری ژیانی وەها لە بەر ناچێ
بە چاوی سووکەوە مەڕوانە بۆ منێکی خراو
کە ئاو و تاوی شەریعەت بە بێ‌هونەر ناچێ
منی گەدا هەوەسی نۆنمامێ وا لە سەرم
لە گەردنی کە دەسی بێ‌زەڕ و گوهەر ناچێ
لە تۆ کە خەڵکی وەڵاتی سەخاوەت و کەرەمی
وەفا بە قەوڵ و قەرارت لە سەر هەدەر ناچێ
لە عالەما نییە وەک من خراپ و چارەڕەشێ
دە چۆن بە چەشنی قەڵەم زووخی دڵ بەسەر ناچێ
فریوی تاجی پەپوو هەی مەخۆ! کە بازی سپی
لە شوێنی چۆلەکە، نێچیری موختەسەر ناچێ
پیاڵە پڕ کە لە پێشا بە «حافز»ت کەرەمێ
ئەگەر بەڵێنە کە باس و خەبەر بە دەر ناچێ
بە ئاوی کەوسەر و جەننەت! بە بێ بزەی لێوت
قەسەم بە حەسرەتی «کۆلیل»! غەم، کەسەر، ناچێ

خوشا دلی که مدام از پی نظر نرود

به هر درش که بخوانند بی‌خبر نرود

طمع در آن لب شیرین نکردنم اولی

ولی چگونه مگس از پی شکر نرود

سواد دیده‌ی غم‌دیده‌ام به اشک مشوی

که نقش خال توام هرگز از نظر نرود

ز من چو باد صبا بوی خود دریغ مدار

چرا که بی سر زلف توام به سر نرود

دلا مباش چنین هرزه‌گرد و هرجایی

که هیچ کار ز پیشت بدین هنر نرود

مکن به چشم حقارت نگاه در من مست

که آبروی شریعت بدین قدر نرود

من گدا هوس سروقامتی دارم

که دست در کمرش جز به سیم و زر نرود

تو کز مکارم اخلاق عالمی دگری

وفای عهد من از خاطرت به در نرود

سیاه نامه‌تر از خود کسی نمی‌بینم

چگونه چون قلمم دود دل به سر نرود

به تاج هدهدم از ره مبر که باز سفید

چو باشه در پی هر صید مختصر نرود

بیار باده و اول به دست حافظ ده

به شرط آن که ز مجلس سخن به در نرود

مەیگێڕ! گوڵ بەیـــانی بەهـــار و گەشـــەی دەکـــا
باســـی عەلاجی سیـــنە بە سێ جـــامی مەی دەکـا

مەی تێکە سوورەگـــوڵ لە چەمەن جوانە بێسنوور
دەڵاڵـــە لەو دەلالـــە نیگـــاکاڵـــە چـەی دەکا؟!

شەککەرشکێن لە هێـــندە هەموو تووتیـــانی، چون
شیـــراز لوتفی قەنـــدی بە بەنگـــالەکەی دەکـــا

تێـــپەڕ لە کات و جێگـــەیە شیعـــرم کە وا شەوێ
منـــدالّی ئێمـــە رێگـــەیی سەد ساڵـــە پەی دەکا

زاهیـــد فریـوی چـــاوی تەماشـا کە چۆن لە دووی
کـــاروانی مەکـــر و نـازی، دەرون ناڵە قـەی دەکا

دونیـــا بە مەکر و فێـڵی لە خەشتـــەت نەبا، دەخیـل!
ئەفســـوونە هەڵسوکەوتی، قەڕاڵـــە و دەبەی دەکا

وەرزی بەهـــارە ســـروە شنەی دێ لە باخـــی گوڵ
شـــەونم سەبـــا لە جـــامی گوڵـی لالـــە هـەی دەکا

«حافـــز»! لە شـــەوقی ئازیـــز بنالێـــنە هـەر بە دڵ
ئـــەم رێگـــە زۆر دوورە، فەقـــەت ناڵـــە تەی دەکا

«کۆلیـــــل»ـی ئێـــوە بۆیە وەکـوو نـــەی لە ناڵەدان
دەرمـــانـــی دەردی دووری بە ناڵیـــن و وەی دەکا

ســـاقی حدیث سرو و گل و لاله می‌رود
ویــن بحث با ثلاثـــه‌ی غســـاله مــی‌رود
می ده که نوعروس چمن حد حسن یافت
کـــار این زمـان ز صنعت دلالــه می‌رود
شکرشکن شونــد همــه طوطیــان هنــد
زین قنـــد پـارسی که به بنگـــاله می‌رود
طی مکـــان ببین و زمـان در سلوک شعر
کـاین طفل یک شبه ره یک‌ساله می‌رود
آن چشـم جـــادوانه‌ی عـــابدفریب بیــن
کـش کـاروان سحــر ز دنبـــاله می‌رود
از ره مرو به عشــوه‌ی دنیـا که این عجوز
مکـــــاره می‌نشیـــــند و محتـــاله می‌رود
بـاد بهــــار مــی‌وزد از گلستـــان شـــاه
وز ژالـــه بـــاده در قـــدح لاله می‌رود
حافــظ ز شوق مجلس سلطان غیاث دین
غافـــل مشو که کـار تو از نالـــه می‌رود

ترسم لە ئەشکی ئاڵە بە سیخوڕی دەرد ئەبێ
رازی بە مۆری سینە عەیان چەشنی خۆر دەبێ
بەردێ دەڵێن بە حەوسەڵە رۆژێ دەبێتە لەعل
ئەڵبەت دەبێ بەڵامە بە خوێنی جیگەر دەبێ
بۆچی نەڕۆمە مەیکەدە ناڵان و حەق تەڵەب
دەرد و کەسەر بە جامی ئەوێ چارەسەر دەبێ
تیری دوعا رەوانە بە هەر لایە بێ‌وچان
بێ‌شک یەکێ لەوانە شەوێ کاریگەر دەبێ
ئەی دڵ! پەیامی ئێمە هەمیسان بڵێ بە یار
ئەمما بە سووک، ئەگینە لە خەونی خەبەر دەبێ
روو زەردی عەشقی تۆیە، عەیاری تەواوە رووم
ئەڵبەت لە یومنی ئێوە گڵ خاکێ بە زەڕ دەبێ
سەر سووکی فیز و نازی رەقیبم، کە یارەبی!
کەرمۆرە سەر نەچێ کە لە گەوهەر زەرەر دەبێ
پێویستە جێ لە جوانی گەلێ خاڵ، تا کەسێ
شیرین بە تەبعی خوسرەوی خاوەن نەزەر دەبێ
وا سەر دەنێ بە دیانەوە کۆشکی کەناری تۆ
لەم ئاستانە چی سەرە وەک خاکی دەر دەبێ
«حافز»! کە عەتری زولفی بەرەو تۆیە، وس بە وس
ئەوشۆ سەبا لە خەونە، نەکەی! لێت خەوەر دەبێ
زریان برووسکەنێرە «عومەر»! بۆ هەموو گوڵێ
کێ زولفی بۆنی خۆشە ئەوین‌چوونی هەر دەبێ

ترسم که اشک در غم ما پرده‌در شود
وین راز سر به مهر به عالم سمر شود
گویند سنگ لعل شود در مقام صبر
آری شود ولیک به خون جگر شود
خواهم شدن به میکده گریان و دادخواه
کز دست غم خلاص من آن‌جا مگر شود
از هر کرانه تیر دعا کرده‌ام روان
باشد کز آن میانه یکی کارگر شود
ای جان حدیث ما بر دلدار بازگو
لیکن چنان مگو که صبا را خبر شود
از کیمیای مهر تو زر گشت روی من
آری به یمن لطف شما خاک زر شود
در تنگنای حیرتم از نخوت رقیب
یا رب مباد آن‌که گدا معتبر شود
بس نکته غیر حسن بباید که تا کسی
مقبول طبع مردم صاحب‌نظر شود
این سرکشی که کنگره کاخ وصل راست
سرها بر آستانه‌ی او خاک در شود
حافظ چو نافه سر زلفش به دست توست
دم درکش ار نه باد صبا را خبر شود

با لە بەر واعیـزی شـار ئەم قسـە ئاسـان نیـیە
تـا ریـاکار و زمـانچەورە موسوڵمـان نیـیە

فێـری جوامێری و رەنـدی بە! دەنا کەی هونەرە
بۆ کەر و گـا کە نەنۆشێ مـەی و ئینسـان نیـیە

گەوهەری پاکە شیاوی شەرەفی بەرزی خوزوور
هەرچی بەرد و گڵـە مرواری و مەرجـان نیـیە

ئیسمی ئەعزەم کە هەوادارتە ئەی دڵ غەمی چی؟!
دێـو بە ئەفسـوون و فـەن و فێـڵ، سولەیمان نیـیە

عەشقە کاری من و لام وایە کە ئەم ئیشـە وەکوو
هونـەری‌تر، لە غەمـی لۆمـە و بوختـان نیـیە

شـەوی پێشوو وتی سۆزی بە موورادت دەگەیی
کۆمـەکێ خوایـە کە تا ئێستە پەشیمـان نیـیە

خوا عەتا کا بە جەمـاڵت رەوشی میهـر و وەفـا
سیـنە بەم شێـوە لە سامت، کە پەرێشان نیـیە

«حافـز»! زەڕڕە ئەگـەر هیمـمەتی باڵای نەبێ
عاشقی مـاچی کچـی خۆری درەخشـان نیـیە

هەر قەساوی دڵـی «کۆلیل»ـە شوکور تێغی برۆی
قۆچی قوربانی وەک ئێمەی کە لە قوربان نیـیە

گرچه بر واعـظ شهـر این سخن آسان نشود
تـا ریـا ورزد و سالـوس مسلمـان نشود
رندی آموز و کرم کن که نه چندان هنر است
حیـوانی که ننوشـد مـی و انسـان نشود
گوهـر پاک ببـاید که شـود قابـل فیض
ور نه هـر سنگ و گلـی لؤلؤ و مرجـان نشود
اسم اعظم بکنـد کـار خود ای دل خوش باش
که به تلبیس و حیـل دیـو مسلمـان نشود
عشـق می‌ورزم و امیـد که این فـن شـریف
چون هنـرهای دگـر موجب حـرمان نشود
دوش می‌گفت که فـردا بدهـم کـام دلت
سببی سـاز خـدایا که پشیمـان نشود
حسن خلقـی ز خـدا می‌طلبـم خوی تو را
تـا دگر خاطـر مـا از تـو پریشـان نشود
ذره را تـا نبـود همت عـالی حافـظ
طـالبِ چشمه‌ی خورشیـد درخشـان نشود

گەر لە کوڵمت گوڵێ یەک ماچ بچێنم چ دەبێ؟!
بە شــەمی ئێــوە کە بــەرپـام بوێنــم چ دەبێ؟!
سا خودایــا لە پەنا سێــبەری ئەو ســەروە ئەگــەر
منــی مانــووی دەمــێ خۆ وەحـەسێــنم چ دەبێ
ئەی موبارەک ئەسـەر ئەی مۆری سولەیمآن ئەگەر
گرشــە با وێژییــە سەر نەخشی نهێــنم چ دەبێ
واعیــزی ئێمــە بە دارۆغــە و شــا عاشقــە ئەی
من ئەگــەر دیــدە خومـارێ بدوێنــم چ دەبێ
لە ســەرم هۆش پەڕیــوە گڕی مـەی گەر ئەمە بێ
بێ گومــانم کە لە ســەر دیـن و بەڵێــنم چ دەبێ
گەنج و زێڕی تەمەنم سەرفی مەی و کیــژەڵە بوو
تا لە ئەم چـم بە ســەر و لەو بـەر و بێــنم چ دەبێ
خاجە زانی کە ئەوینــدار و مەســـم هیچی نەوت
«حافـز»یشت کە نەکـا بـاس لە شوێنــم چ دەبێ
زاوری کەس نییە لەم شـارە «عومەر»! بێژە بە شێخ
دڵی عاشــق وەکـو ئەو گــەر نەشکێــنم چ دەبێ

گر من از باغ تو یک میوه بچینم چه شود
پیش پایی به چراغ تو ببینم چه شود
یا رب اندر کنف سایه‌ی آن سرو بلند
گر من سوخته یک‌دم بنشینم چه شود
آخر ای خاتم جمشید همایون آثار
گر فتد عکس تو بر نقش نگینم چه شود
واعظ شهر چو مهر ملک و شحنه گزید
من اگر مهر نگاری بگزینم چه شود
عقلم از خانه به در رفت و گر می این است
دیدم از پیش که در خانه‌ی دینم چه شود
صرف شد عمر گران‌مایه به معشوقه و می
تا از آنم چه به پیش آید از اینم چه شود
خواجه دانست که من عاشقم و هیچ نگفت
حافظ ار نیز بداند که چنینم چه شود

بەختـــم لە زاری یارەکـەمی، پێ نـەبوو نیشـان
شەنسـم لە رازی بـوونی دەمــی وا لە تەفـرەدان
گیــان و دڵم خەڵاتی بە مـــاچێ لە لێـوی کرد
نەیبوو وەفـا بە قەوڵ و کەچی دڵمی برد و گیان
مردم لە دەردی دووری و نەمبـوو بە ژووری رێ
یا پـەردەدارە رێگــە دەکا گـوم لە بێـکەسان!
زولفی لە دەس سەبـایە فەلەك چەنـدە سپڵە بوو
سووکێ لە کـۆی سەبـاوە شەمـاڵی منی خـەوان
پەرگــار وێنــە گەرچی لە دەورانـە دڵ وەلــێ
دەوران بە چەشنــی نوختـە نەمیـخستە نێو مەیـان
شەککەر فرۆشە حەوســەڵە ئەمما زەمــانە چون
کەمشــەرت و بێبەڵێـنە، زەمـانێکی پێم نەدان
دەموت دەرۆمە خــەو کە ببیــنم جەمـــاڵی تۆ
«حافــز» بە ئـاهـ و ناڵــە مەگەر پێم ئەدا ئەمان؟!
بۆنی جەفــا لە باخــی وەفـــا دێت بۆیــە وا
«کۆلیــل» دڵ گــرانە لە کــرداری باخـــەوان

بخت از دهـــان دوست نشـــانم نمی‌دهـد
دولت خبـــــر ز راز نهـــانم نمی‌دهـــد

از بهر بوســـه‌ای ز لبش جـــان همی‌دهم
اینـــم همی‌ستـــاند و آنـــم نمی‌دهـــد

مردم در این فـراق و در آن پرده راه نیست
یـــا هست و پـــرده‌دار نشـــانم نمی‌دهـــد

زلفش کشیـــد باد صبـــا چرخ سفلـه بیـن
کـــآن‌جا مجـــال بـاد وزانـــم نمی‌دهـــد

چنـــدان که بر کنـــار چو پرگار می‌شـــدم
دوران چو نقطـــه ره به میـــانم نمی‌دهـــد

شکر به صبـــر دست دهـــد عـاقبت ولـی
بدعهـــدی زمـــانه زمـــانـم نمی‌دهـــد

گفتم روم به خواب و ببیـــنم جمال دوست
حافـــظ ز آه و نالـــه امانـــم نمی‌دهـــد

دڵـــم بچـێ لە شـــەرابی شـەمـــامە بۆ شـایەت
کە بۆنـی تـاســـە لە زوهــدی ریـا بـە دەر نایــەت
هەمـــوو جەهـــانت ئەگەر بەرگـری ئەوینی دڵە
لە کەس مەترســـە هەتا یارە کۆمــەك و پایــەت
ئەوین بە لوتفــە تەمــــاحی سەخـــاوەتت پێ بێ
دەکـا کـەرەم بە هەمــوو عاشقـــان بە بێ غایــەت
دڵـــم لە حەڵقــەیی زیکر و دوعــایە، بەو خۆزگا
شـەوێ بە حەڵقــەیی زولفی رەشی بکەوتایــەت
ئەتۆ کە بووکـی خــودایت و بەختــی زگمــاکی
لە پێخــەسوو هەڵــە بوو بەژنتـی کە دەق دایــەت
چەمــەن کە خۆشە، هەوا دڵـگرە و سـوراحی پـڕ
چ بوو ئەگـــەر بە دڵـێ خـــۆش ئەوین بهاتایــەت
جەمیلــە خانمــە بووکـی جەهـــان بـزانی ئەبێ
کە ئەم کەژاوەنشیـنەت بە عەقـدی کەس نایــەت
بە ســەد رجـــا وتم ئەی مـــانگی من مەگەر کوفرە
بە مـــانووێ گوڵـەماچـێ بـــدەی لە سەرمایــەت
کەنــی وتی مەبـە «حافــز»! لەبــەر خـــودا رازی
بکـا کــە روومــەتم ئالوودە مامـــەڵەی زایــەت
غەمی لە دڵ چووە «کۆلیـل»ـە کەت کە فەرمووتان
بڕۆ! بە حورمــەتی جـاران دەبەخشــم ئەمڕایــەت

اگر به بـــادهٔ مشکیـــن دلـــم کشـــد شـــاید
که بـوی خیـــر ز زهـــد ریـــا نمی‌آیـــد

جهـــانیان همـه گر منـــع من کنـــند از عشـــق
من آن کنـــم که خـــداوندگار فرمـــاید

طمـــع ز فیـــض کـــرامت مبـر که خلق کریم
گنـــه ببخشـــد و بـر عاشقـــان ببخشـــاید

مقیـــم حلقـــهٔ ذکر است دل بـــدان امیـــد
که حلقـــه‌ای ز ســـر زلف یـــار بگشـــاید

تو را که حســن خـــداداده هست و حجلهٔ بخت
چه حـــاجت است که مشـــاطـه‌ات بیـــارایـد

چمن خوش است و هوا دلکش است و می بی‌غش
کنـون بجـز دل خـوش هیـچ در نمی‌بـــاید

جمیـــله‌ای‌ست عـــروس جهـــان ولی هشـــدار
که این مخـــدّره در عقـــد کس نمـــی‌آیـــد

به لابـــه گفتمش ای مـــاه‌رخ چه باشـــد اگـــر
به یک شکـــر ز تو دل‌خستـــه‌ای بیـــاسـایـد

به خنـــده گفت که حافـــظ خـــدای را مپسند
که بوســـهٔ تـــو رخ مـــاه را بیـــالایـد

پێم وت غەمی دڵم تۆی فەرموی غەمت بە سەر دێ
پێم وت کە مانگی من بی فەرموی هەتا وەدەر دێ
پێم وت لە عاشقانۆ فێری وەفا بە ئازیزا!
فەرمووی لە گوڵعوزاران کاری وەها مەگەر دێ
پێم وت بە کۆی خەیاڵم یادت کەڕێگە نادەم
فەرموی عەیاری شەوگێڵ هەر وەک هەناسە، وەر دێ
پێم وت ئەوینی زولفت گومڕا لە دینی کردم
فەرموی هەر ئەو سەرەنجام دەسگیری ڕێگە دەر دێ
پێم وت چ خۆشە بایێ سروەی سەحەر هەڵیکا
فەرموی نەسیمی خۆش تر لەو باخی موشکە بەر دێ
پێم وت کە شەکری لێوت ئێمەی بە ئارەزوو کوشت
فەرموی کە هەر غولامی لێوم بە! تا شەکەر دێ
پێم وت دڵی بە رەحمت سوڵحی دەبێ لەگەڵما
فەرموی مەڵێ بە هەر کەس! ئەم سوڵحە کاتی هەر دێ
پێم وت ئەشا زەمانی شایی چلۆن بە سەر چوو
فەرموی دە وس بە «حافز»! ئەم کاتەشت بە سەر دێ
پێم وت کە ڕۆحی شیرین وەربگرە لێم بە ماچێ
فەرموی ئەگەر وەها بێ هەر چر کە سەد«عومەر» دێ

گفتم غم تو دارم گفتا غمت سر آید
گفتم که ماه من شو گفتا اگر بر آید
گفتم ز مهرورزان رسم وفا بیاموز
گفتا ز خوبرویان این کار کمتر آید
گفتم که بر خیالت راه نظر ببندم
گفتا که شبرو است او از راه دیگر آید
گفتم که بوی زلفت گمراه عالمم کرد
گفتا اگر بدانی هم اوت رهبر آید
گفتم خوشا هوایی کز باد صبح خیزد
گفتا خنک نسیمی کز کوی دلبر آید
گفتم که نوش لعلت ما را به آرزو کشت
گفتا تو بندگی کن کو بنده‌پرور آید
گفتم دل رحیمت کی عزم صلح دارد
گفتا مگوی با کس تا وقت آن درآید
گفتم زمان عشرت دیدی که چون سرآمد
گفتا خموش حافظ کاین غصه هم سرآید

سەر لە سەریـــدایە گەر لە دەستی ســەری بێ
ئەڵبــەتە کــارێ بکــا لە خوسپــە بــەری بێ
دڵ نیـــیە رێگـــا بـــدا بە دلبـــەر و دژمـــن
دێو نیــیە لەو خەڵــوەدا کە پــۆلی پــەری بێ
وەک شــەوی یەڵـــدایە تارە مەجلیسی شاهان
هەر دڵــی رەنــــدانە خۆر بەر و سەمــەری بێ
چەنـــدە لە بەر دەرکی خـــاوەنی زەڕ و دینار
ماتڵی بەشکەم کە خێـــو لە خەو خەبــەری بێ
تەرکی گەدایی نەکەی! کە گەنج بە دەس دێ
گەر مـــەدەدی رێــڕەوی ئەویـن گوزەری بێ
پــاک و چەپـــەڵ هەر مەتــاعی خۆ دەنوێنـــن
تا کـــەرەمی ئەو مەگـــەر بە کــێ نەزەری بێ
بولبــولی شەیـــدا ژیـــانی کورتـــە هەتا بـــاخ
فەرشــی ســەوز رابخات و گوڵ لە ســەری بێ
غەفڵــەتی «حافــز» لە ئەم بچـــووکە سەرا بوو
مەیکـــەدە چـــوونم دەبـــێ لە بێخەبــەری بێ
دەوڵــەتی «کۆلیـــل» ئەرێ! هەمـــوو غەمی یارە
گەنجی وەهـــا رەنگـــە بەرهەمی هونـــەری بێ

بر سر آنم که گر ز دست بر آید
دست به کاری زنم که غصه سر آید

خلوت دل نیست جای صحبت اضداد
دیو چو بیرون رود فرشته درآید

صحبت حکام ظلمت شب یلداست
نور ز خورشید جوی بو که بر آید

بر در ارباب بی‌مروت دنیا
چند نشینی که خواجه کی به در آید

ترک گدایی مکن که گنج بیابی
از نظر رهروی که در گذر آید

صالح و طالح متاع خویش نمودند
تا که قبول افتد و که در نظر آید

بلبل عاشق تو عمر خواه که آخر
باغ شود سبز و شاخ گل به بر آید

غفلت حافظ در این سراچه عجب نیست
هر که به میخانه رفت بی‌خبر آید

کەشکۆڵ بە کوڵی عەشقم، تا باخی من بە بەر بێ
یا بن دەکا گوڵی گیان، یا گیان لە بن بە دەر بێ
بێ هەڵتەکێنە گۆڕم! دوا مردنێ هەتاکوو
دووکەڵ لە ناخی سینگ و لۆلۆی کفن بە دەر بێ
بنوێنە روو هەتا گەل شێت و دەمەق بمێنن
ببزێوە لێو کە ناڵەی هەر پیاو و ژن بە دەر بێ
گیان گەییە لێو و حەسرەت لێوانی دڵمە، ئێژم
بێژی نەگەم بە کامی دڵم و مرن بە دەر بێ؟!
بۆ حەزرەتی دەمی یار گیانم بە تەنگ هاتوون
کەی کامی دڵ لە باخی نەدیار و ون بە دەر بێ
ئێژن لە کۆی ئەوینی رەندان دەبێ کە ناوی
خێری جەنابی «حافز» بەرز و مەزن بە دەر بێ
کەوتۆتە چای چناکەت «کۆلیل» خۆی و بەختی
بێلانە با لەوێدا گیانی ئەمن بە دەر بێ

دست از طلب ندارم تا کام من برآید
یا تن رسد به جانان یا جان ز تن برآید
بگشای تربتم را بعد از وفات و بنگر
کز آتش درونم دود از کفن برآید
بنمای رخ که خلقی واله شوند و حیران
بگشای لب که فریاد از مرد و زن برآید
جان بر لب است و حسرت در دل که از لبانش
نگرفته هیچ کامی جان از بدن برآید
از حسرت دهانش آمد به تنگ جانم
خود کام تنگدستان کی زان دهن برآید
گویند ذکر خیرش در خیل عشقبازان
هرجا که نام حافظ در انجمن برآید

هەتــا هەتــاوی شـــــەرابێ لە کۆی پییـــاڵە بە دەر دێ
لە بـــاخی رووهـــەتی ســاقی قەتــاری لاڵــە بە دەر دێ
شەمیــمی پەرچەمی سومبــول لە مێرگوڵان دەخەوێ تا
نەسیمی یاسەمـــەنی زولفـــی ئەو منـــاڵە خەبـــەر دێ
شکــایەتی شـــەوی دووری نە ئەو حەکــایەتە کورتـەن
کە هەر کەمــێ لە بەیــانی بە سـەد ریســاڵە بە سەر دێ
کە سەر بە ژێرە فەلەك سفرە گردەکەی، بە تەمــا نیــم
کە بێخەفـــەت لـەتـە نانێ بکــا حەواڵـــە بە مەردێ
بە هەوڵی خۆ نییە دەسکەوتی لەعل و گەوهەری ئاوات
خەیـــاڵە هەرکە بلـێ بـــاخ بێقـــەواڵە وە بەر دێ
بە چەشنی نــووح لە تۆفــانی غــەم سەبوورە ئەگـەر دڵ
بەلا دەچێــت و ژیــانی هــەزار ســاڵــە بە بــەر دێ
کە عەتری پەرچـــەمی تۆ روو بکا لە مەرقـــەدی «حافز»
لە خـــاکی گـــۆڕی هــەزاران هــەزار ژاڵە وەدەر دێ
«عومــەر» خەیاڵی شەوی زولفتی لە سەر جەمە پەوکێ
زوخـــاوی رەش لە دەروونی بە ئــاهـ و ناڵــەوە هەر دێ

دلم رمیده‌ی لولی‌وشی‌ست شورانگیز
دروغ وعده و قتال وضع و رنگ‌آمیز

فدای پیرهن چاک ماه‌رویان باد
هزار جامه‌ی تقوا و خرقه‌ی پرهیز

خیال خال تو با خود به خاک خواهم برد
که تا ز خال تو خاکم شود عبیرآمیز

فرشته‌ی عشق نداند که چیست ای ساقی
بخواه جام و گلابی به خاک آدم ریز

پیاله بر کفنم بند تا سحرگه حشر
به می ز دل ببرم هول روز رستاخیز

فقیر و خسته به درگاهت آمدم رحمی
که جز ولای توام نیست هیچ دست‌آویز

بیا که هاتف میخانه دوش با من گفت
که در مقام رضا باش و از قضا مگریز

میان عاشق و معشوق هیچ حایل نیست
تو خود حجاب خودی حافظ از میان برخیز

ئەی سەبا ئەمجارەت ئەر رێ کەوتە سەر چۆمی ئەرەس
هەڵمژی کوڵمی تەڕی پڕپڕ لە عەتری کەی نەفەس
مەنزڵی دڵبەر سڵاوی مەی لە سەر بڕوانە چەن
پڕ لە ناڵەی کاروانی عەشقن و دەنگی جەرەس
ماچی بەر دەرکی بکەو ئیتر بە زاری پێی بڵێ
دەردی دووری کوشتمی وا وەرگەڕێ ئەی دیدەمەس
هەر وەکوو دەنگی روبابم هاتە گوێ پەندی کەسان
گوێچکەمی تا با نەدا عەشقت نەبووم حاڵی لە کەس
شەو بە شایی و مەی بژێ چونکوو لە شارێگەی ئەوین
شەورەوی عاشق لەگەڵ دارۆغە کەین وبەینی هەس
عەشقی بەژنی شۆخ، شۆخی نین و سەردانی دەوێ
کەس لە گۆی عەشقی نەدا هەرگیز بە گۆچانی هەوەس
گەرچی وەشیاران بە ئازادی دەژین ئەمما دەڵێن
پێشکەشی یاری نەکەی گیان و دڵ و دین سەرفی چەس
تووتیان خۆشن لە کۆشی نەیشەکەر شەککەرشکێن
دەستی حەسرەت هەر بە سەر خۆدا ئەدەن خێڵی مەگەس
نێوی «حافز» تاقەجارێ گەر بنووسێ دەسخەتت
بۆخەڵاتێ وا دەپارێمۆ لە کن سوڵتان و بەس
یا نە لانیکەم لە «کۆلیل»ـت بکەی یادێ بە خێر
مەسرەفێکی هەر هەیە ئاخر گوڵی من! خار و خەس

ای صبـــا گر بگـــذری بر ســـاحل رود ارس

بوسه زن بر خاک آن وادی و مشکین کن نفس

منـــزل سلمی که بادش هـــر دم از ما صد ســلام

پرصـــدای ساربـــانان بیـــنی و بـانگ جـرس

محمل جانــان ببوس آن‌گه به زاری عرضـه دار

کز فـــراقت سوختـــم ای مهـــربان فـــریاد رس

من که قـــول ناصحان را خواندمی قـــول رباب

گوشمـــالی دیدم از هجـــران که اینم پند بس

عشرت شبگیـــر کن می نوش کـــاندر راه عشق

شبـــروان را آشنـــایی‌هاست با میـــر عسس

عشق‌بـــازی کار بازی نیست ای دل ســـر بباز

زآن‌که گوی عشق نتـوان زد به چوگان هوس

دل به رغبت می‌سپـــارد جان به چشـــم مست یار

گرچه هشیـــاران ندادنـد اختـــیار خود به کس

طوطیـــان در شکرستـــان کـــامرانی می‌کنـند

وز تحسّـر دست بر ســـر می‌زند مسکیـن مگس

نـــام حافـــظ گر برآیـــد بر زبان کلک دوست

از جنـــاب حضرت شاهـم بس است این ملتمس

گوڵی کوڵمت لە گوڵستانی جەهــان بۆ مـە بەسە
لەم چەمەنـزارە شنــەی سـەروی رەوان بۆ مـە بەسە

خوا نەکـا دڵ لەگـەڵ ئەم خێڵـــە ریا هـــاوەڵ بێ
لە هەمـوو کــاری گران جـامی گـران بۆ مـە بەسە

بە عەمــەل کــاخی بەهەشتێ بە مەلا و شێخ ئەدەن
ئێمــە رەندین و گـەدا، کۆخی موغــان بۆ مـە بەسە

وەرە ســەیری گوزەری چەم تەمـەنئاسا کە دەچێ
واتە ئەم ســەیرە لە چــەرخی گوزەران بۆ مـە بەسە

وەرە بــازاڕی جەهـــان لێکــەوە قـــازانج و زەرەر
بەس ئەگـەر بۆ وە نەبوو سـەرف و زیان بۆ مە بەسە

یـــار وەختێ کە لەگـەڵمانە نیـــازێ نیـیە هیـــچ
دەوڵەتی خزمـــەتی ئەو هاوەڵی گیـان بۆ مـە بەسە

تۆ خودا لــەم دەرە مەمنـــێرە بەرەو بـاخی بەهەشت
چونکە کۆی تۆ لە مەکۆی کەونومەکان بۆ مە بەسە

گلـــەیی بێـــخودە «حافز»! لە ســەراوی بەشی خۆ
غـــەزەڵ و تەبعی وەکوو ئـاوی رەوان بۆ مـە بەسە

با نەبێ گفتی لەگـەڵ ئێمـــەیی «کۆلیـل» شـــرین
چەن قســـەی تــاڵ لەسـەر لێوی ئەوان بۆ مـە بەسە

گلعذاری ز گلستان جهان ما را بس
زین چمن سایه‌ی آن سرو روان ما را بس
من و همصحبتی اهل ریا دورم باد
از گرانان جهان رطل گران ما را بس
قصر فردوس به پاداش عمل می‌بخشند
ما که رندیم و گدا دیر مغان ما را بس
بنشین بر لب جوی و گذر عمر ببین
کاین اشارت ز جهان گذران ما را بس
نقد بازار جهان بنگر و آزار جهان
گر شما را نه بس این سود و زیان ما را بس
یار با ماست چه حاجت که زیادت طلبیم
دولت صحبت آن مونس جان ما را بس
از در خویش خدا را به بهشتم مفرست
که سر کوی تو از کون و مکان ما را بس
حافظ از مشرب قسمت گله ناانصافی‌ست
طبع چون آب و غزل‌های روان ما را بس

دڵا! هەواڵی سەفەر بەختی هەمنەواتن هەر
شەماڵی (باخی مکاییل)ـە ڕێنماتن هەر
نەکەی لە مەنزڵی گیانان ئەدی بچی دەروێش!
کە گەنجی مەعانی لە کونجی خانەقاتن هەر
ئەگەر غەمێ لە دڵت داسەپی لە سووچێکۆ
حەریمی پیری موغان خۆ حەرەمپەناتن هەر
لە تەختی مەیکەدە دانیشە خۆش بنۆشە ژەمێ
کە ئەم ئەنازە لە ماڵی جەهان سەفاتن هەر
تەماح کەم کەوە، ئاسانی بگرە لەم دونیا!
شەراب و گەوهەری لێوی ئەوین کەفاتن هەر
بە بێهونەر فەلەك ئاواتی دڵ ئەدات و بەس
هونەرنووێنی ئەوینی کە تۆ خەتاتن هەر
ئەوینی خاکی وڵات و بەڵێنی یاری قەدیم
لە ڕێڕەوانی سەفەرکەردە سەرپەناتن هەر
بە ژێر باری منەت خۆ نەخەی کە دوو دونیا
ڕەزای دڵبەر و ئیحسانی پادشاتن هەر
نیازی دڵ بە موناجات ئەگەر بێ «حافز»!
دوعای نیوەشەو و زیکری سوبحگاتن هەر
لە غەم پڕی پڕە «کۆلیل»و ماتڵی سیحری
خەڵاتی لێوی سەحەرت و گوڵی دوعاتن هەر

دلا رفیـــق سفـــر بخت نیکـــخواهت بس
نسیـــم روضـــه‌ی شیـــراز پیک راهت بس
دگر ز منـــزل جانـــان سفـر مکن درویش
که سیـــر معنـــوی و کنـج خانقـــاهت بس
وگر کمیـــن بگشـــاید غمی ز گوشه‌ی دل
حریـــم درگه پیـــر مغـــان پنـــاهت بس
به صـــدر مصطبه بنشـــین و ساغر می‌نوش
که این‌قدر ز جهان کسب مال و جاهت بس
زیـــادتی مطلب کـــار بر خود آســـان کن
صـــراحی مـی لعـل و بتی چو مـــاهت بس
فلـــک به مـــردم نـــادان دهد زمـــام مـــراد
تو اهـــل فضلـی و دانش همین گناهت بس
هـــوای مسکن مألـــوف و عهـــد یـــار قدیم
ز رهـــروان سفـــر کرده عـــذرخواهت بس
به منت دگران خو مکـــن که در دو جهـــان
رضـــای ایـــزد و انعـــام پادشـــاهت بس
به هیـــچ ورد دگر نیست حاجت ای حافـظ
دعـــای نیـــم شب و درس صبحگاهت بس

ژانـــی عەشقــێ دوچــارمــن کە مەڵـــێ!
ژاری هیجــرێ لە زارمــن کە مەڵـــێ!
پشـکنیـــمن جـەهـــان کە وا ئێستـــا
دڵـــڕفێنـــێک یـــارمــن کە مەڵـــێ
لە فیـــراق و ئەوینـــی خـــاکی دەری
شـــەتی خوێنـــێ لە زارمن کە مەڵـــێ
لە دەمـی دوێنەشـــەو شنـەفتم خـــۆم
گوڵـەباســـێ لە کـــارمن کە مەڵـــێ
لێـو دەگـازێت لێـم مەڵـــێ کە مژیـت
لەعلـی من، ئەونـە عــارمن کە مەڵـــێ!
کۆخـــی دڵ پــڕ لە ڕەنجی دووریتــە
حەسرەتێ کۆڵــەبـارمـن کە مەڵـــێ
وەکـو «حافــز» گەییمـە عەشقی دڵــێ
چـەن بە مەیلی دەمــارمـن کە مەڵـــێ
چەشنی «کۆلیــل» هەر ئـەوەن چەرخیش
شێـــتی بەژنـــی دڵارمـن کە مەڵـــێ

درد عشقی کشیده‌ام که مپرس
زهر هجری چشیده‌ام که مپرس
گشته‌ام در جهان و آخر کار
دلبری برگزیده‌ام که مپرس
آن‌چنان در هوای خاک درش
می‌رود آب دیده‌ام که مپرس
من به گوش خود از دهانش دوش
سخنانی شنیده‌ام که مپرس
سوی من لب چه می‌گزی که مگوی
لب لعلی گزیده‌ام که مپرس
بی تو در کلبه‌ی گدایی خویش
رنج‌هایی کشیده‌ام که مپرس
همچو حافظ غریب در ره عشق
به مقامی رسیده‌ام که مپرس

ئەوەنم پێـن گلە لەو زولفـە ڕەشـەی گیان کە مەڵێـن
وا لە دەس چوو دڵ و دین و سەر و سامـان کە مەڵێن
کەس بە ئـــاواتی وەفـــا خوایە دڵ و دینـی نەچێ
من لـە ئـەم مامـــەڵە وا بوومـە پەشیمـــان کە مەڵێن
بە قومــێ مەی کە کزەی هیچ کەسی نەبووە لە شوێن
ژاری ڕەنجێـــك دەچێـــژم لە نەزانـــان کە مەڵێن
زاهیــد ئەم کۆڕە بە جێ بێڵـــە، لە شەڕ لادە! شەراب
دڵ و دیــن وا دەڕفێنـــێت بە تاڵـــان کە مەڵێن
وتووێـــژێکە لە ئـەم ڕێگە کە دەتوێتـەوە گیـــان
ئۆف‌ئۆفێـــکە نەپرســـی لـەم و لەویـان کە مەڵێن
هێـــوری و خەڵـــوەنشینی مەبـــەسم بوو گـــە بەڵام
کـاری وای کردوە پێم نێـرگزی مەستـان کە مەڵێن
تا وتـم بێـــژمە گۆی شیـنی فەلـەك چۆنی؟ وتی
زڵمی وای کردووە لێم هەڵمەتی گۆچان کە مەڵێن
پێم وت ئەو زولفتــە کێی کوشتـووە کـاڵۆزە؟ وتی
«حافـز»! ئەم باســـە درێــژانە بە قورئـــان کە مەڵێن
گۆشـەیی چـاوی دڵی هەر منی «کۆلیل»ـی نەسووت
سووتمــــانێکە لە کـۆی گۆشـــەنشیـــنان کە مەڵێن

دارم از زلف سیاهش گله چندان که مپرس

که چنان زو شده‌ام بی‌سر و سامان که مپرس

کس به امید وفا ترک دل و دین مکناد

که چنانم من از این کرده پشیمان که مپرس

به یکی جرعه که آزار کسش در پی نیست

زحمتی می‌کشم از مردم نادان که مپرس

زاهد از ما به سلامت بگذر کاین می لعل

دل و دین می‌برد از دست بدان‌سان که مپرس

گفت‌وگوهاست در این راه که جان بگدازد

هر کسی عربده‌ای این‌که مبین آن‌که مپرس

پارسایی و سلامت هوسم بود ولی

شیوه‌ای می‌کند آن نرگس فتان که مپرس

گفتم از گوی فلک صورت حالی پرسم

گفت آن می‌کشم اندر خم چوگان که مپرس

گفتمش زلف به خون که شکستی گفتا

حافظ این قصه دراز است به قرآن که مپرس

دڵ تەنگــە هەمیســان وەرە سا هـاوەڵـی گیـان بە
مەحـرەم بە دەروونی منـی هــاوڕازی غەمـان بە
لەو لەعلــە لە نێـو مەیکــەدەیی عەشقـی دەنۆشن
چەن جــام لە ئەم کۆڕە بە عەشقی رەمــەزان بە
ئەو خەرقـــە ریا لانــەتە یــا شێخ! کە ســووتان
هەوڵـــێ بـــدە پیــاوانە لە رەنـــدانی زەمـــان بە
ئازیـــز کە فەرمـــوویە دڵـــی بـــۆم نیگـــەرانە
فەرمـــوو بە سڵامـــەت ئەوە هـاتم نیگـــەران بە
بەو لەعـــلە ژیــانبەخشتــە دڵ گرتکی خوێنــە
ئەی کــانی کەرەم هەر بە هەمان مۆر و نیشـان بە
نەک تۆزە غەمـــێ بێت و بنیشـــێ لە دڵـــی یـــار
ئەی چــاو! لە شوێن ئەم غەزەڵەی ئێمە رەوان بە
زوو بێـــژە بە «حافز» کە هەوای جامی جەمی پێن
هەر لەحزە لە کۆی ئاسەف و جەمشیدی زەمان بە
«کۆلیـــل»ـە کەسێ دوورە لە گولـــزاری دیـــارت
ئەی دڵ وەکو بولبـــول لە غەمی بەژنی گوڵان بە

بـــازآی و دل تنگ مرا مونس جــان بــاش
وین سوختــه را محـرم اســرار نهــان بــاش
زان بــاده که در میکــده‌ی عشـق فروشنــد
ما را دو سه ســاغر بده و گو رمضــان بــاش
در خرقه چو آتش زدی ای عــارف سالك
جهدی کن و سرحلقه‌ی رندان جهــان بــاش
دلـــدار که گفتـا به تــوام دل نگــران است
گو می‌رسم اینك به سلامت نگــران بــاش
خون شد دلم از حسرت آن لعل روان‌بخش
ای درج محبت به همان مهر و نشــان بــاش
تــا بـــر دلش از غصـــه غبـــاری ننشینـــد
ای سیـــل سرشك از عقب نامه روان بــاش
حافظ که هوس می کنــدش جام جهـان‌بین
گو در نظـر آصف جمشیــد مکــان بــاش

ئەگەر هەواڵــی بە سۆزی، لە هەوڵی پەیمــان بێ
رەفێــقی شــادی و شیــوەن بەهــار و زستــان بێ
کە پێچــی پرچــی پەرێشــان ئەدەی بە دەستی بــا
کەمــێ بە خـــاتر و یـــادی منی پەرێشـــان بێ
کە ئـــارەزووتە لەگـەڵ خـزری دڵ ئەویـنـــداری
نهێن لە چاوی سکەندەر وەک ئاوی حەیــوان بێ
مەقـــامی عەشــق وتـن خۆ لە هــەر مەلــێ نایێ
دەبێ بە بــووکی زەریفی مەلێکی خۆش‌خــان بێ
بە ئێمــە رێ و رەوشــی خزمــەت و غـولامی، تۆ
خودا ببەخشـن و خۆشت سـەرۆک و سوڵتــان بێ
دەخیـــلە! دی لە نەچیــری حەرەم مەکێشە کەوان
لە کــردەوەی لەمــە پێشــت بە دڵ پەشیمـــان بێ
کە مۆمی مەجلیسی، بەس یەک‌زمان و یەک‌دڵ بێ
لەبــەر خەیـــاڵ و خەبـاتی پەپوولە خەنـدان بێ
بە چـــاوی نـــاز روانیـــنە دلبــەری گشتـــی
نـەزەر بە نـــاز بکـــە و بێ‌نەزیـــری دەوران بێ
شکـــات قەت مەکە «حافز» لە یـــار و وس‌کوت بە!
بە ئێـــوە کێ وتی حەیـــرانی بەژنــی یـــاران بێ
لە بەختــی خۆ وەکـو «کۆلیـــل» ماتــم و حەیــران
بە خـاتری دڵــی کــوردم لە فیکری حەیــران بێ

اگر رفیق شفیقی درست پیمان باش
حریف خانه و گرمابه و گلستان باش

شکنج زلف پریشان به دست باد مده
مگو که خاطر عشاق گو پریشان باش

گرت هواست که با خضر همنشین باشی
نهان ز چشم سکندر چو آب حیوان باش

زبور عشق‌نوازی نه کار هر مرغی‌ست
بیا و نوگل این بلبل غزل‌خوان باش

طریق خدمت و آیین بندگی کردن
خدای را که رها کن به ما و سلطان باش

دگر به صید حرم تیغ برمکش زنهار
وزآن که با دل ما کرده‌ای پشیمان باش

تو شمع انجمنی یک زبان و یکدل شو
خیال و کوشش پروانه بین و خندان باش

کمال دلبری و حسن در نظربازی‌ست
به شیوه‌ی نظر از نادران دوران باش

خموش حافظ و از جور یار ناله مکن
تو را که گفت که در روی خوب حیران باش

لە وەرزی لالـــە شـــەرابێک و بێریـــا ژینـــێ
لە بـــۆنی گـوڵ نەفـــەسێک و لەگـــەڵ سەبـــا ژینـــێ

نەکـــەی کە ســـاڵ هەموو هەر لە مـــەیپەرەستی بی
بەهـــــار مەیکـــەدە، بـــاقی لە خـــــانەقا ژینـــێ

کە پیـــری ڕێبـــەری عەشقت شـــەرابی دا وەیخـــۆ!
کە خۆشـــە ماتڵـــی ڕەحمـــی خـــودا وەهـــا ژینـــێ

تەمـــاتە گـــەر وەکـو جـەم تێـــبگەی لە رازی نهێـــن
بە یـــادی خـــاوەنی جـــامی جەهـــاننومـــا ژینـــێ

ئەگەرچی دەرکی جەهان، چەشنی خونچە بەستووە لێت
سەبـــا بە تـــۆ! لە بەهـــاری گرێگوشـــا ژینـــێ

وەفـــا لە کـــەس مەکـــە داوا لـــە مـــن ببیـــسە دڵا!
مـــەڕۆ لە دوی مەلـــی سیمـــورغ و کیمـــیا ژینـــێ

موریـــد و عاشقـــی نەشنـــاسی ڕێ نەبـــی «حافـــز»!
بـــژێ بە هـــاوەڵی ڕەنـــدانی ئاشنـــا ژینـــێ

لەگـــەڵ بیـــانی ئەگـــەر وەک «عومـــەر» ببی ســاتێ
دەبـــی لە مەحـــزەری عەشقـــا بە نـــاشنـــا ژینـــێ

به دور لاله قـــدح گیـــر و بی‌ریـــا می‌بـــاش
به بـــوی گـــل نفســـی همـــدم صبـــا می‌بـــاش
نگویمت که همـــه سالـــه مـــی پرستـــی کـــن
ســـه ماه مـــی خـــور و نه ماه پارســـا می‌بـــاش
چو پیـــر سالک عشقـــت به مـــی حـــواله کند
بنـــوش و منتـــظر رحمـــت خـــدا می‌بـــاش
گرت هواست که چون جم به سرّ غیب رسی
بیـــا و همـــدم جـــام جهـــان‌نمـــا می‌بـــاش
چو غنچه گرچه فـــروبستگی‌ست کـــار جهـــان
تو همچـــو بـــاد بهـــاری گره‌گشـــا می‌بـــاش
وفـــا مجـــوی ز کـــس ور سخـــن نمی‌شنـــوی
به هـــرزه طالب سیمـــرغ و کیمیـــا می‌بـــاش
مریـــد طـــاعت بیگـــانگان مشـــو حافـــظ
ولـــی معـــاشر رنـــدان پارســـا می‌بـــاش

گوڵ بچنە سۆفی دەڵقی ریا کۆڵەوار کە!
ئەم زوهدە تام وشکە بە مەی تامدار کە
کەشفی درۆزنانە لە ڕێی چەنگ و نەی بنێ
تەزوێح و شەپکە نەزری دییەی مەستی یار کە
زوهدی گران کە دلبەر و مەیگێڕ دژ بەون
چاری بە مێر گوڵان و نەسیمی بەهار کە
یاقووتی مەی رفانی دڵ ئەی میری عاشقان!
خوێنم حەلاڵی چاڵی چناکەی نیگار کە
تاوانی ئێمە خوایە ببەخشی لە فەسڵی گوڵ!
ئەم رەحمەتەت بە عەشقی گوڵاڵەی نسار کە
ئەی ئەو کەسەی کە کەوسەری ئاوات نۆش ئەکەی
لەم بەحرە یەک دڵۆپە لە زاری هەژار کە
شوکری ئەوەی نەکەوتییە بەر سیحری کوڵمی یار
دەرحەق بە ئێمە سۆفی! وەکوو کردگار کە
ساقی! کە شا سەبووحی ئەنۆشێ بڵێ خەلات
جامێ بە «خاجە» شێخی شەوانە بێدار کە
«کۆلیل»! یار ژیرە، لە جێی ماچی لەعلی لێو
هەر باسی شەکرە سێو و شەراب و هەنار کە

صوفی گلی بچین و مرقع به خار بخش
وین زهد خشک را به می خوشگوار بخش
طامات و شطح در ره آهنگ چنگ نه
تسبیح و طیلسان به می و میگسار بخش
زهد گران که شاهد و ساقی نمی‌خرند
در حلقه‌ی چمن به نسیم بهار بخش
راهم شراب لعل زد ای میر عاشقان
خون مرا به چاه زنخدان یار بخش
یا رب به وقت گل گنه بنده عفو کن
وین ماجرا به سرو لب جویبار بخش
ای آن‌که ره به مشرب مقصود برده‌ای
زین بحر قطره‌ای به من خاکسار بخش
شکرانه را که چشم تو روی بتان ندید
ما را به عفو و لطف خداوندگار بخش
ساقی چو شاه نوش کند باده‌ی صبوح
گو جام زر به حافظ شب‌زنده‌دار بخش

باخـــەوان ئەر سـەردەمێکی هـــاودەمی گوڵ لازمە
سەبـری ئێشی دڕکی دووری چەشنـی بولبـول لازمە
قەت لە بەنـــدی زولفیـا ئەی دڵ! پەرێشـانی نەکەی
بۆ مەلـی وریــا لە تــۆی داوا تەحەممــوڵ لازمە
کەی قەڵەندەر وا لە هەوڵی موڵك و داهاتووی ژیان
بۆ ئـەوەی سوڵتــانی خـاوەن تەختـە تامــڵ لازمە
پۆزی عیــلم و دیــن بە قـــانوونی تەرێقەت کافرین
سـەد کەمــاڵیشی ببـێ رێــڕەو تەوەککـول لازمە
دەك قوزڵقــورد و حەرامـی بێ! نەزەربازی، کەسێ
جێ لە تۆ بێژی کە روی گوڵ بۆنـی سومبـوڵ لازمە
نێــر گزی مەستت دەبێ نـــازی بکێشـــم چونکە بـۆ
ئەو دڵــەی مـات و مەلـوولم لوولـی کاکوڵ لازمە
دوو دڵی تا کـەی؟ ئەدی ساقی بە گەردش بێنە جام!
چون لە نۆبــەی عاشقــان دەوری تەسـەلسـول لازمە
کێیە «حافز» کێ؟! نەنۆشی مەی بە بێ ساز و سورروود
عاشقـی بێـــچارە کەی ئەونــەی تەجەممــوڵ لازمە
من کە شێتم، سۆزی سازی سینگی «کۆلیـل»ـم دەوێ
تیـپی مووسیقــا لە کــۆڕی ژیـــر و عاقــڵ لازمە

باغبان گر پنج روزی صحبت گل بایدش
بر جفای خار هجران صبر بلبل بایدش

ای دل اندر بند زلفش از پریشانی منال
مرغ زیرک چون به دام افتد تحمل بایدش

رند عالم‌سوز را با مصلحت‌بینی چه کار
کار ملک است آن‌که تدبیر و تأمل بایدش

تکیه بر تقوا و دانش در طریقت کافری‌ست
راهرو گر صد هنر دارد توکل بایدش

با چنین زلف و رخش بادا نظربازی حرام
هر که روی یاسمین و جعد سنبل بایدش

نازها زان نرگس مستانه‌اش باید کشید
این دل شوریده تا آن جعد و کاکل بایدش

ساقیا در گردش ساغر تعلل تا به چند
دور چون با عاشقان افتد تسلسل بایدش

کیست حافظ تا ننوشد باده بی‌آواز رود
عاشق مسکین چرا چندین تجمل بایدش

فیکری بولبول هەر ئەوەن گوڵ لە چەمەن یـاریەتی
گوڵ سـەری گەرمـە کە چـۆن نـاز بکا بـاریەتی
دڵڕفێنـی ئەوە نیـن گشتی کە عاشـق بکـوژی
دڵبـەری گـەورە غەمـی مەڵهـەمی کڕیـاریەتی
حەقیـە یاقـووت شەپـۆلی غـەم و خوێنی لە دڵە
کاسـەکەل چونکە دژی رەونـەقی بـازاڕیەتی
کەرەمـی گوڵ کە نەبووبـایە چلۆن بولبـولی شەو
ئـەو هـەموو نـەزم و هـەوا خۆشـە لە نێو زاریەتی
ئەی ئەوەی دێی و لە کۆڵانی گوڵی مەت گوزەرە
خۆ لـەوێ لادە کە خوێنـین دەر و دیـواریەتی
ئەو سـەفەرکەردە کە سەد خێڵی دڵی چوو لەگەڵا
وا لـە هـەرجێگـە خوداوەنـد نیگـاداریەتی
باسـی دڵ هێـوری ئازیـزا! لە ژیـن خۆشـە بەلاّم
هەرکە دەرد و غەمـی عەشقی نیـیە ژین بـاریەتی
هـەر بە دەورێک کلاّوی فـڕەدا سۆفی ئەگـەر
نۆبـەتی بێـتەوە نۆبـەی سـەری بیمـاریەتی
دڵی «حافـز» بە بەهـاری دییـەنت گـۆچ کـرا
مـەدە ئـازاری کەسێ بەستـە بە نـازاریەتی
بولبـولی بەژنی دیـارت لەوەتـا دوورە لە گوڵ
وەکـو «کـۆلیـل» بـە دڵ نالـە و هـاواریەتی

فکـــر بلبـــل همه آن است که گـل شـد یـــارش
گل در اندیشــه که چون عشــوه کند در کارش

دلـــربایی همــه آن نیست که عاشـــق بکشـــند
خواجــه آن است که باشــد غــم خدمتگـــارش

جـای آن است که خـون مـوج زند در دل لعـل
زین تغـــابن که خـــزف می‌شکنـــد بـــازارش

بلبـــل از فیـض گل آموخت سخن ور نه نبـود
این همـــه قـــول و غـــزل تعبـــیه در منقـــارش

ای که در کوچـه‌ی معشوقـه‌ی مـــا می‌گذری
بر حـــذر بـــاش که ســـر می‌شکنـد دیـــوارش

آن سفـــر کرده که صـــد قافله دل همـــره اوست
هر کجـــا هست خدایـــا به ســـلامت دارش

صحبت عـــافیتت گرچــه خوش افتـــاد ای دل
جـــانب عشـق عزیـــز است فـــرومگـــذارش

صوفی سرخوش از این دست که کج کرد کلاه
به دو جـــام دگـر آشفتـــه شود دستـــارش

دل حافـــظ که به دیـــدار تو خوگر شـده بود
نـــازپـرورد وصـــال است مجـــو آزارش

شــەرابێکی وەهــا تاڵــم دەوێ رۆستــەمخەوێن زۆری
هەتـا ســاتێ نەبـم ئاگـا لە دونیــا و شـــەڕ و شـۆڕی
لەسەر سفرەی زەمانەی سپڵەپەروەر قەت نەبوو شەکرێ
بشـۆ ئەی دڵ تەمــاحی چەشتنی تـاڵ و مـەزەی شۆری
دە سـا جامێ! لە چنگی ئاسمـان کەس دەرنەچوو ساقی!
چ زوهـرەی دەس بە چەنگی یا چ مەڕڕیخـی سەلەحشۆری
کەمەنــدی راوی بـارامی فـڕێ دەن، جامی جەم بگرن!
کە من پێـــوامە ئەم چۆڵگـــا نە بـارامێ کە نا گـۆری
دەبێ! تــا رازی چەرخت بۆ لــە کوڵمــی جـام بنوێنم
بە مەرجــێ نەینـووێنی بۆ هەموو بێزەوقـی دڵ کــۆری
لە دەروێشـان بە چـاوی گەورەیی هەر گەورە دەڕوانێ
سولەیمــان بەو هەمـوو سامـــانە لوتفی بوو لەگەڵ مـۆری
کەمــانی دوو برۆی گیانـــانی «حافز» ســەر بە فەرمـانن
بەڵامــێ پێکەنیـــنم دێ بە پەنجــە و باســـکی بێزۆری
لە (مــانی) نایــە کێشـــانی کەمــانی شــەوبرۆی ئەمما
لە ناخـــی شیعـــری «کۆلیـــل»ـا خەمیداوە کـەم و زۆری

شراب تلخ می‌خواهم که مردافکن بود زورش
که تا یکدم بیاسایم ز دنیا و شر و شورش
سماط دهر دون‌پرور ندارد شهد آسایش
مذاق حرص و آز ای دل بشو از تلخ و از شورش
بیاور می که نتوان شد ز مکر آسمان ایمن
به لعب زهره‌ی چنگی و مریخ سلحشورش
کمند صید بهرامی بیفکن جام جم بردار
که من پیمودم این صحرا نه بهرام است و نه گورش
بیا تا در می صافیت راز دهر بنمایم
به شرط آن که ننمایی به کج‌طبعان دل‌کورش
نظر کردن به درویشان منافی بزرگی نیست
سلیمان با چنان حشمت نظرها بود با مورش
کمان ابروی جانان نمی‌پیچد سر از حافظ
ولیکن خنده می‌آید بدین بازوی بی‌زورش

بەهەشتی خوایە شیراز و مەحالّی — کە یارەب قەت نەگا رۆژی زەوالّی

لە روکنابادی دەك چاوی چەپەلّ دوورا — کە عومری خزر ئەدا ئاوی زولاّلی

لە بەینی جافرئاوای و موسەلّلا — لەگەلّ عەتری گولاّن دیّ با شەمالّی

بە شیرازم وەرن تا رۆحی پاکی — بە دەس بیّنن لە خەلّکی پڕ کەمالّی

نەبات و قەندی میسری شەرمەزارن — لە باخی شەکرە سیّو و پرتەقالّی

سەبا لەو دلّبەرەی سەرمەستی ئیّمە — چەنیّکت پیّیە باس و چۆنە حالّی

ئەگەر ئەو شۆخە بیّ خویّنم بڕیّژیّ — دەلّیّم وەك شیری داکی خۆی حەلاّلی

لە خەونم هەلّنەسیّنی تۆخودا چون — خەیالّم وا لە خەلّوەتگەی خەیالّی

کە ترست بوو لە دووری «حافز»ا بۆچ؟! — نەبوو شوکرت لە رۆژانی ویسالّی

منیش «کۆلیل»ی ناشوکریم کە دوورم — لە یاران و هەوالاّنی منالّی

***

منیش لام وایە کوردستان بەهەشتە — کە یارەب شیرنی کەی رۆژی تالّی!

لە ئاوی چلچەمەی چاوی چەپەلّ دوور — کە خزر ئیستەش دەپرسیّ هەر هەوالّی

لە شاهۆ تا بە زمزیران و حەمرین — لە قەندیل و سەکۆ تا چەمچەمالّی

هەوازۆ تا بە هەورامانی سەربەرز — بە زریان مۆلّەتیّ نادا شەمالّی

کە نیّوی دیّتە گۆڕیّ تەختی جەمشید — قەلاّی بەرزی کەرەفتوو وا لەپالّی

وەرن بۆ سەققز و فیّری هونەر بن — لە پەنجەی میّشکی خەلّکی هەر مەحالّی

خوشا شیراز و وضع بی‌مثالش
خداوندا نگه‌دار از زوالش
ز رکن‌آباد ما صد لوحش الله
که عمر خضر می‌بخشد زلالش
میان جعفرآباد و مصلّا
عبیرآمیز می‌آید شمالش
به شیراز آی و فیض روح قدسی
بجوی از مردم صاحب کمالش
که نام قند مصری برد آن‌جا
که شیرینان ندادند انفعالش
صبا زان لولی شنگول سرمست
چه داری آگهی چون است حالش
گر آن شیرین پسر خونم بریزد
دلا چون شیر مادر کن حلالش
مکن از خواب بیدارم خدا را
که دارم خلوتی خوش با خیالش
چرا حافظ چو می‌ترسیدی از هجر
نکردی شکر ایام وصالش

هەتا شکـــانی سەبـا عەتـری زولفـی ڕێحـانی
لە هـەر شکـــاو دڵی دا، گـــرێ شکـا گیــانی
لە کوێیــە هـەمنەفەســێ تا تـەواوی هەڵــڕێژم
کە دڵ لە گـوڵ چ دەکێشێت و جەوری هیجرانی
پــەڕی گوڵی وەکو کوڵمت زەمــانە تـا دەق دا
بە خونچــە کردی لە شــەرما قەتیس و زینـدانی
خەیاڵ و خەونە گەیشتن بە حەدد و مەرزی ئەوین
تەحـا لە دووریی ئـەم ڕێ کە حەشـرە پایـانی
گەلێــکی دڵ چـووە پێـدا لە دڕکی ئـەم چـۆڵە
دیـــاری یـــار مەگــەر بێ بگـا بە پاکـــانی
بە ئەم چەمـــاوە لە مـــاڵی غەما کەسێ خەبـەری
نەدا لە یۆسفــی دڵــم و لە کوڵمــی ڕەخشـانی
شکــاتی جەوری دەکــەم لا عەداڵــەتی خاجــە
کە گیــانی «حافز»ی خنکـان بە فێڵی زولفـانی
وەلێ شکــایەتی «کۆلیل» کورتە کەی بە غـەزەڵ
دەسێ دەگــا بە مەقــاماتی زولفـی پەخشـــانی

چو بر شکست صبا زلف عنبرافشانش
به هر شکسته که پیوست تازه شد جانش

کجاست هم‌نفسی تا به شرح عرضه دهم
که دل چه می‌کشد از روزگار هجرانش

زمانه از ورق گل مثال روی تو بست
ولی ز شرم تو در غنچه کرد پنهانش

تو خفته‌ای و نشد عشق را کرانه پدید
تَبارَکَ الله از این ره که نیست پایانش

جمال کعبه مگر عذر ره روان خواهد
که جان زنده‌دلان سوخت در بیابانش

بدین شکسته بیت‌الحزن که می‌آرد
نشان یوسف دل از چه زنخدانش

بگیرم آن سر زلف و به دست خواجه دهم
که سوخت حافظ بیدل ز مکر و دستانش

یاڕەب ئەم شاگوڵــە شــادانە لە کن مەی کە دەنی
دەیسپـێرم بە دەسـی ئێـوە لە بوخڵـی چەمـەنی
ئەو ئەگەرچی لە وەفـا دوورە بە بێ‌مـەرز و سنوور
دوور بێت ئافـــەتی دەوران لە بەهــاری بـەدەنی
ئەی سەبا هەرچی گەیشتیت بە کۆی بـاخ و چەمەن
ســەد سـڵاوم بکـە شابـاشی قــەدی نـارەوەنی
نــازی ئەو زولفــە رەشـانەی بکە ئەمما بە ئەدەب
چون گەلێ جەم دڵی ئازیـزە لە موشکی خوتـەنی
بێـــژە قەرزارە خــەت و خـاڵی بە پەیمــانی دڵم
حورمەتی فـەرزە لەسەر کاکوڵی سومبوڵشکـەنی
لەو مەقــامەی بە حەزی لێـوی لەسەر بـادە دەنێن
سپڵــە ئەو مەستــەیە ئاگـا لە سەرە و چۆن و چـەنی
ســەر و سامـــان لە دەری مەیکــەدە نـابێت و نیــیە
هەر کە لەو ئاویە نۆشـی سـەری چوو ماڵی چەنی
دڵ کە ترسا لە مەلــوولی، غـەمی عەشقی بە حەرام!
ســەری ئێمــە و قەدەمی مــاچ لە من لەو زەقـەنی
غەزەڵی «خاجە» شەمی حیکمەتە شـابەیتە هەمووی
ئافـــەرین بۆ غەزەڵی دڵگـر و شەکری سوخــەنی
شیعــری «کۆلیل» بە گشتی شـەوی بەیتــولحەزەنە
غەمی هیجرانە هەموو فیکری دڵ و گیــان و تــەنی

یا رب این نو گل خندان که سپردی به منش

می‌سپـــارم به تو از چشـــم حسـود چمنش

گرچه از کوی وفا گشت به صد مرحله دور

دور بـــاد آفت دور فـلك از جـان و تنش

گر به سرمنـــزل سلمی رسـی ای بـاد صبـا

چشـــم دارم که سـلامی برسـانی ز منـش

به ادب نافـــه گشایی کن از آن زلـف سیاه

جـای دل‌های عزیز است به هـم برمزنـــش

گو دلـم حق وفـــا با خط و خـــالت دارد

محتـــرم دار در آن طـــرّه‌ی عنـــبرشکنش

در مقـــامی که به یـــاد لب او می نوشنـد

سفلـه آن مست که باشد خبر از خویشتنش

عـرض و مـال از در میخانه نشـاید اندوخت

هر که این آب خورد رخت به دریـا فکنش

هر که ترســد ز مـلال انده عشقش نه حلال

ســر مـا و قـدمـش یا لـب مـــا و دهنـــش

شعـــر حافظ همه بیت‌الغـــزل معرفت است

آفـــرین بر نفس دلکش و لطـف سخنـش

لە دڵ ئـــارامی بـــردم وەک لە ســـەر هـــۆش
گوڵی بێ‌رەحم و نەسرین کوڵم و رووخۆش

لەتیـــف و مـــانگ‌ڕوو مامـــز رەمـــۆکێ
کلاوزەڕ شۆخ و چاوڕەش شەنگ و تەڕپۆش

لە تـــاوی ئاگـــری گـــەرمی ئەوینـــی
دەجۆشـــێ سیـــنە دایم چەشنـــی حەوجۆش

دڵـــم هێـــور دەبـــێ عەینـــی کـــراسی
کـــەوا ئاســـای ئەگـــەر بگـــرم لە ئاغـــۆش

بهـــاری ئـاشـــی گـــەردون پێشـــەکانـــم
لە گیـــانم عەشقـــی تۆ نـابێ فەرامـــۆش

دڵ و دینـــــی، دڵ و دینـــــی رفـــــانـــم
ســـەر وکۆشی، ســـەر وکۆشی، ســـەر وکۆش

شفـــا «حافـــز» شفـــا «حافـــز» شفـــایە
لە لێـــوی مەی، لە لێـــوی مەی بکەی نـۆش

لە سیحـــری قـــامەتی حەیـــرانە «کۆلیـــل»
نمـــامی ســـەروە چـی گرتوویە لیمـــۆش





ببـــرد از من قــرار و طاقت و هوش

بت سنگیــن‌دل سیمیــن بنـــاگوش

نگـــاری چـــابکی شنـگی کلــه‌دار

ظــریفی مهــوشی ترکــی قبـــاپوش

ز تـــاب آتش ســـودای عشقــش

به‌ســـان دیگ دایم می‌زنـم جـوش

چو پیـــراهن شــوم آســوده خـــاطر

گرش همچـون قبـا گیرم در آغـوش

اگر پوسیـــده گـــردد استخـــوانم

نگـردد مهــرت از جــانم فرامــوش

دل و دینــم دل و دینــم ببــرده‌ست

بر و دوشش بر و دوشـش بر و دوش

دوای تـــو دوای توســت حــافــظ

لب نوشـــش لب نوشــش لب نوش

سەحـــەر لە عــالەمی غەیبــم درا بە دڵ خەبــەرێ
کە دەوری شــاهـ شوجــاعە و شــەراب هاتــە بەرێ
بەســەر چــو ئەو دەمــە خــاوەن نەزەر هــەزار نــەزم
تەقـــەڵ درابــو لە لێـــوی کە نــم نـــەدا نـــەزەرێ
بە دەنـگی چەنـگی مە گــەر بێــژم ئەو هەمــوو رازە
کە مەنجــەڵی دڵ ئەجۆشـا لە سۆزی وا کەسـەرێ
شـــەرابی مـــاڵ دەترســا لــە بـــەردی دارۆغــە
هەرایـــە، نۆشـــە، ئەمێستا بە ئەمری بەختــەوەرێ
بە کــۆڵ موفتــیــی ئەم شــارەیان شــەوی پێشــوو
لە ئەرکــی مەیکـــەدە عابـا لە کـۆڵ خستــە دەرێ
دڵا ریا مەکە، خۆ هەڵمەکێشــە قــەت بە گونــاح!
کە رێی نەجاتت ئەمەن هەر، لەهەر تەڵەی خەتەرێ
مەقــامی تــووری سنیــن، واتــە زەینــی رۆشنــی یــار
حوزووری وانت ئــەوێ دڵ بشــۆ لە هەرکــەدەرێ
نەکەی شکۆی کەمـــاڵی نەکەی بە زیکری دڵت
کە گیــانی مەحرەمە هۆشی، بە هەر سرۆشی ســەرێ
سەڵاحی مەملەکەت و خەڵکی، خوسرەوان بەڵەدن
بە خێــڵی خەڵوەنشین «خاجە»! نین وەها هونــەرێ
ئەمێستە هەرکەسە «کۆلیـل»ـی جەوری ناکەسـە وا
رژاوە خوێنــی هونــەر پڕ بە دەشتــی هەر دەوەرێ

سحر ز هاتف غیبم رسید مژده به گوش
که دور شـاه شجاع است مـی دلیر بنوش
شـد آن کـه اهل نظر بر کناره می‌رفتـند
هـزار گونه سخن در دهان و لب خاموش
به صوت چنگ بگوییـم آن حکـایت‌ها
که از نهفتن آن دیگ سیـنه می‌زد جوش
شـراب خـانگی تـرس محتسب خورده
به روی یـار بنوشیـم و بانگ نوشـانوش
ز کوی میکـده دوشش به دوش می‌بردند
امام شهر که سجـاده می‌کشیـد به دوش
دلا دلالت خیـرت کنـم به راه نجـات
مکن به فسق مباهات و زهـد هم مفروش
محـل نور تجلـی‌ست رای انـور شـاه
چو قـرب او طلبی در صفـای نیت کوش
بجـز ثنای جـلالش مسـاز ورد ضمیـر
که هست گوش دلش محرم پیام سـروش
رمـوز مصلحت ملک خسـروان داننـد
گـدای گوشه‌نشینی تو حافظا مخروش

دوێنــە لە مەیخــانەوە دەنگــێ دەهــات
بــادە لە ســەر نێ کە دەبەخشــن گونــات
مــوژدە دەهێنــێت فــریشتــــەی پەیــام
هــەوری کــەرەم پڕیــە لە ئـاوی حەیـات
ئەو ســـەرە ســەردەم بەرە مەیخـــانە! تـــا
خوێنــی بجــۆشــێ بە شــەرابی نەجـات
هەرچــی وزەت پێــیە دڵا بیــخە کــار!
گەرچی گەیشتــن نە بە هەوڵـە و خەبـات
ڕەحمــی خودا ســەر لە گوناحــانی مــەن
وس بــە! کە ئەم قوفڵـــە بە تۆ هەڵنەهــات
گوێی من و حەڵقەی قژی تۆ، مـەیفرۆش!
ڕوومــەتی ئێمــە و کەرەمی خــاکی پــات
کەی وەکو یەک وایە هەڵـــەی «حافــز» و
مــەرحەمـــــەتی پادشـــەهی کائینــات
حاکمــی دیــن شـــاهـ شوجــاعێ کە وا
حەزرەتـــی جیبریـــل بە غوڵامی دەکــات
دوور لە چـــاو و نـــەزەری پیـــس بــێ!
شــای فەلەکول‌ئەتڵەسی هەر ســەر بخــات
هەرکەســە «کۆلیــل»ـی کەسێــکە و منیش
شێـتی هەوای هەستــە (ئەوا ڕۆژ هــەڵات)

هاتفی از گوشـــه‌ی میخـــانه دوش
گفت ببخشنـــد گنــه مــی بنــوش
لطف الهـــی بکنـد کــار خویـش
مـژده‌ی رحمـت برســاند ســروش
این خـــرد خــام به میخــانه بــــر
تا مـی لعـل آوردش خون به جـوش
گرچـه وصـالش نه به کوشش دهنـد
هر قـــدر ای دل که توانـی بکـوش
لطف خـدا بیش‌تـر از جـرم ماست
نکتــه‌ی سربستـه چه دانی خمــوش
گــوش من و حلقــه‌ی گیسوی یــار
روی من و خـــاک در مـی فـــروش
رندی حافـظ نه گنــاهی‌ست صعب
بـــا کـــرم پادشـــه عیـب‌پـــوش
داور دین شـــاه شجاع آن‌کـه کــرد
روح قـدس حلقـه‌ی امرش به گوش
ای ملـک العــرش مـــرادش بــده
وز خطـــر چشـــم بــدش دار گوش

لێــوانە جــامی «حــافز» و موفتـــی پییـــاڵە نـــۆش
چەن خۆشە دەوری شاهی خەتـابەخش و عەیبـەپۆش
سۆفی لە کونجی مەیکـەدە کووپەی لە کـۆش گرت
وەختێ کە دیتــی موحتـەسیبی شـــار خــوم بە دۆش
قـــازی و شێـــخ بۆچیــــیە وەک جوو نهێن دەخۆن
پرسیم سەحـــەر لە پیــری ئەویــن واتە مــەیفرۆش
فەرمــوی کە هێڵـــی ســووره وەڵامی هــەواڵـی وا
بێـدەنگ بە، مـەی بنۆشـە، لە سەر لاوە فیکر و هۆش!
مەیگێـــڕ! وا بەهـــارە نەمـــا زێـــڕی بـــادە، گـەر
فیکـرێ نەکەی لە گوێنی مەیم سیـــنە هاتـــە جۆش
گەنجــی و بەهـــــار و عەشقـــــە لە گیـرفانی خاڵیا
کۆ بوونـــەتۆ، ببـــووره لە تـــاوانی مـــەی پـەرۆش
تا کەی زمــانی چەور و قسەی گەرمـی چەشنی شەم
وادەی گەیــی پەپــوولە، بە بێـــدەنگی بگرە کـۆش!
ئەی ســەروەری کەمــاڵ و جەمــاڵێ کە چەشنـی تۆ
بە گوێی کەســێ نەهــات و گــلارێ نەبوو لە تـۆش
عومــری بە پیـت و ئەفســەری بەختـت لە سـەر! هەتا
ئەو خەرقە شینە دەگری لە دەس چەرخی کۆنـەپۆش
ئەو شـــاریارە «کۆلیـــل»! غــەزەڵ حورمـــەتێ دەنــێ
گوێبیستە بۆ وتــاری قەڵـەم، شیعــری تـاڵ و خـۆش

در عهد پادشاه خطابخش جرم‌پوش
حافظ قرابه‌کش شد و مفتی پیاله‌نوش
صوفی ز کنج صومعه با پای خم نشست
تا دید محتسب که سبو می‌کشد به دوش
احوال شیخ و قاضی و شرب الیهودشان
کردم سال صبحدم از پیر می‌فروش
گفتا نه گفتنی‌ست سخن گرچه محرمی
درکش زبان و پرده نگه‌دار و می بنوش
ساقی بهار می‌رسد و وجه می‌نماند
فکری بکن که خون دل آمد ز غم به جوش
عشق است و مفلسی و جوانی و نوبهار
عذرم پذیر و جرم به ذیل کرم بپوش
تا چند همچو شمع زبان‌آوری کنی
پروانه‌ی مراد رسید ای محب خموش
ای پادشاه صورت و معنی که مثل تو
نادیده هیچ دیده و نشنیده هیچ گوش
چندان بمان که خرقه‌ی ازرق کند قبول
بخت جوانت از فلک پیر ژنده‌پوش

دوێنەشــەو فەرمـوی نهێنـی پێم حەکیمێ سەر بە هۆش
من لە ئێوەی چۆن وەشارم رەمز و رازی مــەیفرۆش
پی وتم ئاســان لەسـەر خۆ بگرە فەرمــان چـون سرشت
سەختی ئەگـرێ کار و باری مەردومانی سەخت کۆش
جا وەهــا جامێـــکی پێــم بەخشـی لە شەوقا هەڵپەڕی
زوهرە کیژی ئاسمانی، کەف بە دەف دەیوت کە نۆش
بۆ دڵی خوێنین بـزەی لێـو بێنە! وەک جامی شەراب
نەک بە زەربێ چەشنی چەنگ، ئامان و ناڵەی پڕخورۆش
ئاشنــا هەرکـەس نەبوو، لـەم پەردە رازێکـی نەبیست
چونکە نامەحــرەم نەبیسێ چــاکە دەنگی نەرم و خۆش
ئەی کـوڕم گوێ بگرە بۆم بۆ مـاڵی دونیا غـەم نەخۆی!
گەوهــەرن پەنـدی من ئــاخۆ چۆنی هەڵبگری ئەتۆش
مەجلیســـی دڵبـــەر مەیـــانی گفتـــمانی تۆ نیـــیە
چون لەوێ ئـازای ئەنـامت هەر دەبێ چەم بێت و گۆش
خۆنــووێنی کەی لـە کــۆڕی گــەورەیانا ئـاقڵــین؟
یا دەبێ لێــوت نەبـــزوێ یا ســەرت پڕ بێ لە هۆش
ساقیــا مەی تێکــە! کەس نەیـزانی «حافز» چەندە رەند
غەیـری ئاسـەف دەس دڵی حاتــەم، دڵـی تــاوانپۆش
تۆ کە سوڵتــانی بەهـــاری لوتفــی، نازانــی مەگــەر
چەنــدە دڵ «کۆلیـــل»ی بـارانی سەخــاتانە و پەرۆش

دوش با من گفت پنهان کاردانی تیزهوش
وز شما پنهان نشاید کرد سرّ می‌فروش
گفت آسان گیر بر خود کارها کز روی طبع
سخت می گردد جهان بر مردمان سخت کوش
وانگهم در داد جامی کز فروغش بر فلک
زهره در رقص آمد و بربطزنان می گفت نوش
با دل خونین لب خندان بیاور همچو جام
نی گرت زخمی رسد آیی چو چنگ اندر خروش
تا نگردی آشنا زین پرده رمزی نشنوی
گوش نامحرم نباشد جای پیغام سروش
گوش کن پند ای پسر وز بهر دنیا غم مخور
گفتمت چون در حدیثی گر توانی داشت هوش
در حریم عشق نتوان زد دم از گفت و شنید
زآن‌که آن‌جا جمله اعضا چشم باید بود و گوش
بر بساط نکته‌دانان خودفروشی شرط نیست
یا سخن دانسته گو ای مرد عاقل یا خموش
ساقیا می ده که رندی‌های حافظ فهم کرد
آصف صاحب‌قران جرم‌بخش عیب پوش

ئەی لە سـەر تا بە قـەدەم قامـەتی ڕەعنـات خۆشـە
چ بـزەی لێـوی شەکـەربار، چ قـاقـات خۆشـە
عەینـی گوڵبـەرگی تـەڕ و تـازە هەمـوو ئوکسیژنی
چەشنی سەروی چەمەنی سەوزی، سەراپات خۆشـە
شێـوەیی نـاز شـرین نـەرم و نیـان و نمـەکین
چـاو و ئەبـرۆ، خەت و خـاڵ و قەد و باڵات خۆشـە
هەم خەیاڵی سـەرە نەخشینـە بە گوڵـزاری هـەوات
هـەم دەمـاغی دڵـە موشکیـن بە چلیـپات خۆشـە
سـەرەڕێی عەشقـی کە سێـڵاوی بەلاگـرتووە لێم
دڵ بە ئـاواتی گوڵـی بـاخی مولاقـات خۆشـە
چۆن سپـاسی بکـەم ئەو چـاوە نەخۆشـەت کە دەڵێ
ئەم نەخۆشیمـە بە دیـداری دو گۆنـات خۆشـە
خەتەری زۆرە لە چۆڵگەی حەزی تۆ گەرچی خەبات
«حافـز»ی عاشـق ئەدا هـەوڵ و بە هیـوات خۆشـە
نەشتـەری تیـژی دڕوی چۆڵـی ئەوین خۆشە لە پام
سـەری «کۆلیـل» دەمێ بیخـەیە ژێر پـات خۆشـە

ای همه شکل تو مطبوع و همه جای تو خوش
دلم از عشوه‌ی شیرین شکرخای تو خوش
همچو گلبرگ طری هست وجود تو لطیف
همچو سرو چمن خلد سراپای تو خوش
شیوه و ناز تو شیرین خط و خال تو ملیح
چشم و ابروی تو زیبا قد و بالای تو خوش
هم گلستان خیالم ز تو پرنقش و نگار
هم مشام دلم از زلف سمن‌سای تو خوش
در ره عشق که از سیل بلا نیست گذار
کرده‌ام خاطر خود را به تمنای تو خوش
شکر چشم تو چه گویم که بدان بیماری
می‌کند درد مرا از رخ زیبای تو خوش
در بیابان طلب گرچه ز هر سو خطری‌ست
می‌رود حافظ بیدل به تولای تو خوش

چ خۆشن لێــوی چــۆم و سێــبەری بی، شیعر و یاریٚ خۆش
لەگەڵ شۆخی شــرین، دلبــەر، لەگەڵ ســاقی، بەهاریٚ خۆش
ئەریٚ ئەی بەختــەوەر، ئەی ئەو کەسـەی قەدری تەمەن دەگری!
بە نــۆشت شۆخــی و شـــایی کە خۆشــی رۆژگـــاریٚ خۆش
کەســـیٚ تــۆزی غەمــی عەشقــی لە لێــوی خاتــرا بـــارە
بسووتێـــنیٚ بڵێـــن ئەسپــەنەریٚ بۆ حیفزی بـــاریٚ خۆش
بە فیکـــریٚ تــازە هــەردەم بــووکی تەبعی خۆ دەخەملێـــنم
لە دەستــی رۆژگـــارم دەسکــەویٚ بەڵکــوو نیگـــاریٚ خۆش
شـــەوی دیـــدار تا رەخســـا مـــەرام و کـــامی دڵ بگـــرە!
لە روخســـاری چـــراخانی، لە بـــاخی لالـــەزاریٚ خۆش
شـــەرابیٚ وا لە جـــامی چـــاوی مەیگێـــڕا کە ماشـــەڵڵا
دەکـــا مەستی لەگــەڵ ئەقــڵ و ئەدا حــاڵی خومـــاریٚ خۆش
بەتاڵـــی چوو تەمـــەن «حافــز»! لەگەڵمـــا بێـرە مەیخـــانە
کە شەنگۆلانی خۆشڕوو بەشکە فێرت کەن بە کـــاریٚ خۆش
تەمـــەن «کۆلیل»! هەرچـــەن چوو بە فیـــڕۆ، دەرفـــەتیٚ مـــاوە
لە مـــافی کیـــژی کوردستـــان بڵیٚ شیعـــر و وتـــاریٚ خۆش

کنـــار آب و پـــای بیـــد و طبع شعر و یـاری خوش
معــاشر دلبـــری شیـــرین و ســاقی گلعذاری خوش
الا ای دولتـــی طـــالع که قـــدر وقت می‌دانـی
گوارا بادت این عشرت که داری روزگاری خوش
هر آن‌کس را که در خاطر ز عشق دلبری باری‌ست
سپـــندی گو بر آتش نه که دارد کار و باری خوش
عـــروس طبـع را زیـــور ز فکـــر بکـــر می‌بنـــدم
بود کز دست ایامـــم به دست افتـــد نگاری خوش
شب صحبـت غنیمت دان و داد خوشـــدلی بستـــان
که مهتابی دل‌افـروز است و طرف لاله‌زاری خوش
مـــی‌ای در کاســه‌ی چشـم است ساقی را بنامیـــزد
که مستی می‌کند با عقل و می‌بخشد خماری خوش
به غفلت عمـــر شـــد حافـــظ بیا بـــا ما به میخـــانه
که شنگولان خوش‌باشـــت بیـــاموزند کاری خوش

ڕوومـــەتی مانگی پـڕە و کـانی کـەرەم شـاسەنەمە
بیـــدەیێ عەشــق و وەفــا خوایە کە هەر ئەویـە کەمە
نیــیە تــاوانی بە شـۆخی بکـوژێ شـۆخ ئەگـــەرم
چونکـــە ناباڵقـــە وشــرێ نیـیـە ئـــازا لە غەمـە
هەر ئـەوەم چـــاکە کە لــەو چـاك دڵم ڕابگــــرم
ناشنـــــای ڕێگـــەیە ڕاگرتنـی دڵ بـۆی ستـــەمە
گەرچی بۆی شیــــر لە لێـــوی شەکەری دێت بەڵام
ڕەوشـی چـــاوی ڕەشـی ڕشتـــنی خوێنـی دییەمە
مـانگی من چواردە ســاڵە و سـڵ و شیـرین، کە بە دڵ
سەد وەکوو مانگی چوواردەی لە کەنیـــزی حەرەمە
وێڵــە دڵ خـوایە لە شوێن ئەو گوڵە شین تـازەبووەم
خەبــەرێکم نیــیە ئاخـۆ لە چەمـــەن یا لە چەمـە
یــــاری ئازیـــزم ئەگـــەر قـەلبشکێنـێکی وەهـــان
زۆری پێــــناچێ کە پارێــــزەری جەمشیـــدی جەمـە
گیـــانی شیرین کەمە بۆ پێشکەشی ئەو گەوهەرە گەر
سینگی «حافــز» (لـەلـە) بێ بۆ سەدەفی ئەو سەنـــەمە
گیانی «کۆلیـــل» پەپـــوولەی شەمــی گۆنـــاتە وەکوو
دڵـی دێوانـــەمە گیــانی بە شـــەوی زولفـی شـەمـە

مجمع خوبی و لطف است عذار چو مهش
لیکنش مهر و وفا نیست خدایا بدهش
دلبرم شاهد و طفل است و به بازی روزی
بکشد زارم و در شرع نباشد گنهش
من همان به که از او نیک نگه‌دارم دل
که بد و نیک ندیده‌ست و ندارد نگهش
بوی شیر از لب همچون شکرش می‌آید
گرچه خون می‌چکد از شیوه‌ی چشم سیهش
چارده ساله بتی چابک شیرین دارم
که به جان حلقه به‌گوش است مه چاردهش
از پی آن گل نورسته دل ما یا رب
خود کجا شد که ندیدیم در این چند گهش
یار دلدار من ار قلب بدین‌سان شکند
ببرد زود به جانداری خود پادشهش
جان به شکرانه کنم صرف گر آن دانه‌ی دُر
صدف سینه‌ی حافظ بود آرامگهش

خەیــاڵی وێڵـــە دڵـی غــافڵی منی دەروێـش
کە ئەو نەچیـــرە هەراســـانە دوا بچــێ یـــا پێش
بە دڵ شەکـامەوە وەک بـی، لـە ترسـی ئیمـــانم
کە وا لە نێـــو کەمـــەنی کافرێکی ئیمـــان کێش
ســەرم گومانی وەها بوو کە بەحـری سوور ئەگرێ
چ دوورە فیکـری دڵۆپێ ئەوەن مەحـاڵ ئەندێش
لەبـــەر مژۆڵی سڵامـــەت کوژ و دەلالـــی مـــرم!
شەپـۆل ئەدات کە نۆشی ژیان لە هەر سەری نێش
لە قــۆڵ و چــاوی حەکیمـان هەزار خوێن دەتکێ
کە بۆ موعـــایەنە دەســتێ بنێـــنە سەر دڵێ رێـش
دەڕۆمـــە مەیکـــەدە ئیـــدی خەجـاڵەت و گریـان
لە شـەرمی بەرهەمی خۆم و لە خۆفی دەرد و ئێـش
بە چەشنـی تەختـی سکەندەر تەواوە عومـری خـدر
شەڕی لەسەر مەکە! دەوران کە پووچە بۆ دەروێش
قەتی بە ئــەو ملــە ناچــێ دەسـی گــەدا «حــافـز»!
خەزانەیێ بخە دەس! سەر لە چەرخی خۆهەڵکێش
«عومــەر» کە عەشقـی لە دڵــدایە خـاوەنی گەنجـە
گـەدا مەگەر دڵـی قــارون، کە ماڵ کردی پەرێش

دلـــم رمیـــده شـــد و غافلـــم من درویش
که آن شکـــاری سرگشتـــه را چه آمد پیش

چو بیـــد بر ســـر ایمـــان خویش می‌لـرزم
که دل به‌دست کمان ابرویی‌ست کافرکیش

خیـــال حوصلـــه‌ی بحـــر می‌پـزد هیهـــات
چه‌هـــاست در سر این قطره‌ی محـــال‌اندیش

بنـــازم آن مـــژه‌ی شـوخ عافیـــت‌کش را
که موج می‌زنـــدش آب نوش بر سر نیـــش

ز آستیـــن طبیـــبان هـــزار خـــون بچکـد
گـرم به تجـــربه دستی نهنـــد بر دل ریش

به کوی میکـــده گریـان و سرفکنـــده روم
چرا که شـــرم همی‌آیدم ز حاصـــل خویش

نه عمـــر خضـــر بمانـــد نه ملک اسکنـدر
نـــزاع بر ســـر دنیـیّ دون مکـــن درویـــش

بـــدان کمر نرســـد دست هر گـــدا حافـــظ
خـــزانه‌ای به کف آور ز گنج قـارون بیش

کردوومــە ئیمتیحــانی گەلــێ لێـــرە، بەختــی خــۆ
لەم گۆمــە گێـــژە فــەرزە دەرێنــم کە رەختــی خۆ

دەس خۆم ئــەوەن گەزیــوە بە ئــاخی گــەرم، گرم
بــەردا وەکــوو گولاڵـــە لە هــەر نەخت نەختــی خۆ

دوێنێ شــــەوێ لە بولبــولم ئەم خۆش نەوا دەبیست
گوێی گرتبــوو شکۆفـــە لە شــاخی درەختــی خۆ

کەی دڵ! گوڵی کەنیــن بە، نە وەک یــار توند و تیژ
چون هەرکە تــرش و تاڵـــە دەتــۆرێ لە بەختــی خۆ

پێت خۆشە سەهل و سەختی جەهان خۆش بچێ لەبەر
پەیمــان بە سووک مەگرە لەگەڵ گفتی سەختــی خۆ

وەختــی گەیــی، لە دەردی فیــراقــا، بە ســـۆزی دڵ
ئاگـــر بدەم لە هەستــی هەموو پوخت و نەختــی خۆ

ئــاوات و کــام «حافــز»! ئەگـــەر تا بە ســـەر دەبــوو
جەمشیــدی جــەم دەمــاوە لەگەڵ تاج و تەختــی خۆ

«کۆلیـــــل»! تا هەتــاوی تەمــەن روونـــە رێکـــەوە
تاریکـــــەشـــەو نزیکـــە مەفەوتێـــنە وەختــی خۆ

مـا آزمـــوده‌ایم در این شهـــر بخت خـــویش

بیـــرون کشیـد باید از این ورطه رخت خویش

از بـــس که دست می‌گـــزم و آه می‌کشـــم

آتش زدم چو گـــل به تن لخت لخت خویش

دوشـــم ز بلبـــلی چه خوش آمد که می‌سرود

گل گوش پهـــن کرده ز شاخ درخت خویش

کـــای دل تو شـــاد باش که آن یـــار تنـــدخو

بسیـــــار تنـــدروی نشیـــــند ز بخت خویـــش

خواهی که سخت و سست جهان بر تو بگذرد

بگذر ز عهد سست و سخن‌های سخت خویش

وقت است کز فـــراق تو وز ســـوز انـــدرون

آتش درافکنـم به همـــه رخت و پخت خویش

ای حافـــظ ار مـــراد میســـر شـــدی مـــدام

جمشیـــد نیـــز دور نمـــاندی ز تخت خویش

قەســـەم بە شەوکـــەتی یـاری دلێـر و پڕدەسەڵات
لەســـەر کە نیمـــە ئەوینـی شـەڕی مەقـــام و بەرات
هەڤـــاڵی بـادە گــەیی یـاری تۆبە خـــوا لەگەڵت!
شـــەرابی ماڵـی ئەدی بەس! کە لەعلی مەیکەدە هات
بە مـەی بشـــۆرە عەبـــاکەم لەبەر خـــودا! چون من
لە چـــەرخی ناژنـــەوم بۆنی عەشـــق و خێر و خەڵات
کەسێ کە دەنگـــی زوڵاڵـــی لە ئێمـــە کردە حـــەرام
خورۆشـی چەنگ ئەشـــا چۆن بە رەقسی فێـر دەکات
بە عاشقـــان نـــەزەرێکت سپـــاسی لوتفی خـــودان
کە من غوڵامـــی کەمیـــن و کە تۆ ئەمیـــری وڵات
لە بەزمـــی ئێـــوە گوســـاخی جەســـارەتن ئەینـــا
قومـێ لە لەعلـی شـــەرابت دڵـم لە تـــاو دەخات
تەوێـــڵ و ڕوومـــەتی «حافز» خودا لە خـاکی دەر و
ســـەرای گەورەیی شـــاهی دلێـــر دوور نەکات!
بنێـــژە دارە دلیـــقێ! لە خــــاکی «کۆلیـــل»ـت
ببێ کە گیـر ئەگەرت بوو گوزەر، لە چاکی کەوات

قسم به حشمت و جاه و جلال شاه شجاع
که نیست با کسم از بهر مال و جاه نزاع

شراب خانگیم بس می مغانه بیار
حریف باده رسید ای رفیق توبه وداع

خدای را به می‌ام شست‌وشوی خرقه کنید
که من نمی‌شنوم بوی خیر از این اوضاع

ببین که رقص‌کنان می‌رود به ناله‌ی چنگ
کسی که رخصه نفرمودی استماع سماع

به عاشقان نظری کن به شکر این نعمت
که من غلام مطیعم تو پادشاه مطاع

به فیض جرعه‌ی جام تو تشنه‌ایم ولی
نمی‌کنیم دلیری نمی‌دهیم صداع

جبین و چهره‌ی حافظ خدا جدا مکناد
ز خاک بارگه کبریای شاه شجاع

سەرسبەینان کە لە نێو کاخی سرشتا شەمی نوور
گرشەئاوێژە لەسەر فەرشی زەوی چەشنی بلوور
فەلەك ئاوێنە لە نێو باخەڵی ئاسۆوە دەخات
کوڵمی دونیا بە هەموو ڕەنگەوە دێنێتە حوزوور
سازی ناهید دەکا ساز لەبەر شاهی فەلەك
کۆشکی کەیوان پڕە هەر سووچی لە هاواری سوروور
جام قاقا بە کەنین دێت کە دارۆغە لە کوێن
چەنگ ئەڵێ دەنگی زلی نایە شوکور دژمنی سوور
سەیری ئەم گەردشی گەردوونە بکەو مەی بکە نۆش
حاڵەتێکی نییە چون گەردشی گەردون لەمە ژوور
داوی فێڵ و فەرەزن کاکوڵی دونیای دەلال
ئاشنایان لەسەر ئەم ڕشتە نە شەڕیانە نە شوور
خێری عالەم تەڵەبی توولی تەمەن بۆ شایە
کە وجوودێکە بەکەڵك و کەرەمە و خەڵکی شوعوور
چاوی ئاوات لە ئاسۆی شەوەقی لوتفی ئەزەل
خاوەنی عیلم و عەمەل ڕۆحی هەموو شاهی غەیوور
مەرگی هەرگیز نییە «کۆلیل»! کەسێ عەدڵ و سەخا و
حورمەتی بۆ قەڵەم و ئەهلی هونەر بێ کەلەپوور

بامــــدادان که ز خلوتــگه کــاخ ابــداع
شمــع خاور فکند بر همه اطـراف شعــاع
بر کشد آینه از جیب افــق چـرخ و در آن
بنمـــاید رخ گیـــتی به هــــزاران انــواع
در زوایــای طرب‌خـــانه‌ی جمشید فلک
ارغنــون ساز کند زهره به آهنگ سمــاع
چنگ در غلغـــله آید که کجا شـد منکر
جــام در قهقــهه آید که کجـا شد منــاع
وضــع دوران بنگر ســاغر عشرت برگیر
که به هر حــالتی این است بهیـن اوضــاع
طـرّه‌ی شاهد دنیی همه بند است و فریب
عــارفان بر سر این رشتـه نجوینـد نـــزاع
عمر خسرو طلب ار نفع جهـان می‌خواهی
که وجــودی‌ست عطـابخش کریم نفـاع
مظهــر لطف ازل روشنــی چشــم امــل
جامع علم و عمل جان جهان شاه شجــاع

من لە نێــو چاکــان بە نێوبــانگی ئەوینت وەک شەمم
بۆ ئەوینــدارانی رەنــد و شـــەونشیـنت وەک شەمم
خەو بە چــاوی غەمپەرەستـــم نایە رۆژ و شــەو ئەوەن
لەش بە بــاری دووری و دەردی گرینـت وەک شەمم
بەنـدی جەرگی تاقـــەتم بڕیــا بە میقــرازی غەمت
گیــانی گڕ دا بەرقـی چەخماخەی بەتینت وەک شەمم
ئەسپی ئاڵـی ئەشکـی سەرکێـشم نەبوو بایێ چلـۆن
هەڵـــدەبوو رازی من و شـۆڵـەی برینـت وەک شەمم
دڵ لە بەینــی ئاگــر و ئــاوا بە یــادی چــاوی تۆن
وا لە شیـــنی بێوچــانی چــاوی شینـت وەک شەمم
بۆ شـــەوی دووری ئەگــەر ئیزنی ویســاڵێکت نەگات
عــالـەمێ ئـــاور ئـەدا بەرقـی ئەوینـت وەک شەمم
چەشنی شـــەو تاریکە رۆژم خـــۆری روخسـارت نەبێ
روو لە نوقسـانن کەمـاڵی شـــەوقی دینت وەک شەمم
کێـــوی سەبرم نەرمـــە وەک مۆمێ لە نێو دەستی غەما
تـا بە تــاوی عەشقـی کوڵمـی ئـاورینت وەک شەمم
وەک سوحـم هەر یەک نەفــەس پێمـاوە بۆ دیداری تۆ
دیـــدەگریــانی دیـــار و پێکـــەنینت وەک شەمم
سەربڵێـــندم کەن بە وەسڵـی خۆ، شـــەوێ نـازارەکەم!
با دڵـی تـــاریک رۆشـــن کــا جەبینت وەک شەمم
سۆزی عەشقی تۆی لەسەر وا ناوە «حافز» قەت بە چـاو
ئاگــری دڵ ناکوژێتـــۆ چـــون لە شینـت وەک شەمم
هەرکە «کۆلیـــل»ـی ئەوین بێ وەک وەلـــی دێوانـەیە
بۆیە من شێـــتی گــڕی سینگی خەمینـت وەک شەمم

در وفـــای عشق تو مشهور خوبـانم چو شمـع
شب‌نشیـن کوی سربـازان و رندانم چو شمـع
روز و شب خوابم نمی‌آید به چشم غـم‌پرست
بس که در بیمـاری هجر تو گریـانم چو شمـع
رشتــه‌ی صبرم به مقــراض غمت ببــریده شد
همچنان در آتش مهــر تو سـوزانم چو شمـع
گر کمیت اشک گلـگونم نبـودی گــرم رو
کی شدی روشن به گیتی راز پنهانم چو شمـع
در میـان آب و آتش همچنان سر گــرم توست
این دل زار نـــزار اشک‌بـــارانم چو شمـع
در شب هجــران مرا پروانـــه‌ی وصلی فـرست
ور نه از دردت جهــانی را بسـوزانم چو شمـع
بی جمــال عالم‌آرای تو روزم چون شب است
با کمــال عشق تو در عین نقصــانم چو شمـع
کوه صبــرم نرم شد چـون موم در دست غمت
تا در آب و آتش عشقت گـدازانم چو شمـع
همچو صبحــم یک نفس باقی‌ست با دیدار تو
چهره بنمــا دلبــرا تا جان برافشـانم چو شمـع
سرفــرازم کن شبی از وصـل خود ای نازنیـن
تا منــور گردد از دیـدارت ایوانــم چو شمـع
آتش مهــر تو را حافــظ عجب در سر گرفت
آتش دل کی به آب دیـده بنشانــم چو شمـع

سەحەر بە عەشقی گوڵستان و عەتری دار و دەوەن
بە چەشنی بولبولی عاشق دەمێ کە چوومە چەمەن
وەکوو چرا لە شەوی تار سوورە گوڵ دەگڕا
کە دەمڕووانییە باخان و مێرگولانی وەتەن
وەها دەنازییە بەژن و جەماڵی بێحەدی خۆی
نەبوو لە مێشکی سەری، بولبولێ هەژار کە هەن
گلاری نێرگزی شەهلا لە ئاوی حەسرەتە پڕ
خەراجی لالە بە داخی دڵی نیگاری ئەسەن
دەمی وەتاکە شەقایەق، خەریکی فیتنەگەرین
زمانی لۆمەیی سۆسەن بە چەشنی تێغ و قەمەن
لە گوێنی بادەپەرستان گەلێک جام بە دەست
بەسانی ساقیی مەستان بڕێک جام ئەدەن
دەمی جووانییە «حافز»! بە جەژنی گوڵ خۆش بە
لە من پەیام گەیانن لە تۆ نیشاتی تەمەن
بەهارە شادییە باخی گلاری «کۆلیل»م!
بە تۆ شەرابی کریشمە و بە من گوڵاوی دییەن

سحـــر به بوی گلستـــان دمی شـــدم در بـاغ
که تا چـو بلبـــل بیـــدل کنم عـــلاج دمـــاغ
به جلـوه‌ی گل ســـوری نگـــاه می کـــردم
که بود در شب تیـــره به روشنی چو چـــراغ
چنـــان به حسن و جوانـی خویشتـــن مغـرور
که داشت از دل بلبـــل هـــزار گونـــه فـــراغ
گشـاده نرگس رعنا ز حسرت آب از چشم
نهـــاده لالـه ز سودا به جـان و دل صـــد داغ
زبان کشیـــده چو تیغی به ســـرزنش سوسـن
دهـــان گشـــاده شقـــــایق چو مردم ایغـــاغ
یکی چو باده‌پرستـــان صـــراحی اندر دست
یکی چو ســـاقی مستان به کف گرفته ایـــاغ
نشاط و عیش و جوانی چـو گل غنیمت دان
که حافظـــا نبـــود بر رســـول غیـــر بـــلاغ

چـــارە ئەگـــەر مەدەد بکـــا پێچـــی قـــژی بنێمە کەف
کێشی ئەکەم گەلێکە خۆش، کێشم ئەکا گەلێ شەرەف
ئەو دڵە پڕئومێـــــدە قەت مەرحەمـــەتی نەدی لە کەس
گەرچی غەزەڵ قســـەی دڵ و سۆزمی بردە هەر تەرەف
هیـــچ نەبوو زولفـــی خەمـی غەمـی دەرون شکـار کات
عومری عەزیــز چوو لەدەس، بۆ ئەمـەلی پووچ ئەسەف
قەوسی برۆی ئەوین چلۆن دەستی خەیـالێ وێ کەوێ
کەس بە کـەوانی وانی قەت تیری نەچوو بەرەو هەدەف
شۆخـن ئەگـــەرچی دڵڕەقن، نیـــنە بە بیـری بابی پیـــر
چەندی بەخێـــو کەم لە دڵ عەشقـی کـوڕانی ناخەلەف
کەوتـــە ســـەرم لە گۆشـــەیێ سۆفیـــیەتی بکـــەم کەچی
بوو بە ملۆزمم عەجەب دەنگ‌خۆشێ بە چەنگ و دەف
شێـــخ و مەلا بێـــخەبەرن، هیـــچ مەڵێ، بخوێنـــە بـــۆم!
مەستی ریـــایە موحتـەسیب تێکـــە شـەرابێ (لا تَخَفْ)!
سۆفیـــی شـــار ئەشـــا چەنێ تیکـــە لە دەم زەلام ئەنێ؟!
رەببی دریـــژ بێ کـــژووی پانـی ولاخی خۆش عەلەف
«حافـــز»! ئەگـــەر تەرێقـــەتی ئـــالی‌نـــەبی لەبـــەر گری
رێبـــەری رێتـە هیممەتی حاکـم و سـەروەری نەجەف
خوایە کە تۆ کەرەم نەکەی سوێل بە «کۆلیل»ـی رەجاڵ
دڕکی بیـاوانی خەتـەر نەشتـــەری پێیە سەف بە سەف

طـــالع اگر مـدد دهـد دامنــش آورم به کف
گر بکشــم زهی طــرب ور بکشد زهی شرف

طرف کرم ز کس نبست این دل پر امیــد من
گرچه سخن همی‌برد قصــه‌ی من به هر طرف

از خـــم ابروی تـــوام هیــچ گشـایشی نشـد
وه که در این خیـــال کج عمـر عزیز شد تلف

ابـروی دوست کی شود دستکش خیـــال من
کس نزده‌ست از این کمان تیــر مراد بر هدف

چنـــد به نـــاز پرورم مهـــر بتـــان سنگـــدل
یـــاد پدر نمی‌کنـــند این پســـران نـــاخلف

من به خیـــال زاهدی گوشه‌نشین و طرفه آنک
مغبچه‌ای ز هر طرف می‌زنـدم به چنگ و دف

بی‌خبـــرند زاهـــدان نقش بخـــوان و لا تَقُلْ
مست ریـــاست محتسب بـــاده بده و لا تَخَفْ

صوفی شهر بین که چون لقمه‌ی شبهه می‌خورد
پـاردمش دراز بـــاد آن حیـــوان خوش علف

حافـظ اگر قـدم زنی در ره خـاندان به صدق
بدرقـــه‌ی رهت شـود همت شحنـه‌ی نجف

لەسەر زمانی قەڵەمدا نەبوو تەوانی فیراق
دەنا بەیانی ئەفەرموو پەژارەکانی فیراق
ئەسەف کە مۆڵەتی عومر و خەیاڵی جەژنی ویساڵ
گەیشتە ئاخر و ئاخر نەبوو زەمانی فیراق
سەرێ کە گەردنی گەردون دەبوو بە حورمەتی کەچ
بە راستان! کە خەوانم لە ئاستانی فیراق
چلۆن بە باڵی ئەوین هەڵفڕم بەرەو ژوانت
وەری کە شاپەڕی تەیری دەرون بە ژانی فیراق
نەماوە چارە ئەمێستاکە چون گەمی سەبرم
لە گێژی بەحرە، بە فەرمانی گەمیەوانی فیراق
شەپۆلی عەشقت ئەوەندەی نەماوە زەورەقی ژین
نوقم بکا لە پڕێکا لە بەحری (وان)ی فیراق
کەوێتە دەستم ئەگەر دەردی دووری ئەیکووژم
کە قڕ کەوێتە هەموو خێڵ و خانەدانی فیراق
هەڤاڵی خێڵی خەیاڵیم و هەمنشینی سەبر
رەفیقی ئاوری دووریم و هاونیشانی فیراق
بڵێم چلۆنم ئەوینداری وەسڵی تۆ، کە بە لەش
وەکیلی چارەم و دڵ زامنی خەمانی فیراق
لە یار دوورم و دڵ بۆ دیاری بوو بە کەباب
هەمیشە خوێنی جیگەر نۆش ئەکەم لە خوانی فیراق
فەلەک کە خستیە جەغزی ئەوین سەری کەسەرم
شکانی گەردنی سەبرم بە یەک تەکانی فیراق
بە پای شەوق ئەگەر ئەم رێ بەسەر دەچوو «حافز»!
نیشانی فیراقی نەدابوو کەسێ لە شانی فیراق
نەماوە ساغ بە «کۆلیل» جێگەیێکی مەگەر
مەزاری تیری مەراقن بە ژێکەوانی فیراق

زبـــان خامـــه نـــدارد ســـر بیـــان فـــراق
وگـــرنه شـــرح دهـــم با تو داستـــان فـــراق

دریـــغ مدت عمـــرم که بر امیـــد وصـــال
به ســـر رسیـــد و نیـــامد به ســـر زمـــان فـــراق

ســـری که بر ســـر گـــردون به فخـــر می‌سودم
به راستـــان که نهـــادم بر آستـــان فـــراق

چگونه بـــاز کنـــم بـــال در هـــوای وصـــال
که ریخت مـــرغ دلـــم پر در آشیـــان فـــراق

کنـــون چه چـــاره که در بحر غـــم به گردابی
فتـــاد زورق صبـــرم ز بادبـــان فـــراق

بسی نمـــاند که کشتـــی عمـــر غرقـــه شود
ز مـــوج شـــوق تو در بحـــر بیـــکران فـــراق

اگر به دست مـــن افتـــد فـــراق را بکشـــم
که روز هجـــر سیـــه بـــاد و خـــان و مـــان فـــراق

رفیـــق خیـــل خیـــالیـــم و همنشیـــن شکیب
قـــرین آتش هجـــران و هـــم قـــران فـــراق

چگونه دعوی وصلت کنم به جان که شده‌ست
تنـــم وکیـــل قضـــا و دلـــم ضمـــان فـــراق

ز سوز شـــوق دلـــم شـــد کبـــاب دور از یـــار
مدام خـــون جگر می‌خـــورم ز خـــوان فـــراق

فلک چو دیـــد ســـرم را اسیـــر چنـــبر عشق
ببست گـــردن صبـــرم به ریسمـــان فـــراق

به پـــای شوق گر این ره به ســـر شدی حافظ
به دست هجـــر نـــدادی کسی عنـــان فـــراق

عەجەب سەفـــایەکە! شوێنـی کەنار و یـاری شەفیق
کە دەس بـدات گـ‌ڵ رۆژێ لەگەڵ شـەرابی رەحیـق
جەهان و ئیشی جەهان پووچە هیچە سەرجەمی هیچ
هەزار جـــاری سەر ئەم نوکتە داوە شەرحی عەمیق
درێـــغ و داخ کە تـا ئـــەم سەعـــاتە نەمـــزانی
کە (کیمیـــای سەعـــادەت) دەبێـتـە یـــاری شەفیق
کەنـــار بگـــرە بە هیچت ژیـــان لە کیس نەچێت
کە رێـــگران لە کەمیـنی تەمـەن فـــرەن لە تەریق
وەرن! کە تۆبــە لە ئاقێـــقی لێـو، بزەی دەمی جام
عەقـــڵ مەحـــاڵە تەسێقی بکـــا بە مێشکی وەسیق
ئەگەرچی مووکەمـەریت و شیاوی چەشنی مە نیت
وەلێ بە خـــاتری خۆشـی دەکـەم خەیاڵی دەقیق
لە حـەد بە دەر مەلـــەوانی خەیـــاڵی بۆ خنکـــا
شـــرینیێ کە لە چـــاڵی چنـــاکەتـــایە غەریق
لەبـەر ئەوەم وەکـو ئاقێـــق لەعلی سـوورە سرشک
کە نەخشی خاتـەمی لێـوت نووانی چەشنی عەقیق
بە پێکـــەنین وتی «حافز»! غـــولامی نەزمی ئەتـۆم
ئەشـــا چ گێـــلم ئەنـــاسێ پـــلاری زاری شەقیق!
وتــــم بە شیـــوەن و زاری رەجـــاڵم و «کۆلیـــل»
وتی لە سینگی روتـەب دیتە قەت دڵێکی رەقیق؟!

مقـــام امن و مـــی بی‌غش و رفیـــق شفیـــق
گرت مـــدام میســـر شـــود زهـــی توفیـق

جهـان و کار جهان جمله هیـچ بر هیچ است
هـــزار بـــار من این نکتـــه کرده‌ام تحقیـــق

دریـــغ و درد که تـــا این زمـــان ندانستـم
که کیمیـــای سعـــادت رفیق بود رفیـــق

به مأمنـــی رو و فـــرصت شمـر غنیمت وقت
که در کمینـــگه عمـــرند قاطعـــان طریـــق

بیـــا که توبه ز لعل نگـــار و خنـــده‌ی جام
حکـــایتی‌ست که عقلش نمی‌کند تصدیـــق

اگرچه موی میـــانت به چون منـــی نرسـد
خوش است خاطرم از فکر این خیال دقیـــق

حـــلاوتی که تو را در چـــه زنخـــدان است
به کُنـــه آن نرســـد صد هـــزار فکر عمیـــق

اگر به رنگ عقیقی شد اشک من چه عجب
که مُهـر خـــاتم لعل تو هست همچو عقیـــق

به خنـــده گفت که حافـــظ غلام طبع توام
ببیـــن که تا به چه حـــدم همی‌کند تحمیـــق

لە کوێ شـــەراب دەنۆشی قومـێ برێـژە لە خـــاك
کە لــەو گونــاحە نەسیــبێ بگـا بە غەیــرە چ بــاك
بخـۆ ئەوەی هەتـە! بێـخـۆ غـەم و پـەژارە مەخـۆ!
کە رۆژگـــار لە کوشتـــارە هەر بە شێـــری هـەلاك
بە خـــاکی پـات قەســەم ســەروی نازەنینـی ئەمـن!
کە پـــام لێ‌نەبـڕی! لەش دەمـێ لە خــاکە کەلاك
درێغی لوتف و کـەرەم رەسمـــی ناکـەسانە فەقـەت
بە دینـی رەنـد و قەڵەندەر بە شەرعی کۆمـەڵ و تاك
وەهــایە شــەش تـەرەف ئەنـدازیاری چەرخی بەرین
تەنیــوە لێـم کە نەمــا جێگـەیێ لەسـەر لەپی خاك
فریـــوی کیـژی ترێ رێ بە هۆشی ســەر دەگـرێ
خودایــە بەختی نەشێوێت و تەختی سەندەڵی، تاك!
بە عەشقی مەیکەدە «حافز»! چ خۆش لە دونیـا چوی
دوعـــای خەڵکـی دڵت بێ بە هــاوەڵێ دڵپـــاك!
گەرەکتــە زوڵمەتی شەوگـار شـەق بکەی «کۆلیل»!
چرایـــە هەڵکــە لە (ئەسرینـی ئاڵ)و سینەیی چاك

اگر شراب‌خوری جرعه‌ای فشان بر خاک
از آن گناه که نفعی رسد به غیر چه باک

برو به هرچه تو داری بخور دریغ مخور
که بی‌دریغ زند روزگار تیغ هلاک

به خاک پای تو ای سرو نازپرور من
که روز واقعه پا وامگیرم از سر خاک

چه دوزخی چه بهشتی چه آدمی چه پری
به مذهب همه کفر طریقت است امساک

مهندس فلکی راه دیر شش جهتی
چنان ببست که ره نیست زیر دیر مغاک

فریب دختر رز طرفه می‌زند ره عقل
مباد تا به قیامت خراب طارم تاک

به راه میکده حافظ خوش از جهان رفتی
دعای اهل دلت باد مونس دل پاک

له خێـــڵی دژمنـــی گیـــانی هـــەراسی چۆنــه دڵم
که یـــار یـــاوەره باکـــم چ بـــێ له کـۆڕی زڵـــم؟
منـــی، ئومێـــــدی گەیشتـــن به ئێـــــوه هێشتـووەتۆ
دەنـــا له ترســـــی جودایـــی خـــزابو دڵ له گڵـــم
نەفـــەس نەفـــەس له ســـەبا نەشنەوم ئەگەر بۆنـێ
بەرۆك چـاك دەمـادەم به غـەم به چەشنی گوڵـــم
چ دووره خـەو له دو چـاوم لەبەر خەیـاڵم و چـەن
نەگونجــه سەبـری فیـراقت له سینگی پڕ له چڵـــم
برینی خەنجـــەری تۆ چاترن له مەڵهـەمی خەڵك
به ژەهـــری ئێوەیه خۆشـم له شەکری غەیره سڵـــم
که مـــانی دایمـه مـــردن به زەبـــری شمشێـــرت
چ خۆشـــه رۆح فیـــداکەم به تۆ له نـاخی دڵـــم
مـــەڕۆ به تـــاو که تێغـــی برۆ ســـــەریشم کـــات
درێـــــژه بۆ ســـەری فیتـراقی زین مەبەستی کوڵـــم
جەمـــاڵتی نەزەری کێ له کوێنه دی وەك هەی؟!
به وەزنی دانشـــه میـــزانی دەرکی خـــاڵ و کوڵـــم
له چـاوی خەڵکی جەهان خۆشەویس ئەبێ «حافز»
هەتـا له خاکـی دەرت پڕ له خۆڵـه روی خەجڵـــم
له ئەشکـــی دیـــده دڵـــۆپێ برێـــــژی بۆ «کۆلیـل»
دەبێـــته شینگـــەیی نێـــرگز گڵ و دەروونی بڵـــم

هـــزار دشمنم ار می‌کنند قصـــد هـلاک
گرم تو دوستی از دشمنـــان نـدارم بـاک
مـرا امیـــد وصـــال تـو زنـــده می‌دارد
وگرنه هر دمـم از هجـــر توست بیم هلاک
نفس‌نفس اگر از بـــاد نشنـــوم بویـــش
زمان‌زمان چو گل از غم کنم گریبان چاک
رود به خواب دو چشم از خیـال تو هیهات
بود صبـور دل انـدر فـراق تو حاشـاک
اگر تو زخـــم زنی بـه که دیگری مرهـــم
و گر تو زهـر دهی بـه که دیگری تریـاک
بِضَـرْبِ سَیْفِـکَ قَتْلِی حَیـاتُنـا اَبَـــداً
لِأنَّ روحِی قَـــدْ طـابَ أنْ یَکُـونَ فِداک
عنـان میپیـچ که گر می‌زنی به شمشیـرم
سپـر کنـم سر و دستت نـدارم از فتـراک
تو را چنـان که تویی هر نظـر کجا بیـند
به‌قـدر دانش خود هر کسی کنـد ادراک
به چشـم خلق عـزیـز جهـان شود حافظ
که بر در تو نهـد روی مسکنت بر خـاک

ئەی نمەک پەروەری لێوت دڵی پڕپڕ لە برین
حەق بە جێ بێنە! خودا حافز ئەوا ئێمە دەچین
تۆ هەر ئەو پاک سرشتەی کە هەموو باسی مەلەک
زیکری خێر و کەرەمی تۆیە لەسەر عەرشی ئەوین
لە عەیارم ئەگەرت شک هەیە تاقیم کەرەوە
زێڕی خالیس کە مەحەک بردییە بازاڕی یەقین
وەعدی خۆتن «کە دەبم مەست و دوو ماچت ئەدەمێ»
وادە سەرچوو لە یەک و دوو خەبەرێ نین کە نین
با لە شک بێنە دەر ئەو خەڵکە سەبارەت بە دەمت
خونچەیی لێو کەوە، هەڵڕێژە وتاری شەکەرین!
تێک ئەدەم چەرخ ئەگەری سەر بە مورادم نەگەڕێ
من کەسێ نیم کە بکێشم منەتی چەرخی بەرین
حەققی «حافز» کە نەبێ بۆن بکا باخ و بەری
لازمن دوور لە گوڵ بێت رەقیبی رەشە بین
سەیری نێو باخی ئەوینی دڵی «کۆلیل»ی نەکرد
دەرفەتی چونکە نەدا با زەمەنی ماتەم و شین

ای دل ریش مـرا با لب تو حـق نمـک
حـق نگـه‌دار که من می‌روم الله معـک

تویی آن گوهـر پاکیـزه که در عالم قـدس
ذکـر خیـر تو بود حاصـل تسبـیح ملک

در خلـوص منت ار هست شکـی تجربه کن
کس عیـار زر خـالص نشناسد چو محـک

گفته بودی که شوم مست و دو بوست بدهـم
وعـده از حد بشد و ما نه دو دیدیم و نه یک

بگشـا پستـه‌ی خنـدان و شکـرریزی کن
خلـق را از دهـن خویش مینـداز به شک

چـرخ بر هـم زنم ار غیـر مـرادم گردد
من نه آنـم که زبونی کشـم از چرخ فلک

چون بر حافـظ خویشش نگـذاری بـاری
ای رقیـب از بر او یک دو قـدم دور تـرک

خۆش خەبەر بیت ئەی نەسیمی شەماڵ
کە ئەدەی دەم لە کات و جەژنی ویساڵ
خۆ قسەی دڵ بڕانەوەی نییە قەت
لێرە بۆچی زمانی گۆتنە لاڵ؟!
ئێستە جیرانەکانی ئێمە لە کوێن
چۆنە حاڵی ئەوین و کۆڕی هەڤاڵ
ماڵ وێرانە هەر وەك ئاوا بوو
بەس بپرسن لە ماڵەچۆڵ هەواڵ
بە کەماڵ و جەماڵ کامڕەوای
چاوی بەد روو نەکا لە خەتتو لە خاڵ
ئەی دەلیلی دڵان خودا یارت!
وەرە خۆش هاتی ئەی شەماڵی عەواڵ
سەحنی شایی دەمێکە خاڵی بوون
لە حەریفان و جامی لەعلی زولاڵ
ئێستە شەو سێبەری فیراقە لە سەر
چۆن بچێ تا لە شەوڕەوانی خەیاڵ؟
بۆ کەسێ شۆخمان نەبوو نەزەرێ
کام ئەوەن گەورە؟ کێ ئەوەندی کەماڵ؟
«خاجە»! سەبر و ئەوین دژن، ئۆفێ!
خۆشەناڵین لە عاشقانی شەلاڵ
لەوەتا ناڵە سەردەخا «کۆلیل»
پڕە ینخەی لە لەعلی سوور و میداڵ

خوش خبر باشی ای نسیم شمال
که به ما می‌رسد زمان وصال

قِصَّةُ العِشْقِ لاَ انْفِصامَ لَها
فُصِمَتْ‌ها هُنا لِسانُ الْقالِ

مالِسَلْمَی وَ مَنْ بِذِی سَلَمٍ
أیْنَ جیرانُنا وَ کَیْفَ الْحالِ

عَفَتِ الدّارُ بَعْدَ عافیَةٍ
فَاسْألوا حالَها عَنِ الأطْلالِ

فی جَمالِ الْکَمالِ نِلْتَ مُنیً
صَرَفَ اللهُ عَنْکَ عَیْنَ کَمالِ

یا بَریدَ الْحِمی حَماکَ الله
مَرْحَبا مَرْحَبا تَعالْ تَعالِ

عرصه‌ی بزمگاه خالی ماند
از حریفان و جام مالامال

سایه افکند حالیا شب هجر
تا چه بازند شب روان خیال

ترک ماسوی کس نمی‌نگرد
آه از این کبریا و جاه و جلال

حافظا عشق و صابری تا چند
ناله‌ی عاشقان خوش است بنال

هەڵمژی نەفەسی عەشق و دیارە بەرقی ویساڵ
لە بەر هەوات مرم زوو بە ئەی نەسیمی شەماڵ!
لە ئێرە دابەزە ئەی سارەوانی ئازیزم!
نەما کە سەبری جەمیلم لە شەوق و زەوقی جەماڵ
شکایەتی شەوی دووری دەبێ لە یاد بەرین
شوکور کە پەردە وەلاچوو لە بەژنی ڕۆژی ویساڵ
وەرن لە حەو تەبەقی دیدە ئەشکی ڕەنگینم
خەریکی نەخشی خەت و خاڵتن بە دەستی خەیاڵ
کە عەزمی ئاشتییە و تاڵبی گوزەشتە ئەوین
ڕەوایە سەرفەنەزەر کەی لە دەرکەوانی چەپاڵ
کەسی نەبوو دڵی تەنگم مەگەر خەیاڵی دەمت
دڵی کەسێ وەکو من پڕ نەکا خەیاڵی شەلاڵ!
ئەگەرچی «حافز»ی بێکەس بە تیری عەشقی چوو
سەرێ بدا لە مەزارم هەزار خوێنی حەلاڵ
نەچیری زڵمی شەوارێکی وایە «کۆلیل»ت
نە بەرقی چاو دەبینێ نە خەونی پەرچەم و خاڵ

شَمَمتُ روح ودادٍ و شمتُ برق وصال
بیا که بوی تو را میرم ای نسیم شمال

اَحادِیا بِجَمال الحَبیبِ قِفْ و أنزل
که نیست صبر جمیلم ز اشتیاق جمال

حکایت شب هجران فرو گذاشته به
به شکر آن که برافکند پرده روز وصال

بیا که پرده‌ی گلریز هفت‌خانه‌ی چشم
کشیده‌ایم به تحریر کارگاه خیال

چو یار بر سر صلح است و عذر می‌طلبد
توان گذشت ز جور رقیب در همه‌حال

بجز خیال دهان تو نیست در دل تنگ
که کس مباد چو من در پی خیال محال

قتیل عشق تو شد حافظ غریب ولی
به خاک ما گذری کن که خون مات حلال

جەمشیدی زەمان، یاوەری دین، خوسرەوی عادڵ
یەحیا کوڕی سوڵتانی موزەففەر فەڕی کامڵ
ئەی ئەو کەسە بۆ گەل لەسەر ئەم خاکە شەو و ڕۆژ
دەرکی دڵ و گیان بازی بە عەشقی موتەقابڵ
فەرمانبەریی ئێوە لەسەر ئێمە هەموو فەرز
لوتف و کەرەمت کامڵە، بۆ هەرکەسە شامڵ
ڕەشتت بە قەڵەم ڕۆژی هەوەڵ خاڵ لەسەر مانگ
تا باز بە ئەو جەوهەرە بێ سەرجەمی موشکڵ
ئەو خاڵە ڕەشەی دی کە دییەی خۆر، وتی خۆزگا
ڕەش پێس غولامێکت ئەبوو لەو حەنە ماتڵ
چۆپی گری بەزمت فەلەکول ئەتڵەسە گەورەم!
لەم گۆوەنە دەستی کچی شایی بنە سەر دڵ
حاتەم ڕەوش و بادە بە دەس بی! کە کەمەندت
زەنجیرە لە دەست و ملی کەچ باوەڕ و غافڵ
ئەم چەرخە هەموو کاری لە بەر عەدڵە دەسووڕێ
دڵخۆش بە کە زاڵم نییەتی ڕێگە بە مەنزڵ
«حافز»! قەڵەمی شاهی جەهان، بەشکەری ڕۆژین
بۆ ئەم بەشە مەعلوومە مەخۆ حەسرەتی باتڵ
هەر وایە بەشی ئێمەیی «کۆلیل»ـە غەمی تۆ
گوڵ قسمەتی با، شیوەن و گریانی بە بولبول

دارای جهـــان نصـــرت دیـن خســـرو کامـل
یحیـی بـن مظـــفـر ملـک عـــالم عـــادل
ای درگـــه اســـلام پنـــاه تـــو گشـــاده
بـــر روی زمیـــن روزنـــه‌ی جـــان و در دل
تعظیـــم تو بر جـــان و خـــرد واجب و لازم
انعـــام تو بر کون و مکـــان فایض و شامـل
روز ازل از کـــلک تو یک قطـــــره سیـاهی
بر روی مـــه افتـــاد که شد حـل مســـائل
خورشیـــد چو آن خـــال سیه دید به دل گفت
ای کـــاج که من بودمـی آن هنـدوی مقبـل
شاهـا فلک از بـــزم تو در رقص و سماع است
دست طـــرب از دامـــن این زمزمـــه مگسـل
مـی نوش و جهان بخش که از زلف کمنـدت
شـــد گـــردن بدخـــواه گرفتـــار سلاســـل
دور فلـــکی یکســـــره بر منهـــج عـدل است
خوش بـــاش که ظـــالم نبرد راه به منـــزل
حافـــظ قـــلم شاه جهـــان مقسم رزق است
از بهـــر معیشت مکـــن اندیشـــه‌ی باطـــل

لە وەرزی گـــولْ خەجلّـم تۆبــە داشکـــا بە شـــەراب
ســـەری خەجـــاڵەتی کەس دانەخـــا بە ئیشـی خراب!
لـە ریـّــــگە داوی ریــــا پــــانە، مــن لە بــابـــەتی وا
نە ســـــەربەژێــــری نیگـــــارم نە ســـاقی و نە جەنـــاب
دەبێ لە ئێمـــە نەڕەنجـــێ ئــــەوین بە مەرحـــەمەتـــی
مەلـــوول چـون لە سوئالیـــن و شـــەرمەزاری جـــەواب
خەجـــــاڵەتم لە رەفیـّــقان کە دوێنــــەشـــەو تـــا رۆژ
هەژانی خەونی هەموو ئەشك و خوێنی جەرگی کەباب
شیــــاوە نێـــر گزی مەس شـــەرمەزار و مل کـــــەچ بێ
لە تـــاوی چـاوی خومارت لە کۆشی رەنج و عـــەزاب
ئەتۆ کە چـــاتری شـــوکری خودا گەلـــێ لە هەتـــاو
نە شـــەرمـــەزار لە خـــۆرم نە سەربـــەژێری خەتــاب
لە پـــەردە مایـــەوە ئـــاوی ژیـــان خەجـــالّەتبار
بە شیعــری «حافـــز»و تەبعی زوڵاڵ و کەوسـەری نــاب
نووانی ســـەرگوڵی کوڵمت عەقیـــقی خوێنـــی شـــەرم
لە گوێنـــی شیعـــری «عومەر» ئاڵ، عەینی بەژنی گوڵاب

به وقت گـل شـدم از توبـه‌ی شـراب خجـل
که کـس مبـاد ز کـردار ناصـواب خجـل
صـلاح ما همـه دام ره است و من زین بحث
نیـم ز شـاهد و سـاقی به هیـچ بـاب خجـل
بـود که یـار نرنجـد ز مـا به خـلق کریـم
که از سـؤال ملولیـم و از جـواب خجـل
ز خون که رفت شب دوش از سـراچه‌ی چشـم
شـدیم در نظـر رهـروان خـواب خجـل
رواست نرگس مست ار فکنـد سـر در پیش
کـه شـد ز شیوه‌ی آن چشم پرعتاب خجـل
تویـی که خوب‌تری ز آفتـاب و شکر خـدا
کـه نیستـم ز تـو در روی آفتـاب خجـل
حجاب ظلمت از آن بست آب خضر که گشت
ز شعـر حافـظ و آن طبـع همچو آب خجـل

ئەگەر مەجـــالی گەیشتـن ببـێ بە حـــەزرەتی تـۆ
یەقین دەگا دەسـی وەسڵم بە ئەسڵی دەوڵـەتی تـۆ
قـــەراری سەندووە لێـم ئەو دو دیــــدە جـادووتە
دەمەق بە نێر گزی رەشتم، تەحا لە حیکمەتی تـۆ!
بە هیـــچ جۆرە نەبـوو جۆر کـاتی روخسـەتی من
کە بێـــنەوا نیـیەتی رێ بە دەرکی خەڵـوەتی تـۆ
بە کـوێ بچـم، چیـیە کارم، لە کوێنە چـارم دێ؟
کە دڵ مەلـوولی زەمـانە و رەجاڵی رەحمەتی تـۆ
ژیـــــانە بـۆ منـــی بێــــحاڵ و تێشکـــــاو، دەمــێ
کە شـــەق ببــم بە دەبـــانی غـــەم و مەرارەتی تـۆ
خـراوەتـــر لە دڵـــی تەنگمـــی نـــەدی کە لـــەوێ
قـــەراری گرتـووە گەنجـی حـەز و مەحەببەتی تـۆ
دڵم بە گەوهەری عەشقت لە چەشنی جامی جەمە
لە ژەنگی وەسوەسە بێگـەردە چەشنی روومەتی تۆ
خەتـــام چی بووە ئەی گیـــان و دڵ! بفـەرموو پێم
کە تاعـــەتم نیــیە پەسنـی حوزووری مینـــنەتی تـۆ
بە ئێـــشی عەشـــق بســـاچێـــنە «خاجە»! کەڵکی نییە
بە هەر حەکیـم وتن راز و رەمـــزی حـەزرەتی تـۆ
کەسێ لە سینگیـــیە کۆکۆ برین وەکوو «کۆلیـــل»
دەبـێ لـە دەردی ئەمـن تێــبگات و شـــەربەتی تـۆ

اگر به کوی تو باشد مرا مجال وصول
رسد به دولت وصل تو کار من به اصول

قرار برده ز من آن دو نرگس رعنا
فراغ برده ز من آن دو جادوی مکحول

چو بر در تو من بی‌نوای بی‌زر و زور
به هیچ باب ندارم ره خروج و دخول

کجا روم چه کنم چاره از کجا جویم
که گشته‌ام ز غم و جور روزگار ملول

من شکسته‌ی بدحال زندگی یابم
در آن زمان که به تیغ غمت شوم مقتول

خراب‌تر ز دل من غم تو جای نیافت
که ساخت در دل تنگم قرارگاه نزول

دل از جواهر مهرت چو صیقلی دارد
بود ز زنگ حوادث هر آینه مصقول

چه جرم کرده‌ام ای جان و دل به حضرت تو
که طاعت من بیدل نمی‌شود مقبول

به درد عشق بساز و خموش کن حافظ
رموز عشق مکن فاش پیش اهل عقول

چم رەشتبێ خەت و خاڵ لەو کولـمە نەخشی مانین
هەرکەس شنەفتی فەرمووی بە خوایە تەبعی زانیـن

دەرسی ئەوینـم ئـەووەڵ ئاسـان ئەهـاتە بەر چـاو
دڵ بوو بە کۆڵـە زانیـم سەخت و گرانی وا نیـن

خۆشـی دەوت لەسـەر دار حەلـلاج ئـەم لەتیـفە
لا شافیـعی مەپرسـن فتـوای وا کـە چـا نیـن

پێم وت بە گیانی بێهێز کەنگێ نەزەر دەفەرمووی
فەرمـوی دەمێ کە گیانت پەردەی حەرەمسەرا نین

بـردی دڵـم نیگـارێ عاشـق کوژ و عەیـارێ
خـاوەن خـدەی رەوان و کـانی سرشتی جوانیـن

وەك چاوی مەستی تۆ بووم بەینێ لە گۆشە گیـری
ئێستاکە چەشنی ئەبرۆت خەمخۆری چاومەسانیـن

تۆفـانی نووحە هەرچەن فرمێسکی دیدە هەر سـات
کـاری لە مـۆری عەشقت هەرگیـز لە سینـەما نیـن

ئازیـز دەستـی «حافـز» رەببی لە گـەردنت بـێ!
چون چـاوەزاری وا پاك بۆ گەردنـی وەهـا نیـن

ملوێنکی لەعلی «کۆلیل» گوڵچینی خەڵکی چاوە
چ بکـەم پەسـەندی ناکا دڵبەر کە رەحمی لا نیـن

هر نکته‌ای که گفتم در وصف آن شمایل
هر کو شنید گفتا لله درّ قائل
تحصیل عشق و رندی آسان نمود اول
آخر بسوخت جانم در کسب این فضائل
حلاج بر سر دار این نکته خوش سراید
از شافعی نپرسند امثال این مسائل
گفتم که کی ببخشی بر جان ناتوانم
گفت آن زمان که نبود جان در میانه حائل
دل داده‌ام به یاری شوخی کشی نگاری
مَرضِیّةُ السَّجایا مَحْمودةُ الْخَصائِل
در عین گوشه گیری بودم چو چشم مستت
و اکنون شدم به مستان چون ابروی تو مایل
از آب دیده صد ره طوفان نوح دیدم
و از لوح سینه نقشت هرگز نگشت زایل
ای دوست دست حافظ تعویذ چشم زخم است
یا رب ببینم آن را در گردنت حمائل

ئەی بە روو جەننـــەت بە لێـو جۆ گـەی شــەراب
حـــەوزی کەوســـــەر بـۆ قومێــکی دڵ کەبــاب
خەتتـی ســــەوزی خـــاڵی دەوری دەم وەکـوو
وردە مێــــرووولەن لە سەرچــــاوەی گـــوڵاب
تیـــری دوو ئەبـــرۆ بە هـــەر شوێنـێ دەڕۆی
چەشنـی من کـوژراوی زۆرن شێـــخ و شـــاب
یـــاڕەب ئەو سـۆزی لـە دڵ بەربـــوومە وەک
ئـاگـــری دۆســـت لەگـــەڵـیا بێ خیـــتاب!
بێحـــەدن هەرچـــەن جەمـــاڵی گـوڵ بـــەڵام
دەرفـــــەتی یـــــاران! نەدا بەختـــی خـــراب
دووره کـــۆی ئــــازیـــز و ئێمەش پێشکـــاو
دەستـی کـــورت و قامـــەتی نەخلـــی جەنـــاب؟!
وردە وەک مێـــروو لە ژێـــر پێـــی فیــــلدا
حـــەزرەتی «حافــز» بە سـەرپەنجەی خـــەزاب
تۆ بمێـــنی! خـــۆش لەگـــەڵ جـــامی مـەی و
تەخت و بەخت و تاجی کەی چەنگ و روبــاب
عەشقـــــی «کۆلیـــــل»ـی دنـــــەی داوم، دەنـــا
دەستـــی دڵ ناگــــا بــــە بەژنـــی ئافتــــاب

ای رخت چون خلـــد و لعلت سلسبیل
سلسبیـــلت کـــرده جـــان و دل سبیـــل

سبـــــزپوشـــــان خطت بر گـــرد لب
همچـــو مورانـــــد گـــرد سلسبیـــل

نـــاوک چشـــم تـو در هـــر گوشـــه‌ای
همچـــو مـن افتـــاده دارد صـــد قتیـــل

یـــا رب این آتش که در جـــان من است
ســرد کن زان‌ســان که کردی بر خلیـــل

من نمی‌یـــــابم مجـــال ای دوستـــان
گرچـــه دارد او جمـــالی بس جمیـــل

پـــای ما لنـــگ است و منـــزل بس دراز
دست مـــا کوتـــاه و خرمـــا بر نخیـــل

حافـــظ از ســـرپنجـــه‌ی عشق نگـــار
همچو مور افتـــاده شـــد در پـــای پیـــل

شـــاه عـــالم را بقـــا و عـــزّ و نـــاز
بـــاد و هر چیـــزی که باشـــد زین قبیـــل

خۆشە کاتی گەنجی و ژوان و شەرابێ وەک هەنار
کۆڕی یەکدڵ، نۆشی دایم، هاوپیاڵەی خۆشقەرار
خۆشسەدا گۆرانیبێژێک و شەکەر دەم ساقییێ
هاودەمێ خۆش ناونیشان و هاونشینێ بێدەمار
شەنگ و شۆخێ، ئاوی ژین دڵپڕ لە جامی گەردنی
دڵبەرێ شەوقی جەماڵی گیانی خۆر پڕ کا لە قار
جێگە بەزمێ دڵنشین وەک باخی فیردەوسی بەرین
مێرگولانێ دەوروبەر، باخی بەهەشتی کردگار
عاشقان دڵ سەربەمۆر و بادەنۆشان کام خۆش
خۆشمەنش دانیشتوان و خۆشڕەوش خزمەتگوزار
جام تاڵ ئاقێقیێکی خۆشگەوار و توند و تیژ
نەقڵی یاقووتی دەمێ، نوقڵ و مەزەی لێوی نیگار
نازی ساقی تێغی کێشابێت بۆ تالانی هۆش
زولفی گیانان بۆ شکاری دڵ کەمەندی بێ لە کار
عالەمئارایێ دەس و دڵ باز وەک حاجی قەوام
شۆخ تەبعێ نوکتەگۆ وەک «حافز»ی شیرین وتار
هەرکەس ئەم بەزمەی نەویست ئارامی دڵ نەگرێ لە کۆش
کۆڕی وا هەرکەس نەچێ دەک نۆشی گیانی ژاری مار!
ئاسمان! «کۆلیل»ـە دڵ، هیچی لە تۆ ناوێ مەگەر
یەک بزەی لێوی ئەوین و تیشکی دوو چاوی خومار

عشق‌بازی و جوانی و شراب لعل فام
مجلس انس و حریف همدم و شرب مدام

ساقی شکردهان و مطرب شیرین سخن
همنشینی نیک‌کردار و ندیمی نیک‌نام

شاهدی از لطف و پاکی رشک آب زندگی
دلبری در حسن و خوبی غیرت ماه تمام

بزمگاهی دل نشان چون قصر فردوس برین
گلشنی پیرامنش چون روضه‌ی دارالسلام

صف‌نشینان نیک‌خواه و پیشکاران باادب
دوستداران صاحب اسرار و حریفان دوستکام

باده‌ی گلرنگ تلخ تیز خوش خوار سبک
نقلش از لعل نگار و نقلش از یاقوت خام

غمزه‌ی ساقی به یغمای خرد آهخته تیغ
زلف جانان از برای صید دل گسترده دام

نکته‌دانی بذله‌گو چون حافظ شیرین سخن
بخشش آموزی جهان‌افروز چون حاجی‌قوام

هر که این عشرت نخواهد خوشدلی بر وی تباه
وآن که این مجلس نجوید زندگی بر وی حرام

مەرحەبا خۆش قەدەم ئەی کۆتری گەردن بە پەیام
سەفــەرت خێـرا! لە دڵبەر چ خەبەر، مەنزڵی کام؟!
خوایـــە! ئەم قافڵـــەیەم دا بە دەسی حیفـــزی ئەتۆ
کە بە ئەو دژ لە کەمەنـــدە و دڵی ئـــازیـــزە بە کـــام
عەشقـــی دڵـــدار و ئەمـــن ئاخـــری نـایێت، لەبـەر
ئـــەوە هەرچـــی ئـــەزەلن تـــا ئەبـــەدیشن بە دەوام
گـــوڵ و سـەرون لە چەمـەن، ناز نووێن و بە دەمـار
چێـــرە بنوێنـــە خەرامـــان نەفـەسێ دەرکـــەوە لام!
گـــاوری زولفـــی ئەگەر، ئەمـری بە زوننـــارە بـــڕۆ
وەکو سەنعان بکە ئەو خەرقە لەسەر شـــان حـــەرام!
مەلی گیـــانم کە شنەی بـاڵی لەسەر سیدرە دەهات
حەبــــەشی دانـــەیی خـــاڵت بەنی کردوون لە شـــام
چـــاوی خوێنیـــنی ئەمن لایـــەقی نوستن نییە، کەی
خـــەوی بۆ هاتووە؟! کوژراوی چڵی دەردی مـــودام
پێـــم وتی بۆ منـــی عاشـــق نییـــە ڕەحمێکـــی دڵـت
من شکاتم ئەمـــەیە و تۆش ئەمە، چەرخیش لە پـــام
مەیلی «حافـــز» بە برۆی ئێـــوە حەقی خۆیەتی چون
ســـووچی میحـــرابە مەکـــانی وتنی دەرسی کـــەلام
کەچـــە رووگەی دڵی «کۆلیل» لەبەر قەوسی برۆت
قیـــبلە کەچ کـــردنی دڵ پڕیە لە ئـــاوات و مـــەرام

مرحبـــا طـــایر فـــرخ پی فرخنـــده پیـــام

خیـــر مقـــدم چه خبر دوست کجا راه کدام

یـــا رب این قافلـــه را لطف ازل بدرقـــه باد

که از او خصم به دام آمد و معشوقه به کـام

ماجـــرای من و معشـــوق مرا پـــایـــان نیست

هـــرچه آغـــاز نـــدارد نپذیـــرد انجـام

گـــل ز حـــد برد تنعـــم نفســـی رخ بنمـــا

ســـرو می‌نازد و خوش نیست خدا را بخـــرام

زلف دلـــدار چو زنّـــار همی‌فـــرمـــاید

برو ای شیـــخ که شـــد بر تن ما خرقه حرام

مرغ روحم که همـــی‌زد ز سر سدره صفیـــر

عـاقبت دانه‌ی خـــال تو فکنـــدش در دام

چشـــم بیمـــار مرا خواب نه درخـــور باشـــد

مَـــنْ لَـــهُ یَقْتُـــلُ داءٌ دَنَـفٌ کَیْـــفَ یَنـــام

تـــو ترحـــم نکنـــی بر من مخلـــص گفتـــم

ذاکَ دَعـــوایَ وَ هـــا أنْتَ و تِلْکَ الأیّـــام

حافـــظ ار میـــل به ابـــروی تو دارد شـــاید

جـــای در گوشه‌ی محراب کنند اهل کلام

عاشقی کوڵمی نمامێکە دڵم، خونچە دەمە
لە حەقی ویستووە دڵ دەوڵەتی ئەم تازە غەمە
بانگەشەی عەشق و نەزەربازی و رەندیم دەکەم
تا بزانی کە لە کۆی ئێمە هونەر کۆڕی جەمە
لە دەس ئەم خەرقە ریائیمە ترێقم من ئەڵێم
کە سەدی پینە لە هەر سیحرە، ئەتۆ بێژە کەمە!
خۆش بسووتێ لە غەمی! ئەی شەم ئەمێستاکە منیش
کەمەرم بەستووە بەم کارە، سەراپام شەمە
نامە سەر غەم، ئەوە لە گیان و دڵم کەم بووەتۆ
وڕە واقم لە سەرم فام نەما، نام چەمە؟!
وەکو «حافز» بە خەرابات دەچم پێخە دڕاو
کەرەمێ بەڵکو بکا ئەو گوڵە ئاراستەمە
کێیە باوەڕ بە قسەی ئێمەیی «کۆلیل» نەکات؟
غەمی دڵدار لە دڵ، دەوڵەتی عورب و عەجەمە

عـــاشق روی جـــوانی خـــوش نوخـــاستـــه‌ام
وز خـــدا دولت این غـــم به دعـــا خواستـــه‌ام

عاشـــق و رند و نظربـــازم و می‌گویـــم فـــاش
تا بـــدانی که به چنـــدین هنـــر آراستـــه‌ام

شـــرمم از خـــرقه‌ی آلـــوده‌ی خود می‌آیـــد
که بر او وصلـــه به صـــد شعبـــده پیراستـــه‌ام

خوش بسوز از غمش ای شمع که اینک من نیـــز
هـــم بدیـــن کـــار کمـــربسته و برخـــاستـــه‌ام

با چنـــین حیـــرتم از دست بشد صـــرفه‌ی کار
در غـــم افزوده‌ام آنچ از دل و جان کاستـــه‌ام

همچـــو حافـــظ به خرابـــات روم جامـــه قبـــا
بو که در بـــر کشـــد آن دلبـــر نوخـــاستـــه‌ام

هەر بۆ خودایە شوکری گەلی عاشقان بە جەم
مووژدەم دەنێ کە نوقمی زەماوەندە زێدەکەم
ئەو خۆش پەیامە کامە هەواڵی زەفەر بەون؟
تا گیانی خۆمی چەشنی سکەی سوور پۆیلە کەم
وا شاریار هاتەوە نێو کۆشکی زەڕنیگار
دژمن دەبێ بچێتە سەراپەردەکەی عەدەم
پەیمانشکێن دوچاری زەرەر دەستی ئاخرە
لە گرێوی عەهدە هەرکە، لەکن عەقڵی تاک و جەم
هیوای بوو لە هەوری کەرەم رەحمەتێ، بەڵام
هیچی نەدی بە غەیری نمی چاوی پڕ لە تەم
گەردون وتی بە تانە پەشیمان هەلی نەما
بێ کەڵکە تازە تۆبە کە غەرقی لە نیلی غەم
ساقی! کە یاری شۆخ و شرین ئەهلی راز بوو
«حافز» شەرابی نۆشی و شێخ و مەلاش هەم
«کۆلیل» گەرچی لایەقی لوتفت نەبوو وەلێ
هەر عادەتی بەهارە هەوا خۆش و تازە دەم

بُشْــری إِذِ الســـلامة حَلَّتْ بِـــذِی سَلَــم
لِلّهِ حَمْــــدُ مُعْتَـــرِفٍ غـــایة النِّعَــــم
آن خوش خبر کجاست که این فتح مژده داد
تا جــان فشــانمش چو زر و سیـم در قــدم
از باز گشت شــاه در این طــرفه منــزل است
آهنـگ خصـــم او بـه ســـراپــردهٔ عــدم
پیمـــان‌شکن هرآینـــه گردد شکستــه حــال
إنَّ الْعُهـــودَ عِنْـــدَ مَلیـکَ النُّهـــی ذِمَـــم
می‌جست از سحـــاب امـــل رحمتـــی ولـی
جــز دیـــده‌اش معـــاینه بیـــرون نداد نــم
در نیـــل غـــم فتـاد سپهـــرش به طنـــز گفت
ألانَ قَـــدْ نَدِمْـــتُ وَ مـــا یَنْـــفَعُ النَّـــدَم
ســـاقی چو یـــار مـــه‌رخ و از اهـــل راز بود
حافـــظ بخورد بـــاده و شیـــخ و فقیـــه هم

مەیگێڕ وەرگەڕێ کە هەواداری خزمەتم
دەربەس غولامی دەم بە موناجاتی دەولەتم
لەو جێ کە لوتفی ئێوە هەتاوی سەعادەتە
ڕێگەی نەجات کامە لە شەوگاری حیرەتم
هەر چەندە نوقمی بەحری گوناحانی بێحەدم
چون شارەزای عەشقی ئەتۆم ئەهلی رەحمەتم
سەرکوت بە عەیب و شۆرەتی رەندیم نەکا حەکیم
خۆ خۆم دەسم نەداوە لە داهات و قسمەتم
مەی خۆ! کە عەشقی سینە بە هەوڵ و خەبات نین
ئەم نیعمەتەم خەلاتە لە میراتی فیترەتم
تەرکی وەتەن بە عەزمی سەفەر قەت نەبوو لەسەر
بۆ دیتنت ئەمێستە ئەویندار غوربەتم
بەحر و بەرم لە ڕێن منی لاواز و دڵشەکەت
ئەی خزری خۆش‌قەدەم وەرە موحتاجی هیممەتم
دوورم لە مەحزەرت، بە رواڵەت لە لات نیم
ئەمما بە گیان و دڵ لە پەنادەستی حەزرەتم
«حافز» موڕادی مەرگە لەبەر چاوی مەستی تۆ
گەر مۆڵەتم بدا تەمەنی کورتە دەرفەتم
دەردی گرانی سینگی ئەمن بێدەوایە، هەر
«کۆلیل»و چاو لە دەستی تەبیبی کریشمەتم

بـــاز آی ساقیـــا که هـــواخـــواه خدمتـم
مشتـــاق بنـــدگی و دعـــاگـــوی دولتـم

زآن‌جا که فیض جام سعـادت فـروغ توست
بیـــرون شـــدی نمـــای ز ظلمـــات حیرتـم

هرچنـــد غـــرق بحر گناهـــم ز صـد جهت
تـــا آشنـــای عشق شـــدم ز اهـــل رحمتـم

عیبـــم مکن به رنـــدی و بدنـامی ای حکیم
کـــاین بود ســـرنوشت ز دیـــوان قسمتـم

می خور که عاشقی نه به کسب است و اختیار
این موهبـــت رسیـــد ز میـــراث فطرتـم

من کـــز وطن سفـــر نگزیدم به عمـــر خویش
در عشـــق دیـــدن تو هـــواخـــواه غربتـم

دریـــا و کوه در ره و مـــن خستـــه و ضعیف
ای خضـــر پی خجستـــه مـــدد کن به همتـم

دورم به صـــورت از در دولت‌ســـرای تـــو
لیکـــن به جـــان و دل ز مقیمـــان حضرتـم

حافظ به پیش چشـــم تو خواهـــد سپرد جـــان
در این خیـــالـم ار بدهـــد عمـــر مهلتـم

دوێنەشـەو چـاوی نەخۆشی دەری هێنا لە دەسـم
گیـان، وەلێ مەرحـەمەتی لێوی دەمانی نەفەسـم
عەشقی ئێـمە و خـەتی بـۆنخۆشی ئەتۆ تازە نییە
رۆژگـارێکە کـە بـەم جـامی هیلالیتە مەسـم
لە وەفـاداریی خـۆمم بە دڵ ئەم نوکتـە خۆشە
کە جەفـای ئێوە گوڵم خێرە لە رێگەی مەبەسـم
چـاك بوونی منی مەیخـانەنشین لاوە لە سـەر
تا بمێـنم کەمەری خزمـەتی رەنـدان دەبەسـم
پـاش مەرگیش خەتەر زۆرە لە رێی عەشق، نەڵێی
کە نەجـاتم بووە، عومری چووە تین و هەوەسـم!
لەمـە بە دوا نیـیە باکـم لـە دژی تیـراوێـژ
چون کەوانی خەمی ئەبرۆت شوکور کەوتە دەسـم
مـاچی ئاقێـقی دەمت بۆیـە حەڵاڵـی منە هەر
نەشکا مۆری حـەزی گەنجی ئەوینت بە کەسـم
شەڕکـەرێ شۆخ دڵی بردم و چوو، وای ئەگـەر
ئامیـری هێـز نەپـرسێت! وەکـوو دادڕەسـم
تێـپەڕیبوو لە فەلـەك روتبەیی «حافز» بە هونەر
هاتە وێزەم غەمی شمـشاڵی قەدت کردی پەسـم
لە وڵاتی غەمـی بەژنت بە عـەداڵەت «عومـەر»م
بـا لەبەر چـاوی رەقیـبا نەتەوەی خار و خەسـم

دوش بیمـــاری چشـــم تو ببـــرد از دستـم
لیـــکن از لطف لبت صورت جـان می‌بستـم
عشـــق من بـــا خط مشکیـــن تو امروزی نیست
دیـــر گاه است کزیـــن جـــام هـلالی مستـم
از ثبات خودم این نکته خوش آمد که به جور
در ســـر کـــوی تو از پـــای طلب ننشستـم
عـــافیت چشـــم مـــدار از من میخـــانه‌نشیـــن
که دم از خـــدمت رنـــــدان زده‌ام تا هستـم
در ره عشق از آن سوی فنـــا صـد خطـر است
تا نگویی که چو عمـــرم به سر آمـــد رستـم
بعد از اینـم چه غـــم از تیـــر کج‌انداز حسود
چون به محبوب کمان ابـــروی خود پیوستـم
بوســـه بر درج عقیـــق تو حـــلال است مرا
که به افســوس و جفـــا مهـــر وفـــا نشکستـم
صنمی لشکریـــم غـــارت دل کـــرد و برفت
آه اگر عـــــاطفت شـــــاه نگیـــرد دستـم
رتبت دانش حافـــظ به فلـک برشـــده بـــود
کرد غمخـــواری شمشـــــاد بلنـدت پستـم

ئەرێ! بەجێ لەوە، زانین و دین لە دەستم چوو
لە عەشقتم مەگەر ئاخر شتێ بە قسمەت بوو
بە خاکی پات قەسەم سەربەمۆرە دڵ بۆ تۆ
ئەگەرچی یادی غەمت عومرمی فەنا فەرموو
لەگەڵ هەتاو رەفێقم بە عەشقی تیشکی رووت
بە چەشنی زەڕڕە ئەگەرچی بچووکم و کەمسوو
شەراب تێکە! کە عومرێکە قەت لە سووچێکۆ
نەبوو بە خاتری خۆشی، نەفەس لە هات و چوو
نەسێحەتم مەکە واعیز! کە ژیر و وەشیاری
قسەت لە گۆڕ مەنێ! بۆ منێ مەس و خەوتوو
کە هەڵنەهات لە دەستم شیاوی خزمەتی تۆ
لە رووم نایە لە رووتا کەمێ هەڵێنم روو
بسووت «حافز»و ئارامی دڵ لە یادی نەما
کە مەڵهەمێکی بدا بۆ برینی خۆکردوو
نەچیرە گەردنی «کۆلیل»و داوە زولفی تۆ
غەزەڵ لە ئێمە، لە پرچت شەرارەت و جادوو

به غیـر از آن کـه بشد دین و دانش از دستـم
بیـا بگـو که ز عشقت چه طـرف بربستـم
اگرچه خرمـن عمـرم غـم تو داد به بـاد
به خـاک پای عزیزت که عهـد نشکستـم
چو ذره گرچه حقیـرم ببـین به دولت عشق
که در هـوای رخت چون به مهـر پیوستـم
بیـار بـاده که عمری‌ست تا من از سـر امن
به کنـج عافیـت از بهـر عیـش ننشستـم
اگـر ز مـردم هشیـاری ای نصیحتـگو
سخن به خـاک میفکن چـرا که من مستـم
چگونه سـر ز خجـالت برآورم بـر دوست
که خدمتـی به سـزا برنیـامد از دستـم
بسوخت حافـظ و آن یـار دلنـواز نگفت
که مرهمی بفـرستم که خـاطرش خستـم

قــژ پەرێشــان مەکــە بۆ بــا! نــەبــەرێ بــا بــادم
نــــازی ئــــاوا مەکە! وێــــران کە دەکــــەی ئــابــادم
مەی لەگەڵ هەرکە مەخـۆ! تا کو نەخۆم خوێنی جیگەر
مەکــــە سەرپێــــچی! ئەپێچێـــــتە فەلـەک فەریــــادم
زولفــــەکەت حەڵقــە نەکــەی بەڵکە نەکەی دڵگیـرم
پێــچی کاکــوڵ مەدە! کــــاول کـە دەبــێ بنــــیادم
ناشنــــایان مەکـــــە دۆســـت! کە لە خۆ غەیــرە دەبــم
غەمــــی بێــــگانــە مەخـــۆ بەڵکــو نەکەی ناشــــادم
چێــــرە بنوێنــــە هەتـــا دڵ لە پــەڕی گــوڵ زەدە بــێ
هەستــــــە بەو بەژنــتــە فەرمـــــووا! لە ســــەرو ئــــازادم
شــــــەمی هەر کــــۆڕ نەبی! گڕ بە دڵـــــم تا نەکــــەوێ
یــــــادی هەر خێــــڵ نەکەی! لێــــڵ نەبــێ با یــــــادم
شۆرەتی شـــــاری هەتا، مەڵبــەنی من دەشت و چییـان
هەرچـــــی شیــــرین بنوێنــــی فــــرەتر فــەرهـــــادم
دڵهــــــەژاری بەزەییـــــــتم وەرە فـــــریــــــام کــــــەوە!
با بە گوێــی ئاســــەفی دەوران نەگـــــەیێ هـــــەی دادم
خوا نـــــەکا «خاجــــــە» لە بێـــدادی ئەوین رووگەردان
چـونــکە ئــەو رۆژە لە زینـــــدانی ئەتـــۆم، ئـــــازادم
هەرکــە هـــــات و وتی من هـــــاوەڵی «کۆلیــــل»ـەکەتم
پێــی بڵــێ گــوم بە! کە ئــەو سنجــووە من شمشـــــادم

زلف بر بـــاد مـده تـا نـدهی بـر بـادم
نـــاز بنـياد مكـن تا نكنـــی بنـــيادم
مـی مخور با همـه‌كس تا نخـورم خـون جگر
سـر مكش تا نكشـد سـر به فلك فريـادم
زلف را حلقـــه مكن تـــا نكنـــی دربنـــدم
طـــرّه را تـــاب مـــده تـــا نـــدهی بر بادم
يـــار بيگـــانه مشـــو تا نبـــری از خويشـــم
غـــم اغيـــار مخـــور تـا نكنی ناشـــادم
رخ برافـــروز كه فـــارغ كنی از برگ گلـم
قـــد برافـــراز كه از ســـرو كنی آزادم
شمـــع هر جمـــع مشو ور نه بســوزی مـا را
يـــاد هـــر قـــوم مكن تا نـــروی از يـــادم
شهـــره‌ی شهـــر مشو تا ننهـــم ســر در كـوه
شـــور شيـــرين منمـــا تا نكنـی فرهـــادم
رحـــم كن بر من مسكين و به فـريـــادم رس
تا به خـــاك در آصف نرســـد فريـــادم
حافـــظ از جـور تو حاشـــا كه بگرداند روی
مـــن از آن روز كـــه دربنـــد تـــوأم آزادم

راشکاو ئێژم و لەم روکوتنەی خۆ شادم
حەڵقە بە گوێی غەمی دڵم و لە دو کەون ئازادم
چۆن بکا باس لە دووری؟ مەلی گولزاری بەهەشت
چۆن بڵێم بۆ چیە گیرۆدەیی نێو بێدادم؟
بابم ئاوا منی هێناوەتە ئەم وێرانە
من دەنا خەڵکی ئەوین باخی مەلەکئابادم
کەوسەر و سێبەری تووبا، کچی چاو مەست و خومار
بە حەزی ئێوە هەموو چوونە لە هۆش و یادم
پیتی نێو دەفتەری دڵ ئەلفی قەد و قامەتی تۆن
فێری حەرفێ تری چبکەم کە نەکرد ئوستادم
گەشی ئەستێرەشناسێک نەدی، بەختی رەشم
داکی گەردون منی چۆن دیوە؟ خودایا دادم!
لە دەری مەیکەدە لەو ساتەوە دڵ حەڵقە لە گوێن
هەر خولەک تازە غەمێ دێتە موبارەکبادم
خوێنی دڵ، خەڵکی دییەم هەرچی بنۆشێت رەوان
بە جیگەرگۆشەیی خەڵکی کە ئەوەن دڵشادم
ئەشکی سەر روومەتی «حافز» نەسرێ زولفی رەشت
گورمی لافاوی غەمت هەڵدەکەنێ بنیادم
پێ ئەسیری گڵی ئەسرینی دییەی «کۆلیل»م
بەش بڕاوی گوڵی نەسرین و قەدێ شمشادم

فـاش می‌گویم و از گفتـه‌ی خود دل‌شـادم
بنــــده‌ی عشقــم و از هـر دو جهــان آزادم
طــایر گلشن قدســـم چه دهـم شرح فراق
که در این دامگـــه حـــادثه چون افتـــادم
من ملک بودم و فـــردوس بـرین جایـم بود
آدم آورد در ایـن دیـــر خـــراب‌آبـــادم
سـایه‌ی طوبی و دلجویی حور و لب حوض
به هـــوای ســـر کـــوی تو برفت از یـــادم
نیست بر لوح دلـم جـز الف قـامت دوست
چه کنـــم حـــرف دگر یـــاد نداد استـــادم
کوکب بخت مـــرا هیـــچ منجـم نشناخت
یـــا رب از مـــادر گیـتی به چه طالع زادم
تا شـــدم حلقه به گوش در میخـانه‌ی عشق
هر دم آیـــد غمـــی از نو به مبـارک بادم
می خورد خون دلم مردمک دیـده سزاست
که چـــرا دل به جگرگوشـه‌ی مـردم دادم
پاک کن چهره‌ی حافظ به سر زلف ز اشک
ور نـه این سیـــل دمـــادم ببـــرد بنـیادم

که دەمبینی هەمـوو دەم، سـەر دەخەی سۆزی برینانـم
که دەتبینم هەموو دەم زۆر ئەبێ هەست و حەزی گیـانم
بە دەردم شــارەزای و نانووێنــی هیــچ دەرمــانێ
له ســـەرتا چی ببـێ ئاخــۆ که ناپـرسی له سامــانم
هەوالێکم بپــرسه و پێ له خــاکی رێـت بێ دانــێ!
خــودا هەڵناگــرێ نەگـری سوراغێکی له رێمـانم
مەگەر مــردن دەسـم بــەردا له داوێنت، ئەگەرچی بـاز
له گۆرێشـا بە خـاکی گیـان و دڵ هەر دەستەدامــانم
دەمــارت لێ دەرێنــام و کەچـی نالێــی دەرمهێــنا
نەفەس گیـری غەمی عەشقم هەتاکەی تەفرە؟! نازانــم
له شوێنی دڵ شـەوێ رێـم کەوتە باخـی زولفی رێحانت
له سـەیری رووماتت جـامێ هیلالی هەڵمـژی گیـانم
له باوەشتم کوتوپڕ گرت و زولفت کەوتە پێـچ و تـاو
دڵ و گیــانم فیــدا کردی که لێــوت کەو له لێــوانم
لەگــەڵ «حافز» دەمێ خۆش بـە و بە دژمن بێژە با بمـرێ
که تۆ گــەرمی ببەخشی چیدەکا ســەردی رەقیـبانم
بەهــاری مەیلی ئێـوەی هەڵمـژیوە رۆحی «کۆلیـل»ـت
بە دیقـی چــاوی پاییز و هەناســەی سـەردی زستــانم

مرا می‌بینی و هر دم زیادت می‌کنی دردم
تو را می‌بینم و میلم زیادت می‌شود هر دم
به سامانم نمی‌پرسی نمی‌دانم چه سر داری
به درمانم نمی‌کوشی نمی‌دانی مگر دردم
نه راه است این که بگذاری مرا بر خاک و بگریزی
گذاری آر و بازم پرس تا خاک رهت گردم
ندارم دستت از دامن بجز در خاک و آن دم هم
که بر خاکم روان گردی به گرد دامنت گردم
فرو رفت از غم عشقت دمم دم می‌دهی تا کی
دمار از من برآوردی نمی‌گویی برآوردم
شبی دل را به تاریکی ز زلفت باز می‌جستم
رخت می‌دیدم و جامی هلالی باز می‌خوردم
کشیدم در برت ناگاه و شد در تاب گیسویت
نهادم بر لبت لب را و جان و دل فدا کردم
تو خوش می‌باش با حافظ برو گو خصم جان می‌ده
چو گرمی از تو می‌بینم چه باک از خصم دم سردم

سالیانێکە هەواداریی رەندان دەکەم
بۆیە دێوی هەوەس و نەوس لە زیندان دەکەم
خۆ بە سەرمەنزڵی سیمورغ لە رێ نابەڵەدم
قەتعی ئەم رێگە لەگەڵ پەیکی سولەیمان دەکەم
وەرە تۆی ئەو دڵە زامارمە ئەی گەنجی دەروون
ماڵی خۆ چونکە لەبەر ئێوەیە وێران دەکەم
حەیف ئەو تۆبە لە ماچی دەمی ساقیم کە کرد
ئێستە لێوم دەگەزم، هەیوەی و ئامان دەکەم
پێچەوانەی ئەوە عادەت کە دەڵێ، داواکە!
من دڵم جەم بە قژی پەخش و پەرێشان دەکەم
نەخشی وەشیاری و مەستی نە بە دەستی من و تۆن
ئەمری چۆن داوە ئەزەل، هەر بە وتەی وان دەکەم
هەمە چاوی کەرەمی باخی بەرین هەر لە ئەزەل
هات و چۆی مەیکەدە هەرچەندە فراوان دەکەم
بۆیە بەم پیرییە یۆسف لەگەڵم دەس لە ملە
ئەشکی ئاڵم بە شەمی کۆخی غەم و ژان دەکەم
وەکو «حافز» کە سەحەرخێزم و دڵخوازی ئەوین
کاری خۆ پوختە لە سایەی گوڵی قورئان دەکەم
بۆیە بەمجۆرە لە دیوانی غەزەڵ سالارم
چون گەلێ ساڵە غولامی سەری دیوان دەکەم
دەسی «کۆلیل» سەبا بگرە! لە رێی عەشق و موراد
کە بە دڵ روو لە سەبا شاری دڵ و گیان دەکەم

سال‌ها پیروی مذهب رندان کردم
تا به فتویّ خرد حرص به زندان کردم

من به سرمنزل عنقا نه به خود بردم راه
قطع این مرحله با مرغ سلیمان کردم

سایه‌ای بر دل ریشم فکن ای گنج روان
که من این خانه به سودای تو ویران کردم

توبه کردم که نبوسم لب ساقی و کنون
می‌گزم لب که چرا گوش به نادان کردم

در خلاف آمد عادت بطلب کام که من
کسب جمعیت از آن زلف پریشان کردم

نقش مستوری و مستی نه به دست من و توست
آن‌چه سلطان ازل گفت بکن آن کردم

دارم از لطف ازل جنت فردوس طمع
گرچه دربانی میخانه فراوان کردم

این که پیرانه سرم صحبت یوسف بنواخت
اجر صبری‌ست که در کلبه‌ی احزان کردم

صبح‌خیزی و سلامت‌طلبی چون حافظ
هرچه کردم همه از دولت قرآن کردم

گر به دیوان غزل صدرنشینم چه عجب
سال‌ها بندگی صاحب دیوان کردم

خەو چوو شەوم لە دیدە بە سێلاوی سووری غەم
سەر نەخشی خەتتی ئێوەی ئەکێشا بە ئەشکی چەم
ئەبرۆی یار و خەرقەیی سووتاوی خۆم و بەس
سەرخۆشی جامی بادە بە یادی هیلالی خەم
دەمخستە داوی زولفی رەشت هەر مەلێ بکا
فیکری فڕین لە ناخی خەیاڵ و خەتی قەڵەم
روخساری یار خۆی ئەنوواند و لە دوورەوە
ماچی دەکرد کوڵمی گوڵی مانگەشەو، دییەم
چاوم لە بەژنی ساقی و گوێشل بە دەنگی چەنگ
ئەم فاڵی چاو و گوێمە بە نوقلانە لێئەدەم
نەخشی خەیاڵی روومەتی تۆم تا سەحەر لە نێو
مۆزەی گلاری بێخەو ئەکێشا لە خاترەم
ساقی شەرابی ئەم غەزەڵەی پێشکەشم دەکرد
یانی لە من سوروود و لە ئەو جامی بەزمی جەم
خۆش بوو ژیانی «حافز» و فاڵی دەگرتەوە
بۆ کام و بەختی خۆی و ئەویندارەکانی هەم
«کۆلیل»ی بەژنی زێد و ئەوینم، بە سۆز ئەڵێم
دێوانە زۆری زۆرە وەلێ هەر یەکێکە شەم

دیشب به سیل اشک ره خواب می‌زدم
نقشی به یاد خط تو بر آب می‌زدم
ابروی یار در نظر و خرقه سوخته
جامی به یاد گوشه‌ی محراب می‌زدم
هر مرغ فکر کز سر شاخ سخن بجست
بازش ز طره‌ی تو به مضراب می‌زدم
روی نگار در نظرم جلوه می‌نمود
وز دور بوسه بر رخ مهتاب می‌زدم
چشمم به روی ساقی و گوشم به قول چنگ
فالی به چشم و گوش در این باب می‌زدم
نقش خیال روی تو تا وقت صبحدم
بر کارگاه دیده‌ی بی‌خواب می‌زدم
ساقی به صوت این غزلم کاسه می گرفت
می گفتم این سرود و می ناب می‌زدم
خوش بود وقت حافظ و فال مراد و کام
بر نام عمر و دولت احباب می‌زدم

هەرچەند پیــــر و دڵشـــە کەتی دەرد و ژان بووم
هەرکـات شەوقی رووبـەتی تۆم دی جـووان بووم
شوکری خـــودا ئەوەی کە لــەوم ویستوون بە دڵ
تـا دوا پلـــەی مـورادی ئەویـن کامــــەران بووم
ئەی دارەگـول! بخۆ بەری دەولەت کە من لە سای
خونچـــەی دەمت بە بولبـولی باخــی گولان بووم
نەمبوو لە ژێــر و ژووری هەویــری لەشـم هـەواڵ
لوتفــی ئەوینــی تۆیــە، وەهـــا نوکتــەزان بووم
چــارەم دەبـا بە مەیکــەدە، هەرچەن کە سەردەمێ
شێــخی وڵات و زاهیـــدی خاوەن مەکـان بووم
ئەو رۆژە دەرکــی گەنجـی حەقیــقەت کـراوە بۆم
کــاشق بە خــاکی بەر دەری پیــری موغـان بووم
لەو دەرکەدا گەیشتووە پێم تەخت و بەخت و جـام
مـەی‌نۆش وا بە کــام و حـــەزی یـــاوەران بووم
لەو رۆژەوۆ گەیی شــەڕی چـاوت بە من، ئەدی
هێـــور لە دڵهـورەی شەڕی ئاخـر زەمـان بووم
دڵ پیـــری مانگ و ســاڵی نەبـــوو، یار بێوەفــان
تێــپەڕ دەبێ بە چەشنــی تەمــەن، پیــری وان بووم
مــوژدەی ئومێــدی دا شــەوی پێشوو کە بێــرەوە
«حافــز»! ئەمــن هەمیشــە بە لوتـف و ئەمـان بووم
پۆشــای گوڵ کە رووبـــەنی «کۆلیــل» تێــگەیی
رەحمــەت لە شوێنــە هــەور و هەڵا، شادمان بووم

هرچند پیـــر و خستـه‌دل و ناتـوان شـدم
هرگــه که یـاد روی تو کردم جوان شــدم

شکر خـــدا که هرچه طلب کردم از خـــدا
بر مُنتهـــای همـت خـود کـــامران شـدم

ای گلـــبن جـوان بر دولت بخور که مـن
در ســایه‌ی تو بلبـــل بـاغ جهـــان شـدم

اول ز تحت و فـــوق وجـودم خبر نبـود
در مکتب غـم تو چنـین نکتــه‌دان شـدم

قسمت حوالتــم به خرابـــات می‌کنـد
هرچنـد کاین‌چنین شدم و آن‌چنـان شـدم

آن روز بر دلــم در معنـی گشـوده شـد
کـز ساکنـــان درگـه پیـر مغـان شـدم

در شاهـــراه دولت ســـرمد به تخت بخت
با جــام می به کـــام دل دوستـــان شـدم

از آن زمـان که فتنه‌ی چشمت به من رسید
ایمـن ز شـر فتــنه‌ی آخـر زمـان شـدم

من پیـر سال و ماه نیـم یـار بی‌وفـاست
بر من چو عمر می‌گذرد پیـر از آن شـدم

دوشـــم نویـد داد عنـایت که حـافظـــا
بـــازآ که من به عفـو گناهت ضمان شـدم

ئەویـــن رەسمـــتی کێشـــا لـە خاتـــرەی دیـیەکانــم
نە دیتــم و نە شنــەفتم یەکــێ وەك ئێــوە جووانـــم
بەڵــێ لە شوێنــت ئەمــن شــانبەشــانی بــادی شەمــاڵم
بەلام قــەت نەگەیشتــم بە بــەژنی ســـەروی رەوانـــم
نەمـــا لە رۆژی تەمەنما، ئومێـــدی زولفی شەوت وەك
نەبـــوو تەمـــاحی دەمت لا دەروونی کەیلـی غەمانـــم
لە لێـــوی بـــادەفــرۆشت چ نــاز و عیشوە کە سەنــدم
بە شـــەوقی ئــاوی ژیــانت چ ئەشکی گەش کە رژانــم!
بە نـــاز بۆ دڵی خوێنـــین چ تیـــر چوو لە کـــەوانت
لە حەسرەتی شـەوی پرچــت چ باری غەم کە لە شانـــم
سەبـــا دە بێـــنە غوبـــارێ! لە دەرکـی یـــار کە بۆنـی
گوڵاوی جەرگ و دەرون دێ لە خــاکی دەرکی ئەوانـــم
خەتـــا لە چـــاوی رەشت بوون و گەردنـی وەکو جامت
کە چەشنی مامــزی کێـــوی لە تۆ رەمــۆك و رەوانـــم
بە چەشنی خونچــە نەسیمـــێ لە بۆی بەهـــاری کە هـاتن
دڵـــم لـە پـــەردەیی خوێنـــین بە دەرێنـــان و درانـــم
بە تیشکی دیـــدەیی «حافــز» بە خــاکی پێت قەســەم بێ
کە نـــووری چاو لە کوڵـم و هەتـــاوی ئێـــوە دەزانـــم
قەسـەم بە حەسرەتی «کۆلیـل»و هەم بە حــەزرەتی عەشقت
خەیـــاڵی بێ خـــەمی زولفت شــەوێ نەبوو لە ژیانـــم

خیال نقش تو در کارگاه دیده کشیدم
به صورت تو نگاری ندیدم و نشنیدم
اگرچه در طلبت همعنان باد شمالم
به گرد سرو خرامان قامتت نرسیدم
امید در شب زلفت به روز عمر نبستم
طمع به دور دهانت ز کام دل ببریدم
به شوق چشمه‌ی نوشت چه قطره‌ها که فشاندم
ز لعل باده‌فروشت چه عشوه‌ها که خریدم
ز غمزه بر دل ریشم چه تیرها که گشادی
ز غصه بر سر کویت چه بارها که کشیدم
ز کوی یار بیار ای نسیم صبح غباری
که بوی خون دل ریش از آن تراب شنیدم
گناه چشم سیاه تو بود و گردن دلخواه
که من چو آهوی وحشی ز آدمی برمیدم
چو غنچه بر سرم از کوی او گذشت نسیمی
که پرده بر دل خونین به بوی او بدریدم
به خاک پای تو سوگند و نور دیده‌ی حافظ
که بی رخ تو فروغ از چراغ دیده ندیدم

بەهـۆی دەستی کولّی خۆ شـەرمەزارم
که ناگـا قـەت بە بەژنی بەرزی یـارم

مەگـەر بگرێ دەسـم زەنجیـری زولفی
دەنـا شێـتی پەتی، رسـوا لە شـارم

لە چـاوی من بپـرسن رازی گـەردون
کە شـەو تاکوو سەحـەر ئەختـەرژمارم

لە سـەر من نەزرە مـاچی لێوی ساغـەر
کە بـەو نـاسیـمە رەمـزی رۆژگـارم

دوعـایێ گەر بکـەم بۆ مەیفرۆشـان
چبوو چون کوفری نیعمـەت نەبوە کـارم

کە هێـزی مـەردمئـازاری نەدا پێـم
گەلێ مەمنـوونی قۆلـی گـەلمـەدارم

سەرێکم لایە خۆش وەک «حافز» ئەمما
سـەرێ خۆشتر لە کۆی لوتفی بەهارم

ئەگـەرچی موی سـەرم رۆژی سپیمن
بە دڵ «کۆلیـل»ـی کاکـۆڵی شەوارم

ز دست کوته خود زیر بارم
که از بالابلندان شرمسارم

مگر زنجیر مویی گیردم دست
وگرنه سر به شیدایی برآرم

ز چشم من بپرس اوضاع گردون
که شب تا روز اختر می‌شمارم

بدین شکرانه می‌بوسم لب جام
که کرد آگه ز راز روزگارم

اگر گفتم دعای می فروشان
چه باشد حق نعمت می گزارم

من از بازوی خود دارم بسی شکر
که زور مردم‌آزاری ندارم

سری دارم چو حافظ مست لیکن
به لطف آن سری امیدوارم

دڵ بە زولفی لە گرێ پڕپڕە هەرچەند، بەڵام
چاوەڕێم مەرحەمەتێ! تاقە گوشادێکە دەوام
کوڵمی سوورم نە بە هۆی شادییە، خوێنی جیگەرە
کە نمایانە لە روو چەشنی شەرابی دڵی جام
بە سەراپەردەم ئەگەر یار بدا ئیزنی حوزوور
لە سەرم هۆش دەبا موتریبی خۆش دەنگ و مەقام
شەو هەتا رۆژ ئەدەم کێشکی دڵ بەڵکە نەبێ
غەیری ئازیز لە ئەو خەڵوە دنەی فیکر و مەرام
منم ئەو ساحیرە زانا کە بە ئەفسوونی غەزەل
لە قەڵەم نەی، شەکەر و قەندم ئەچۆڕێ بە دەوام
چاوی ئیقبال بە ئەفسانەیی چاوی چووە خەو
خەوەرم کاتەوە ئاخۆ بە شنەی پەرچەمی شام؟!
کات و یارا نییە، یارا! لە گوزەر بتبینم
تۆ بڵێ چۆنی بڵێم رازی دڵ و رەمزی حەیام؟!
دوێشەو ئەیوت کە ریا پیشەیە «حافز» دژی دون
غەیری خاکی دەری دۆسی نییە بازاڕ بەڵام
شەرحی «کۆلیل» لەسەر مەتنی قژی سەختە کە وا
بە هەڵەی حاشیە لێ کردوە، شەوکوێری نەفام

گرچه افتاد ز زلفش گرهی در کارم

همچنان چشم گشاد از کرمش می‌دارم

به طرب حمل مکن سرخی رویم که چو جام

خون دل عکس برون می‌دهد از رخسارم

پرده‌ی مطربم از دست برون خواهد برد

آه اگر زآن‌که در این پرده نباشد بارم

پاسبان حرم دل شده‌ام شب همه شب

تا در این پرده جز اندیشه‌ی او نگذارم

منم آن شاعر ساحر که به افسون سخن

از نی کلک همه قند و شکر می‌بارم

دیده‌ی بخت به افسانه‌ی او شد در خواب

کو نسیمی ز عنایت که کند بیدارم

چون تو را در گذر ای یار نمی‌یارم دید

با که گویم که بگوید سخنی با یارم

دوش می‌گفت که حافظ همه روی است و ریا

بجز از خاک درش با که بود بازارم

گەردیٚ لە بەری پێی کە کەرەم کات نیگارم
بەو سورمەیە خەتتێک دەکێشم لە گلارم
بۆ عەتری کنارت بووە دڵ غەرق و بە هێوام
ئەسرین بە شەپۆلێکی بخا دڵ بە کنارم
فەرمان کە بنێرێتە سەرم گیان بسپێرم
خێرا دەکوژێمۆ وەکو شەم بۆ دڵی یارم
سەرکەش مەبن ئەورۆ لە وەفامان و بترسن
لەو نیوەشەوەی دەستی دوعا بەرزە لە زارم
دوو زولفی رەشت بوو بە قەراری دڵی هەموان
ئەمما لە دڵ ئەم کارتە بردوویە قەرارم
ئەی سروە نەسیمێکی موعەتتەر لە شەرابم
بۆ بێنە! کە بەو بۆنە دەبێ دەفعی خومارم
ئازیز! ئەگەر زێڕی دڵم قەڵبە عەیاری
فەرموو ئەوە فرمێسکی دیەی هەژدە عەیارم
ئەم عاشقە خاکیتە لە دەر دەر مەکە! چون پاش
مردن لە دەرت ساکنە هەر گەرد و غوبارم
«حافز»! کە بزەی لێوی ئەوم گیانی شرینە
ئەو ساتە بە لێو گیان دەگەیێ، فەسڵی بەهارم
تا عەتری بەرۆکت لە سەرم چەتری بەهارە
«کۆلیل»ـم ئەگەرچی، لە فەلەک ژوورە هەوارم

گر دست دهد خاک کف پای نگارم
بر لوح بصر خط غباری بنگارم
بر بوی کنار تو شدم غرق و امید است
از موج سرشکم که رساند به کنارم
پروانه‌ی او گر رسدم در طلب جان
چون شمع همان دم به دمی جان بسپارم
امروز مکش سر ز وفای من و اندیش
زان شب که من از غم به دعا دست برآرم
زلفین سیاه تو به دلداری عشاق
دادند قراری و ببردند قرارم
ای باد از آن باده نسیمی به من آور
کان بوی شفابخش بود دفع خمارم
گر قلب دلم را ننهد دوست عیاری
من نقد روان در دمش از دیده شمارم
دامن مفشان از من خاکی که پس از من
زین در نتواند که برد باد غبارم
حافظ لب لعلش چو مرا جان عزیز است
عمری بود آن لحظه که جان را به لب آرم

لە سـەراپەردەیی شـاییم بتێ تاجی سەرە
دڵ لەبەر کوڵم و قژی ناڵ لە کوورەی خەتەرە
سوور و بێباک دەڵێم ئاشق و مەینۆشم و رەند
لەو پەریشێوەیە ئەم هەموو مەقامم لە سەرە
من بە ئاخی سەحەرت کەزیە پەرێشان دەکەم
تۆ کە بەم شێوە سزادانی منت پێ هونەرە
خەت و خاڵی ئەگەر ئازیز لە روو مێخەکییە
روومەتی زەردی ئەمن سوور بە خوێنی جیگەرە
قەدەمێ هەڵگری بۆ کۆخی سەفاخانەم ئەگەر
کیژی تاکم هەیە شیعری شەکەرینم لە بەرە
تیری ناز و کەمەنی زولفی بهێنی! کە لەگەڵ
دڵی زامار و جەفاکێشم ئەمن شۆر و شەڕە
هەر ئەوەم چاترە «حافز»! کە خۆش و شاد بژێم
چون غەم و شایی دونیا لە ژیان زووگوزەرە
چاوی بارامت ئەگەر تیر و کەوانێکی هەیە
نازکێشی دەس و مێشی لە سەقز هەر «عومەر»ە

در نهــانخــانه‌ی عشــرت صنمــی خوش دارم
کـز ســر زلـف و رخش نعـل در آتش دارم
عاشــق و رنـــدم و می‌خــواره به آواز بلنـــد
وین همه منصب از آن حــور پریــوش دارم
گر تو زین دست مــرا بی سر و سامـان داری
مـن بـه آه سحـــرت زلـف مشـــوش دارم
گر چنـین چهره گشاید خط زنگـاری دوست
مــن رخ زرد به خــونـــابـه‌ی منقــش دارم
گر به کاشـــانه‌ی رنـدان قـــدمی خواهی زد
نقــل شعـــر شکــرین و مـی بی‌غـش دارم
نـــاوک غمـــزه بیــار و رســن زلف که من
جنگ‌هـــا بـا دل مجـــروح بـــلاکش دارم
حافظا چون غـم و شـادی جهان در گذر است
بهتـر آن است که من خاطر خود خـوش دارم

بەڵێنێکم بە گیانان داوە تا گیان و دڵم لایە
دڵ و گیانم لە پێناوی هەوادارانی ئەودایە
بە مۆمی ڕوومەتی جوانی خەتا، ڕۆشن دەبێ خاتر
بە شۆخانی ختەن ڕووناکە دڵ، چاوم بە سۆمایە
دەبێ ترسم لە بەدوێژی چەپەڵ چی بێ لە هەر کۆڕێ
بە مەیلی خۆ کە وەختێ دڵ لە خەڵوەی لەیل تەنیایە
دەلالم سەروی باخێکە کە سایەی قامەتی بەرزی
نە چەشنی سەروی تەننازە نە شمشاڵی چەمەن وایە
کەمین بگرن دوسەد لەشکر لە شۆخان بۆ دڵم چی نین
بتێکی خواشوکور لەشکرشکێنم چون لەگەڵدایە!
دەشێ لافی سولەیمانی بە مۆری لێوی ئەو لێدەم
من ئیسمی ئەعزەمم پێ بێ لە دێوانم چ پەروایە
دەخیل ئەی شێخی فەرزانە مەڵێ عەیبم لە مەیخانە
کە تەرکی جامی پێوانە لە دەس پەیمانشکێن نایە
زەمانێ پاسەوان! تۆ بی‌وخودا ئەوشۆ لە یەک نێ چاو
نهێنی چون لەگەڵ خونچەی دەمی سەد دەفتەرم لایە
لە باخی وەسڵی دڵبەردا شوکور ئەوڕۆ خەرامانم
پەڕی نەسرین و ڕۆز و بۆی بەهارم پێ پەڕی کایە
بە ڕەندی نێوی «حافز» با بەرن لا هاوەڵان، ئەمما
کە لوتفی دڵبەرم لا بێ غەمی عالەم هەموو بایە
نە لەیلا چەشنی تۆ زولفی لە سەر شانی سەراوێزە
نە مەجنون وەک «عومەر» شێتی کەمەندی زولفی لەیلایە

مرا عهدی‌ست با جانان که تا جان در بدن دارم
هواداران کویش را چو جان خویشتن دارم

صفای خلوت خاطر از آن شمع چگل جویم
فروغ چشم و نور دل از آن ماه ختن دارم

به کام و آرزوی دل چو دارم خلوتی حاصل
چه فکر از خبث بدگویان میان انجمن دارم

مرا در خانه سروی هست کاندر سایه‌ی قدّش
فراغ از سرو بستانی و شمشاد چمن دارم

گرم صد لشکر از خوبان به قصد دل کمین سازند
بِحَمدِالله وَ اَلْمنة بتی لشکرشکن دارم

سزد کز خاتم لعلش زنم لاف سلیمانی
چو اسم اعظمم باشد چه باک از اهرمن دارم

الا ای پیر فرزانه مکن عیبم ز میخانه
که من در ترک پیمانه دلی پیمان‌شکن دارم

خدا را ای رقیب امشب زمانی دیده بر هم نه
که من با لعل خاموشش نهانی صد سخن دارم

چو در گلزار اقبالش خرامانم بحمدالله
نه میل لاله و نسرین نه برگ نسترن دارم

به رندی شهره شد حافظ میان همدمان لیکن
چه غم دارم که در عالم قوام‌الدین حسن دارم

چ کەسم من کە لە گوڵزاری خەیاڵت گوزەرم
لوتفی تۆم یاوەرە ئەی فیکری سەرت تاجی سەرم
کێ وتی گیانە بڵێ یادی غولامێک بکەی
لە رەقیبان بە یەقین سەختە کە ئەم فەیزە بەرم
دوورە چون مەنزڵی ئازیز و لە رێ نابەڵەدم
مەدەدێ ئەی مەلی قودسی بگە پێم نۆسەفەرم!
راگەیێنن کە غولامی ئەوم ئەی پەیکی سەحەر
تا خەلاتێکی بەرێ کا گوڵی شەوبۆی سەحەرم
خۆزگە بەو رۆژە لە ئەم مەرحەلەشا کۆچ دەکەم
هاوەڵان دێن و لە کۆی ئێوە دەپرسن خەبەرم
«حافز»!! حەقمە کە زەریا لە دییەم بێنمە دی
گەوهەری یار لە ئەو بەحرە بە دەس بێ مەگەرم
دەسەلاتی غەزەڵم گرتی کورەی خاک، بڵێن
بووکی زەریاش بدا باج بە سێحری هونەرم
شەکری سەر لێوتی «کۆلیل» مژیون لەوەتا
شیعری شیرین دەچۆڕێ لە دەمی نەیشەکەرم

من که باشم که بر آن خاطر عاطر گذرم
لطف‌ها می‌کنی ای خاک درت تاج سرم
دلبرا بنده‌نوازیت که آموخت بگو
که من این ظن به رقیبان تو هرگز نبرم
همتم بدرقه‌ی راه کن ای طایر قدس
که دراز است ره مقصد و من نوسفرم
ای نسیم سحری بندگی من برسان
که فراموش مکن وقت دعای سحرم
خرّم آن روز کز این مرحله بربندم بار
وز سر کوی تو پرسند رفیقان خبرم
حافظا شاید اگر در طلب گوهر وصل
دیده دریا کنم از اشک و در او غوطه‌خورم
پایه‌ی نظم بلند است و جهان‌گیر بگو
تا کند پادشه بحر دهان پرگهرم

جەوزا سەحەر حەمایەلّی دانا بەرابەرم
یانی لە ئەرکی شام و غولامی قەسەم خۆرم
مەیگێڕ زووبە زوو مەدەدێ! بەختە چارەساز
چم ویستبوو لە لوتفی خودا هاتە بەر دەرم
دووبارە تێکە بادە! لە خۆشی جەمالّی یار
بەم پیرییەش خەیالّی جووانی دەکا سەرم
کەم بیکە وەسفی ئاوی ژیانم لە لا! کە من
شەیدای جامی شام و ئەویندارى کەوسەرم
قوربان ئەگەر بە عیلم و هونەر سەر بدەم لە عەرش
هێما غولامی تۆم و لە هەر شوێنی رێبەرم
من بادەنۆشی بەزمی چەنین سالّتم کەی ئەم
کانیاوە تەرک ئەبێ بە خدە و هەستی دلّ گەرم
گەر باوەڕت نەبوو بە قەسیدەی منی غولام
ئەم شیعرە هی کەمالّە لە تاریفی سەروەرم
(گەر عەشقی تۆم نەبێت و ئەگەر دلّ بە تۆ نەدەم
عەشقت بە کام کەس بدەم و دلّ بە کوێ بەرم)
(مەنسوور)ی کوڕ(موزەففەر)ی (غازی)مە چاوەزار
دژمن‌شکێنە ناوی ئەوم، وا موزەففەرم
رۆژی ئەزەل ئەوینی ئەوانم بەلّێن بوو
هەر بەو بەلّێن و عەهدە لە ئەم ژینگە دەگوزەرم
هۆنی فەلەک کە ملوەنی پەروین بە ناوی شا
من چم لە چەرخ کەمترە، سەرتر کە هۆنەرم
من بازی چەشتی دەستی بەپیتی جەنابی تۆم
کەنگێ بە فیکری سەیدی قەل و قاژ و کەوتەرم
ئەی ئەو کەسەی کە شێرت شکارە مەگەر دەبێ
هێور نەبێ لە خاکی ئەتۆ تەبعی مەحشەرم

جوزا سحر نهاد حمایل برابرم
یعنی غلام شاهم و سوگند می‌خورم
ساقی بیا که از مدد بخت کارساز
کامی که خواستم ز خدا شد میسرم
جامی بده که باز به شادی روی شاه
پیرانه سر هوای جوانی‌ست در سرم
راهم مزن به وصف زلال خضر که من
از جام شاه جرعه‌کش حوض کوثرم
شاها اگر به عرش رسانم سریر فضل
مملوك این جنابم و مسکین این درم
من جرعه‌نوش بزم تو بودم هزار سال
کی ترك آبخورد کند طبع خوگرم
ور باورت نمی‌کند از بنده این حدیث
از گفته‌ی کمال دلیلی بیاورم
گر برکنم دل از تو و بردارم از تو مهر
آن مهر بر که افکنم آن دل کجا برم
منصور بن مظفر غازی‌ست حرز من
وز این خجسته نام بر اعدا مظفرم
عهد الست من همه با عشق شاه بود
و از شاهراه عمر بدین عهد بگذرم
گردون چو کرد نظم ثریا به نام شاه
من نظم دُر چرا نکنم از که کمترم
شاهین‌صفت چو طعمه چشیدم ز دست شاه
کی باشد التفات به صید کبوترم
ای شاه شیرگیر چه کم گردد ار شود
در سایه‌ی تو ملك فراغت میسرم

گرتم هـەزار مەملـەکەتی دڵ بە وەسفی تـۆ
ئێـژی کـە شێـری ئێـوەیە شیعـری دڵاوەرم
وەك سـروە تـا دەچـم بە گوڵستانی حەزرەتت
نە عەشقـی سـەوڵ لامە نە شـەوقی سنـەوبەرم
دەمبیست بۆنـی وەرزی بەهـار و بـە یـادی تۆ
دایـان ساقیـانی چـەمـەن یەك دو سـاغـەرم
کەنگێ بە ئاوی چەن قلـە هەنگـوور مەس دەبم
من حـەو دەساڵـە پیـری خەرابـات پەروەرم
لێـم ناگـەڕێ هەسێـرەیی بەختـی رەشم دەمێ
ئیقبـاڵی عەدڵـی ئێـوە مەگـەر بێ بـە یـاوەرم
خوایـا سپـاسی تۆ کە هەمیسـان لە کۆشکی یـار
سـەرداری عـەرش بیستی شکۆی دەنگی شاپەڕم
نێـوم خـودا لە دەفتـەری یـاران نەکـا رەقـەم!
عەشقـێ بە غەیری عەشق و غەمت بێ لە سەر گەرم
بێچـووی شێـر کردی تەمـاحی شکـاری دڵ
من هەرچـی هەم نەچیـری پەلامـاری حەیـدەرم
ئەی ئەو کەسـەی لە زەڕڕەت ئەوینـدار زیاتـرن!
چۆن من دەگەم بە ئێـوە لە زەڕڕەش کە کەمتـەرم
کێ مونکیـری جەمـاڵی گوڵن؟ دەس‌نیشـانی کە
تا کوێـر کا گـلاری، نووکی شیعـری نەشتـەرم
تیشکی هەتـاوی سەڵتەنەتت کەوتە سەر، کە سـەر
ئێستـا کە بێ‌نیـازە، لـە خورشیـدی خـاوەرم
قەستـم لە ئـەم موعـامـەلە بـازاڕ تیـژییـە
ئەینـا نە نـازسێـن و نە جـادووی قەشمـەرم
«کۆلیـل»ـی کیـژەکوردی وڵات و شنـەی قژی
بەخشـانی خۆرنیشـانی لەسـەر شانی ئەسمەرم

شعـــرم به یمن مــدح تو صــد ملک دل گشـاد
گویـی که تیـــغ توســت زبـــان سخنـــورم

بر گلشنـــی اگر بگذشتـــم چـو بـاد صبح
نـی عشـق ســرو بـود و نه شـــوق صنـوبرم

بـــوی تـو می‌شنـــیدم و بر یـــاد روی تـو
دادنـد سـاقیـــان طـرب یک دو سـاغـــرم

مستـی به آب یک دو عنب وضـع بنـده نیست
من سالخـــورده‌ی پیـــر خـــرابـــات‌پـــرورم

بـا سیـــر اختـــر فـلکـــم داوری بسی‌ست
انصـــاف شـــاه بـاد در این قصـــه یـــاورم

شکـــر خـــدا که بـــاز در این اوج بارگـــاه
طـــاووس عـــرش می‌شنـــود صیت شهپـــرم

نامــــم ز کـــارخـــانه‌ی عشـــاق محو بـــاد
گر جـــز محبـت تـو بـود شغـــل دیگـرم

شبـلُ الأسَـــد به صیـــد دلـم حملـه کرد و من
گـــر لاغـــرم وگرنـــه شکـــار غضنفـــرم

ای عـــاشقـــان روی تـــو از ذره بیشـــتر
مـن کـی رســـم به وصـل تو کز ذره کمتـرم

بنمـــا به من که منکـــر حســـن رخ تـو کیست
تـــا دیـــده‌اش بـــه گـــزلک غیـــرت بـــرآورم

بـــر من فتـــاد ســـایه‌ی خـورشیـــد سلطنت
و اکنـــون فـــراغت است ز خورشیـــد خـــاورم

مقصـــود از این معـــاملـــه بـــازارتیـــزی است
نـی جلـــوه می‌فروشـــم و نـی عشـــوه می‌خـــرم

بەیـــانی رۆشنی تۆ، من شـــەمی بـەرەو سەحـــەرم
بە زەردەیـێکت ئەشا! گیان ئەچێ چلۆن لە بـەرم
وەها لە نێــو دڵی من داخی زولفی سەرکەشی تۆن
وەنەوشـــەجارە کە مـــردم مـــەزار و خـاکی سـەرم
لە ئاستـــانی جەمـــاڵت وەتـــاکە چـاوی ئومێـــد
کە یەک نەزەر بکـــەی ئەمما قەپـــات بوو نـەزەرم
سپاست ئەی غەمـی دڵ چۆن بکـەم (جَــزاکَ اللّه)
کە رۆژی بێکـەسـی ئەووەڵ کەسی لە دەور و بەرم
ئەمن غولامـــی گلێـــنەم ئەگەرچی قەلبـی رەشــە
لە ســۆزی ئێمــە هــەزاری رەوانە ئەشکـی گـەرم
لە چــاوی هەرکـەســە جۆرێ نیگــار جیلوە دەکا
کەس ئەم کریشمەیە وەک من نەدی لە جیلوەگەرم
لە گـۆڕی «حافـز» ئەگەر یـــار تێــپەڕێ وەک بـا
لە قەبــری تەنگ بە شــەوقی، گوڵێ رووواوە سەرم
جەمـــاڵی یـــار لە جــامی جەمـا بـەدی کە «عومەر»!
دەنـــا حەقت نیـــیە بێـــژی کە عـــاشقــی هونـــەرم

تو همچو صبحی و من شمع خلوت سحرم
تبسمی کن و جان بین که چون همی‌سپرم
چنین که در دل من داغ زلف سرکش توست
بنفشه‌زار شود تربتم چو درگذرم
بر آستان مرادت گشاده‌ام در چشم
که یک نظر فکنی خود فکندی از نظرم
چه شکر گویمت ای خیل غم عَفاکَ‌الله
که روز بی‌کسی آخر نمی‌روی ز سرم
غلام مردم چشمم که با سیاه دلی
هزار قطره ببارد چو درد دل شمرم
به هر نظر بت ما جلوه می‌کند لیکن
کس این کرشمه نبیند که من همی‌نگرم
به خاک حافظ اگر یار بگذرد چون باد
ز شوق در دل آن تنگنا کفن بدرم

بە شمشێری بڕۆ بمکووژە مێرم!
منەتبارم، بکەی دڵ کون بە تیرم
بە قوربانی دەس و مێشی دو چاوت
کە هەر من بۆ مژۆلانی نەچیرم
خەمی گەردون لە پامی خست و نەمدی
مەگەر ساغەر، کەسێ تر دەستگیرم
هەڵێ ئەی خۆری کازیوەی بەیانی!
کە شەوگاری غەمت کردی ئەسیرم
ڕەجاڵی کۆمەکم ساقی! بە جامێ
جووانۆ کەی لەشی لەرزۆك و پیرم
بە زولفی تۆ قەسەم خۆرم، لە مێژە
کە وەك ئەو سەر لە خاکی پات گیرم
لە ئەم خەرقەی ریا گڕ بەردە «حافز»!
کە ناسووتێ بە تەندووری تەویرم
هەتا «کۆلیل»ـی زولفی وەك شەوی تۆم
شەوەق دەڕژێتە ئاسۆی لێوی بیرم

به تیغم گر کشد دستش نگیرم
وگر تیرم زند منت پذیرم
کمان ابرویت را گو بزن تیر
که پیش دست و بازویت بمیرم
غم گیتی گر از پایم درآرد
بجز ساغر که باشد دستگیرم
برآی ای آفتاب صبح امید
که در دست شب هجران اسیرم
به فریادم رس ای پیر خرابات
به یک جرعه جوانم کن که پیرم
به گیسوی تو خوردم دوش سوگند
که من از پای تو سر برنگیرم
بسوز این خرقه‌ی تقوا تو حافظ
که گر آتش شوم در وی نگیرم

بە نازت دڵ مەسوو! ئاوا بە زارم
کە من مردوو بە دوو چاوی خومارم
جەماڵت بەژنی خەرمانی کەماڵە
زەکاتێ مەرحەمەت فەرموو! هەژارم
بە میوەی باخ و شەکر و شیر تا کەی
منالآنەم دەکەی زاهید لە کارم
هەواری دڵ هەموو پڕ بوو لە دڵبەر
لە بیرم چوو کە خۆشم بێهەوارم
بە سەر پیرم ئەگەرچی دڵ جووانم
پڕی کەن جام چون مەیگێڕە یارم
بەڵێنم‌دا بە کۆڕی مەی‌فرۆشان
کە رۆژی غەم لەگەڵ مەی بێ، قەرارم
نەنووسێ نووسەری گەردون لە چارەم
مەگەر مەی، موتریب و بەژنی نیگارم
لە ئەم ئاژاوە هەرچەن کەس لە کەس نین
لە کن پیری موغان خزمەتگوزارم
خۆش ئەو ساتەی دەکا سامانی مەستی
بە سەر شاه و وەزیرا، شاریارم
من ئەو تەیرەم لەسەر عەرشا دەبیسن
شەقەی شاباڵی هەر لەیل و نەهارم
وەکوو «حافز» لە سینەم گەنجی یارە
لە چاوی دژمنا چووك و نەدارم
کە من «کۆلیل»ی ئێوەم سەربڵێندم
بە پەستم هەر بزانێ با نەیارم

مزن بر دل ز نوک غمزه تیرم
که پیش چشم بیمارت بمیرم
نصاب حسن در حد کمال است
زکاتم ده که مسکین و فقیرم
چو طفلان تا کی ای زاهد فریبی
به سیب بوستان و شهد و شیرم
چنان پر شد فضای سینه از دوست
که فکر خویش گم شد از ضمیرم
قدح پر کن که من در دولت عشق
جوان‌بخت جهانم گرچه پیرم
قراری بسته‌ام با می‌فروشان
که روز غم بجز ساغر نگیرم
مبادا جز حساب مطرب و می
اگر نقشی کشد کلک دبیرم
در این غوغا که کس کس را نپرسد
من از پیر مغان منت پذیرم
خوشا آن دم کز استغنای مستی
فراغت باشد از شاه و وزیرم
من آن مرغم که هر شام و سحرگاه
ز بام عرش می‌آید صفیرم
چو حافظ گنج او در سینه دارم
اگرچه مدعی بیند حقیرم

که نوێژی شـەو له غەریبی دەکەم بە شیـن و گرین
له شـــەرح و باســی غەریبـانەمایه سینـگی بریــــن
بە یــادی زێــد و ئەویــن شیـوەنێ بە زار دەکـەم
سـەفەر کە رەسمی نەمێـنێ له سەرزەمینی بەریـن
من ئەهلـی خاکـی دلاّرم نه خەڵکـی شاری نەیـار
خـــودایە بمبـــەوە بۆکـــۆڕی دۆستـــانی بەریـن
لەبەر خـــودا کەرەمـێ ئەی رەفیــقی رێگــە! هەتا
له دەرکی مەیکەدە هەڵدەم بەیاخی دەوری وەرین
عەقـڵ بە پیـــری نەناسیـوم ئەرێ! کە دیتمی بــاز
ئەسیــری نــازی منالێکـە دڵ، لە خێـڵــی پەریـن
مەگــەر شەمــاڵ و سەبــا، هیچــکەس نەمیــناسی
بە غەیری بام نەبوو چون کەسێ لە ژووری سەریـن
سەبـــا دەخیـــله نەسیمـێ لە خـــاکی شیـــرازم
کە عەتـــری مەنـــزڵی ئازیـزمانە گیـانی قەریـن
زڕانی رازی غەمی دڵ ســرشکــی سوور لە دوور
لە کێ شکـات بکـــەم، من دییــەم لە فیتنەگەریـن
لە چەنگی زوهــره شنەفتم سەحــەر کە دەیفەرموو
غولاّمی «حافــز»ی زاراوەخـــۆشی خۆش‌هـونەرین
بە غەیری ســـروە نەبێ مەحـــرەمێ نەبوو «کۆلیـــل»
لە بەژنی شـــەمســـە کە دێـــوانـەوێنە سوژدە بەرین

نمـــاز شـــام غریبـــان چو گریه آغـــازم
بـه مویـه‌هـــای غریبـــانه قصـــه پـــردازم
به یـــاد یـــار و دیـــار آن‌چنـــان بگریم زار
که از جهـــان ره و رســـم سفـــر براندازم
من از دیـــار حبیـــبم نـه از بـلاد غـــریب
مهیمنـــا بـه رفیـــقان خـود رســـان بـــازم
خـــدای را مـــددی ای رفیـــق ره تـا من
به کـــوی میکـــده دیگر علـــم برافـــرازم
خـــرد ز پیـــری من کی حســـاب برگیـرد
که بـاز بـا صنمـــی طفـــل عشـــق می‌بـــازم
بجـــز صبـــا و شمـــالم نمی‌شنـــاسد کس
عزیـــز من که بجـــز بـــاد نیست دمســـازم
هـــوای منـــزل یـــار آب زنـــدگانی ماست
صبـــا بیـــار نسیمـــی ز خـــاک شیـــرازم
سرشکـــم آمد و عیبـــم بگفت روی به روی
شکـــایت از که کنـــم خانگی‌ست غمـــازم
ز چنگ زهـره شنیدم که صبحدم می گفت
غـــلام حـــافظ خوش لهجه‌ی خوش آوازم

دەستـــم بگـــەیێ گەر بە خـەمـــی زولفی شەواسات
چون گۆ ئەگەرم سەد ســەرە بـۆی دێنمە ژێر پـــات
پرچت ئەمـــەلی عومــری درێـــژی منـــە ئەمما
لەو عومـــرە درێـــژەم نیـیە یەک تاڵی مولاقـــات
ئیـــزنم بدە ئەی شـەم! دەمـەوێ چەشنی شەم ئەوشۆ
لای ئێـــوە بسـووتێ دڵ و چـــاوم گوڵی پێبـــات
نوێـــژم بکـــەن ئەو کـــۆرە کە مەستن بە شـەرابت
ئەو لەحزە کە وەک جام بە یەک زەردە ئەجەل هـات
بەو هۆیـــە لە مەیخـــانە گـــڕ و ســۆزی هەمیشـــەم
نوێـــژی منـــی ناپـــاک نەبوو لایـــەقی سەوقـــات
ئەبـــرۆت لە نێـــو جـــامی خەیـــاڵ و ســـەری زانـام
میحـــرابە لە مزگـــەوت و کەمانـــم لە خەرابـات
سەربـــەرز لەســـەر تۆپی جەهـــان چەشنی بەیـــانم
ڕۆشـــن کە بکـــەم تاقـەشەوێ خەڵوە بە گۆنـــات
وەختـــێ کە بە ســـەر مومکیـــنە ســـەودای ئـەوینت
چون گیـــانی هەیـــاسی منـی مەحموودە لە ڕێگـــات
لەم دەورە لە کن کێ غەمی خۆ «خاجە»! بەیـــان کەم
مەحـــرەم نییە خۆ غەیری سوراحی بەســـەرم کـــات
«کۆلیـــل»ـی پـەژارەی خـولـــی دونیـــای خـــراوم
دەستـــی من و داوێنـــی بەزەی لێـوی شەکەرخـــات

گر دست رسد در سر زلفین تو بازم
چون گوی چه سرها که به چوگان تو بازم

زلف تو مرا عمر دراز است ولی نیست
در دست سر مویی از آن عمر درازم

پروانه‌ی راحت بده ای شمع که امشب
از آتش دل پیش تو چون شمع گدازم

آن دم که به یک خنده دهم جان چو صراحی
مستان تو خواهم که گزارند نمازم

چون نیست نماز من آلوده نمازی
در میکده زان کم نشود سوز و گدازم

در مسجد و میخانه خیالت اگر آید
محراب و کمانچه ز دو ابروی تو سازم

گر خلوت ما را شبی از رخ بفروزی
چون صبح بر آفاق جهان سر بفرازم

محمود بود عاقبت کار در این راه
گر سر برود در سر سودای ایازم

حافظ غم دل با که بگویم که در این دور
جز جام نشاید که بود محرم رازم

به خەرابـــات ئەگەر ئەمجـاره دەسـی دا گــوزەرێ
بەرهــــەمی خەرقــە و بەرمـــاڵ له دەس دێنــه دەرێ

ئەگـــەر ئەورۆ وەکـو زاهیـــد له دەری تۆبــه بدەم
خازینــــی مەیکـــەده ناکــــاتەوە لێـــم تــــازه دەرێ

شەو له دەوری شەمی کوڵمت دەگەڕم تا به سەحەر
چەشنی پەروانه بـدا دەس ئەگەرم بــاڵ و پــەڕێ

تاکـــو نەخشــاوە جەمـــاڵت له خەیالا، من ئەگـەر
دەس له مل حوور و پەری بم نییه هۆشـم له سـەرێ

غەمـــی عەشقت لـه دڵ و سیــنەمه شـــاراوە بەلام
چـاوی داوێن‌تەڕە جاسووس له کۆی هەر خەبەرێ

چەشنی چەنگم له بەغـەڵ ناکـەی ئەر ئارام دەرون
لانیــکەم لێو بنه لێـوم وەکو نەی لێمــده سـەرێ!

که هــەوایی وەکــو تەیرم له قەفەس‌خانەیی خـاك
بەو هــەوایـــەم که بکـا چـاوی شەهێـنت نەزەرێ

داخ و دەردی دڵی خوێنین نەڵێم چـاکه به کـەس
چونکــه هەر تێغی غەمت یـارمه بۆ هەر کەســەرێ

«حافــز» ئەر هـەر ســەرە موویێکی هەزارانی سەرە
خاکساری قــژی بەر پێــته هەموو وەك هــونەرێ

مەمــی «کۆلیــل»ـی ئەوینـم، گەلی شۆفـار له دوو
داخەکـەم کەس نیــیه هــاواری مه بۆ زیـن بەرێ

در خرابـات مغـان گر گـذر افتـد بـازم
حاصـل خرقـه و سجـاده روان دربـازم
حلقـه‌ی توبه گر امروز چو زهّـاد زنـم
خـازن میـکده فـردا نکنـد در بـازم
ور چـو پروانـه دهـد دست فـراغ بالـی
جـز بدان عـارض شمعی نبود پـروازم
صحبت حـور نخـواهم که بود عیـن قصـور
بـا خیـال تـو اگـر بـا دگـری پـردازم
سـر سـودای تو در سینه بمـاندی پنهـان
چشـم تردامن اگر فـاش نگـردی رازم
مرغ‌سـان از قفـس خـاک هوایـی گشتـم
به هـوایی که مگر صیـد کنـد شهبـازم
همچو چنگ ار به کنـاری ندهی کـام دلـم
از لب خـویش چو نی یک نفسـی بنـوازم
ماجـرای دل خـون‌گشته نگویـم با کس
زآن‌که جز تیـغ غمت نیست کسی دمسـازم
گر به هـر مـوی سـری بر تن حافظ باشد
همچـو زلفت همـه را در قـدمت انـدازم

بــدە مزگێنــیی وەسڵــت کە بــدەم گیــان و ســەرم
داوی دونیــا دەپسێــنم مەلــی عــەرشــی هونــەرم
ســەرەکی عــالــەمی بوونــم لە سەرا نین بە سەرت!
بە غــولامــێ لە غــولامــانی دەرم کــەی ئەگــەرم
خوایــە ئــاوێك لە هــەوری کەرەمت بەر لـە ئـەوەی
چەشنــی یەك زررە بە دەم بــاوە لە خۆ دەربــەدەرم
بە مــەزارم وەرە رابــوورە لەگــەڵ موتریب و مــەی
تا لە ئەڵحــەد وەدەرێ لــەش بە دنەی بۆنــی گــەرم
هەستــە بنوێنــە بەژن ئەی گوڵــی شیــرین بەر و بۆ
چەپڵەرێــژان کە لە گیــان هەستم و دەرچم لە سەرم
منی پیــرت لە بەغــەڵ بگرە گوڵــم تەنگ، شــەوێ
تــا جــووانی بەســەرم کــاتەوە کــاتی سەحــەرم
نەفــەسێ روخســەتی دیــدارم ئەوێ رۆژی مەرگ
تا وەکوو «خاجە» لە گیان دەرچم و خۆش بێ سەفەرم
گیــان لە مەیــدانی هــەوا تا وەکو چەنگێ لە بەغەڵ
ماتڵــی زەربــەتە «کۆلیــل»ی بە ئیخلاس و شــەرم

مژده‌ی وصل تو کو کز سر جان برخیزم
طایر قدسم و از دام جهان برخیزم

به ولای تو که گر بنده‌ی خویشم خوانی
از سر خواجگی کون و مکان برخیزم

یا رب از ابر هدایت برسان بارانی
پیش‌تر زان‌که چو گردی ز میان برخیزم

بر سر تربت من با می و مطرب بنشین
تا به بویت ز لحد رقص‌کنان برخیزم

خیز و بالا بنما ای بت شیرین حرکات
کز سر جان و جهان دست‌فشان برخیزم

گرچه پیرم تو شبی تنگ در آغوشم کش
تا سحرگه ز کنار تو جوان برخیزم

روز مرگم نفسی مهلت دیدار بده
تا چو حافظ ز سر جان و جهان برخیزم

مەگەر گوناحە لە فیکری دیاری خۆما بم
بیم بە خاك و لە دەرکی دلاری خۆما بم
غەمی غەریبی و دووری دەمێ کە هەڵنەگرم
چبوو کە حاکمی خۆم و لە شاری خۆما بم
چ بوو لە خەڵوەتی وەسڵی دڵا کە مەحرەم بم
وە یا لە کۆڕی غولامانی یاری خۆما بم
تەمەن کە عاقیبەتی نادیارە ئەو چاتر
لە کاتی کۆچ لە خزمەت نیگاری خۆما بم
لە دەستی بەختی خەواڵووم و کاری شێواوم
شکایەتێکم ئەگەر بوو لە کاری خۆما بم
بە غەیری رەندی و عەشقم نەدا بە ژین قەولێ
ئەشێ دوبارە لە قەوڵ و قەراری خۆما بم
مەگەر بە لوتفی خودا رێ پەیا بکا «حافز»
دەنا هەمیشە دەبێ گوم لە عاری خۆما بم
خودایە تا بە کەی ئاخر بە چەشنی «کۆلیل»ـت
لە فیکری بەندی ئەوینی نەیاری خۆما بم



چرا نه در پی عزم دیار خود باشم
چرا نه خاک سر کوی یار خود باشم
غم غریبی و غربت چو برنمی‌تابم
به شهر خود روم و شهریار خود باشم
ز محرمان سراپرده‌ی وصال شوم
ز بندگان خداوندگار خود باشم
چو کار عمر نه‌پیداست باری آن اولی
که روز واقعه پیش نگار خود باشم
ز دست بخت گران خواب و کار بی‌سامان
گرم بود گله‌ای رازدار خود باشم
همیشه پیشه‌ی من عاشقی و رندی بود
دگر بکوشم و مشغول کار خود باشم
بود که لطف ازل رهنمون شود حافظ
وگرنه تا به ابد شرمسار خود باشم

من هۆشیــاری کولمی گــەش و زولفی دلکــەشم
بێهــۆشی چــاوی مەست و شــەرابێــکی بێ‌غەشــم
فەرمــووتە عەهــدی رۆژی ئەلەستــی بلێــم کە چین
نــابێ مەگــەر زەمــانێ ئەکا بــادە ســەرخۆشــم
من خەلکــی کــۆی بەهەشتــی بەرینــم ئەمێستــە وا
لەم خــاکە گیــری عەشقی کەنیشکــانی مەهوەشــم
ناچــار ئەبێ لە بەنــدی ئەویــن هەلبکــەم بە سۆز
ترسی گرم وەبــەر مەخــە من چەشنی شــەم گەشــم
شیــرازە کانی گەوهــەری لێو، کەوشــەنی جەماڵ
مـن لەعــل‌نــاس چونکــە هــەژارم خــورا بەشــم
چــاوی مەســم ئەوەنــدە لە ئــەم شــارە دیــوە من
بێ مــەی خومــار و مەستــی کریشمەی دییەی رەشــم
شارێکە پڕ لە نــازی جووانــان لە شــەش تــەرەف
نیمــن شتێ ئەگــەر نــە تەرەفــداری هەر شەشــم
گەر یــار بێت بەخت و بــەرەو یــار بێمــەوە
زولفی پەریمە چەتری سەر و گەسـکی جێگەشــم
خۆش بووکی زەوقی«خاجە» حەزی جیلوە گەری بوو
جــامێ نەبــوو بە داخــەوە بۆ زەوقــی دلکەشــم
جــامــی جەهــان‌نوێنمــە «کۆلیــل»! کولمــی یــار
بەو مەرجــە رووی نەبێ لە پــەرازیتــی قــەرقەشــم

من دوستدار روی خوش و موی دلکشم
مدهوش چشم مست و می صاف بی‌غشم
گفتی ز سرّ عهد ازل یک سخن بگو
آن گه بگویمت که دو پیمانه درکشم
من آدم بهشتیم اما در این سفر
حالی اسیر عشق جوانان مهوشم
در عاشقی گزیر نباشد ز ساز و سوز
استاده‌ام چو شمع مترسان ز آتشم
شیراز معدن لب لعل است و کان حسن
من جوهریّ مفلسم ایرا مشوشم
از بس که چشم مست در این شهر دیده‌ام
حقا که می نمی‌خورم اکنون و سرخوشم
شهری‌ست پر کرشمه حوران ز شش جهت
چیزیم نیست ورنه خریدار هر ششم
بخت ار مدد دهد که کشم رخت سوی دوست
گیسوی حور گرد فشاند ز مفرشم
حافظ عروس طبع مرا جلوه آرزوست
آیینه‌ای ندارم از آن آه می کشم

گوزەر دەکا کە خەیاڵت لە لالەزاری دییەم
لەبەر نەزارە دڵم دێتە نێو تەلاری دییەم
نەبوو شیاوی خەیاڵت کە مەنزڵێ لە جەهان
بە دڵ لەبەر ئەمە هێنامە تۆی گلاری دییەم
وەرن کە گەوهەر و دوڕ بۆ خەلاتی بەر پێتان
لە کونجی سینە دەکێشم بەرەو هەواری دییەم
سەحەر بە عەزمی خراپێ رەوان بو ئەسرینم
شوکور کە خوێنی جیگەر گرتی پابناری دییەم
کە دیتی رۆژی هەوەڵ رووت دڵ بە حەق دەیگوت
بە من بگا خەتەرێ خوێن لە مل تەواری دییەم
بە بۆنی موژدەیی وەسڵت هەتا سەحەر دوێشەو
گڕا لە رێگەیی بادا شەمی دیاری دییەم
دەروونی «حافز»ی پڕ ئێش بەشقی دڵسۆزی!
مەبێژە دی بە مژۆڵان و تیرباری دییەم
بە خاتری دڵی «کۆلیل» و یادگاری دییەت
بنێژە دوو گوڵی نێرگز لە سەر مەزاری دییەم

خیال روی تو چون بگذرد به گلشن چشم
دل از پی نظر آید به سوی روزن چشم
سزای تکیه‌گهت منظری نمی‌بینم
منم ز عالم و این گوشه معین چشم
بیا که لعل و گهر در نثار مقدم تو
ز گنج خانه دل می‌کشم به روزن چشم
سحر سرشک روانم سر خرابی داشت
گرم نه خون جگر می‌گرفت دامن چشم
نخست روز که دیدم رخ تو دل می‌گفت
اگر رسد خللی خون من به گردن چشم
به بوی مژده‌ی وصل تو تا سحر شب دوش
به راه باد نهادم چراغ روشن چشم
به مردمی که دل دردمند حافظ را
مزن به ناوک دلدوز مردم‌افکن چشم

گڕمی وەک کووپـەیی مەی داوە دڵی پڕجۆشـم
مۆرە لێـوانم و خوێنـین جیگـەر و خـامۆشـم
تەمەعی لێـوی نیگـاران بە مەسـەل خۆکوژییە
سەیری من کـەن کە بە ئەم کارە چەنێ دڵخۆشـم!
من لە غـەم چۆن دەبـم ئـازا کە هەموو لەحزە بتێ
حەڵقە لە گوێم دەکا زولفی رەشـی خۆش‌خۆشـم
لەوە حـاشـا! کە نەبێ بـاوەڕی فەرمـانی خودام
هەر ئەوەنـدەی هەیە ژەم‌ژەم کەمەکێ مەی‌نۆشـم
رۆژی مەحشـەر هەمە هیـوا کە بە دیقـی دژمن
بە کـراسـی کەرەمـی گیـانی خەتـا داپۆشـم
باخـی فیـردەوسی بە دوو دەنکـە گەنم دا بـابـم
چۆن بە جۆیێکی ئەمن باخـی جەهـان نەفرۆشـم؟!
خەرقـەپۆشی نە نیشـانەی سـەری دینـداریمە
بەڵکوو ئەم پەردە لە سەد عەیبمە یەک سەرپۆشـم
پیـری مەیـخانەش ئەمـەی فەرمـووە گەر بیبیسم
وەک لە خـۆم عەهـدە دەبێ ساف نەبێ نەینۆشـم
سـاز ئەگەر سـاز بە ئەم شێـوە بکا موتریبی کـۆڕ
شیعـری «حافز» دڵ و گیان قەبزە دەکات و هۆشـم
تـاری ئێمەش لەسەر ئاهەنگی دڵم کۆکە و ئەڵـێ
عاشقـی زولفت و «کۆلیـل»ـی خەمـی ئەبرۆشـم

من که از آتش دل چون خم می در جوشم
مهر بر لب زده خون می‌خورم و خاموشم
قصد جان است طمع در لب جانان کردن
تو مرا بین که در این کار به جان می کوشم
من کی آزاد شوم از غم دل چون هر دم
هندوی زلف بتی حلقه کند در گوشم
حاشَ لله که نیم معتقد طاعت خویش
این‌قدر هست که گه‌گه قدحی می نوشم
هست امیدم که علیرغم عدو روز جزا
فیض عفوش ننهد بار گنه بر دوشم
پدرم روضه‌ی رضوان به دو گندم بفروخت
من چرا ملك جهان را به جوی نفروشم
خرقه‌پوشی من از غایت دینداری نیست
پرده‌ای بر سر صد عیب نهان می‌پوشم
من که خواهم که ننوشم بجز از راوق خم
چه کنم گر سخن پیر مغان ننیوشم
گر از این دست زند مطرب مجلس ره عشق
شعر حافظ ببرد وقت سماع از هوشم

چۆن بە تانە و تەشەری خێڵی نەیاران پەکەرم
من کە بێباکی و مەستیم هونەرە و تاجی سەرم
سەرفی بۆ تازە قەڵەندەر هەیە پارێزی ریا
منی رسوا لە جەهان چیمە لە سەرف و زەرەرم
بۆیە سوڵتانی پەشێوی گەلی بێسامانم
چونکە عەشقم لەسەرایە و لە عەقڵ بێخەبەرم
با بزانن کە بە قوربانی ئەتۆی بێدینم
لە تەوێڵت بدە خاڵێك لە خوێنی جیگەرم
بە دڵی سافەوە تۆخوا وەرە بۆ لام هەتا
نەبووە رۆشن کە لە ژێر ئەم جبە چەن بێهونەرم
شیعری خوێنینی من ئەی با! بەرە بۆ ئەو کەسە وا
بە مژۆڵی رەشی کون کردووە گیانی کەسەرم
بادەنۆشم من ئەگەر یا نە، دڵازار کە نیم
«حافز»ی رازی دڵ و کاتشناسی سەحەرم
منی «کۆلیل» فەقەت چاو لە دەسی مەیگێڕم
مەحرەمێکی وەك ئەوم چونکە نەدی خوێن گەرم

گر من از ســـرزنش مدعیـــان اندیشـــم
شیـــوه‌ی مستـی و رنـدی نرود از پیشـــم
زهــد رنــدان نوآموخته راهی بدهی‌ست
من که بدنـام جهـانم چه صلاح اندیشـــم
شـاه شوریده‌سـران خوان من بی‌سامـان را
زآن‌که در کم‌خردی از همه عالم بیشـــم
بر جبـین نقش کن از خون دل من خـالی
تا بداننـــد که قربـــان تو کـــافرکیشـــم
اعتـــقادی بنمـــا و بگـــذر بهـر خــدا
تا در این خرقـه ندانی که چه نادرویشـــم
شعر خون‌بار من ای بـــاد بدان یـار رسان
که ز مژگان سیـه بر رگ جـان زد نیشـــم
من اگر بـــاده‌خورم ورنه چه‌کارم با کس
حافظ راز خود و عــارف وقت خویشـــم

دەبێ بە چـاوبەسـی گیـانم تـەم و مژی بەدەنـم
خۆش ئەو دەمـەی کە نەمێنێ غوبار و تۆزی تەنـم

شیـاوی من مەلی خۆش‌خوێن نەبوو وەها قەفەسـێ
کە چەشتی گەشتی بەهەشت و زەماوەنی چەمەنـم

لەبـەر چ هـاتم و لە کوێم؟ نـەزان و بێ‌خـەبـەرم
گەلێ بە داخـەوە غافـڵ لە خـۆم و هـەم وەتەنـم

چلـۆن لە عـالەمی پـاکی بە باڵـی دڵ بفـڕم
هەتـا لە مەڵبـەنی خـاکی قەتیس و تەختەبەنـم

ئەگـەر لە خوێنی دڵـم دێ نەسیمی شـەوق ئازیـزا!
عەجەب مەمێـنە کە هەمخوێنی مامزی خوتەنـم

لیـباسی نەخشـە لە زێڕم مەبیـنە گەش وەکو شـەم
کە زۆرە سـۆزی نهێـنی لـە ژێـر کراسـی تەنـم

لە «حافـز»ت وەرە وەربگـرە هەستـی من منمـی
کە وس ببـێ لە حوزوورت زمـانی چۆن و چەنـم

ئەمن لە خزمـەتی یـارا لەخۆ نەچـوومـە دەرێ
کە وا زەلیـلم و «کۆلیـل» لەش مـەزار و گەنـم

حجاب چهره‌ی جان می‌شود غبار تنم
خوشا دمی که از آن چهره پرده برفکنم
چنین قفس نه‌سزای چو من خوش‌الحانی‌ست
روم به گلشن رضوان که مرغ آن چمنم
عیان نشد که چرا آمدم کجا رفتم
دریغ و درد که غافل ز کار خویشتنم
چگونه طوف کنم در فضای عالم قدس
که در سراچه‌ی ترکیب تخته‌بند تنم
اگر ز خون دلم بوی شوق می‌آید
عجب مدار که همدرد نافه‌ی ختنم
طراز پیرهن زرکشم مبین چون شمع
که سوزهاست نهانی درون پیرهنم
بیا و هستی حافظ ز پیش او بردار
که با وجود تو کس نشنود ز من که منم

چـل ســاڵ و ئەنـدی تەختە دەڵێم من لە کەمترین
دەروێشەکانی پیــری موغــانم لە کـۆی ئەویــن
خــاڵی نەبوو قەتـم لە هەتــاوی شــەراب جــام
چون لوتفـی پیــری بــادەفرۆشـم لەگەڵ دەژیــن
هێــنامیــانە ژوور و سـەکــۆی بەرزی مەیــکەدە
سوڵتــانی عەشـق و دەوڵــەتی رەندانی پاکبیــن
خاوێنــە دامــەن ئەرچـی کراســم مەیــاوییــە
لـەم تڵتنۆشــە زڵمــە گومــان و پلاری قیــن
شــاهێـنی دەستی شــاهم ئەبێ چۆن بەرم لە بیر
شــەوقی دیــاری یــار و وەتــەن مەڵهەمی بریــن
خۆشدەنگ بولبــولێ وەکـو من حەیفە بۆ قەفەس
وەک سوێسنـەم زمــانی شرین لاڵ و دڵ خەمیــن
شیــــراز ئـاو و خــاکی گــەلێ سپڵــە پــەروەرە
هاورێ لە کوێن کە خێوە لە ئەم شارە هەڵکەنیــن
«حافــز»! کەمی وەشــارە لە تۆی پەردە جامەکەت
تاکـوو نەڵێــم بە خاجـە لە ژێر ئەو عەبــاتە چیــن!
خاجــەی موبــارەکێ کە کەمــەندی سەخــاوەتی
تـەوقــی تـەلای ملــمە هەتــا رۆژی واپــەسیــن
بــازی سپــین تەبعـی «عومــەر» سەختــە گرتنی
مــەر شاخــەوانی تیشکـی بزەت دابنـێ کەمیــن

چل سال بیش رفت که من لاف می‌زنم
کز چاکران پیر مغان کمترین منم
هرگز به یمن عاطفت پیر می فروش
ساغر تهی نشد ز می صاف روشنم
از جاه عشق و دولت رندان پاکباز
پیوسته صدر مصطبه‌ها بود مسکنم
در شأن من به دردکشی ظنّ بد مبر
کآلوده گشت جامه ولی پاکدامنم
شهباز دست پادشهم این چه حالت است
کز یاد برده‌اند هوای نشیمنم
حیف است بلبلی چو من اکنون در این قفس
با این لسان عذب که خامش چو سوسنم
آب و هوای فارس عجب سفله‌پرور است
کو همرهی که خیمه از این خاک برکنم
حافظ به زیر خرقه قدح تا به کی کشی
در بزم خواجه پرده ز کارت برافکنم
تورانشه خجسته که در من یزید فضل
شد منت مواهب او طوق گردنم

عومرێ بەسەرچوو بۆ ئەوین هەردەم مەقامێ تەی دەکەم
ڕێگەی تەمەننا هەر خولەک بۆ ڕێگەفامێ تەی دەکەم
بێ خۆر و مانگی ڕووی ئەوم چون سەخت ئەچێ ڕۆژ و شەوم
جارجارە داوێ دادەنم بێچارە تەیرێ سەیدەکەم
(ئەوڕەنگ)و(گوڵچێرە)ی لەکوێن کوا نەخشی عەشق و کوا بەڵێن
ئێستاکە من نەرد و قومار بۆ چاوی مەستی مەی دەکەم
تاکوو بزانم سەروی ناز چەتری شکۆی لە کوێیە باز
بۆ هەر خەرامانێ لە باخ ناڵینی چەشنی نەی دەکەم
هەرچەن دەزانم کامی دڵ نادات پێم ئارامی دڵ
ڕەسمی جەماڵی بۆ خەیاڵ وەک نەخشی مانی هەی دەکەم
پێموایە غەم دەرکا لە دڵ، ڕازی دەرون سەر خا لە دڵ
ئەو ئاخە خوێنینەی کە من هەر سوبح و ئێوارەی دەکەم
وەک «حافز» ئەرچی دوور مام تۆبەم لە مەی کردوون و جام
گاوەختە لا ڕۆحانییان یەک دوو سوراحی پەی دەکەم
«کۆلیل»و مەستی چاوتم شاهێنی بەزمی ڕاوتم
چنگم لە سینگی دڵ کوتا، ها پێشکەشی ئێوەی دەکەم

عمری‌ست تا من در طلب هر روز گامی می‌زنم
دست شفاعت هر زمان در نیک‌نامی می‌زنم
بی‌ماه مهرافروز خود تا بگذرانم روز خود
دامی به راهی می‌نهم مرغی به دامی می‌زنم
اورنگ کو گلچهر کو نقش وفا و مهر کو
حالی من اندر عاشقی داو تمامی می‌زنم
تا بو که یابم آگهی از سایه‌ی سرو سهی
گلبانگ عشق از هر طرف بر خوش‌خرامی می‌زنم
هرچند کان آرام دل دانم نبخشد کام دل
نقش خیالی می‌کشم فال دوامی می‌زنم
دانم سر آرد غصه را رنگین برآرد قصه را
این آه خون افشان که من هر صبح و شامی می‌زنم
با آن‌که از وی غایبم و از می چو حافظ تایبم
در مجلس روحانیان گه‌گاه جامی می‌زنم

بێ شنەی قــامەتی ڕەعنــات لە گوڵــزارم چی
لە قــژی سومبـوڵ و ڕووی سۆسـەنی بۆن‌دارم چی
وەی کە ڕووتــم بە توانجی گەلی شۆفــار نەدی
جــامی ئاســن کە نەبێ ڕووم لە هــاوارم چی
جــامی گەردوونە لە دەستــم کە دەبێ بینۆشـم
چەشنــی تۆ واعیــزی کـەم‌فــام لە ئینکــارم چی
بەرقی غەیبــی لە کەمیــن‌دا کە وەهــا تیژ و تونـە
تــۆ بفەرمـــوو منــی پۆڵـــوو لە پەلامــــارم چی
شـــاهی تووران دڵی بێژەنــمی لە چا خستووە گەر
لوتفی ڕۆســـەم لەگـــەڵم بێت لـە ئەغیـارم چی
پێکـــەنێ بۆم کە هەتا ئـاوری کۆی توور لە دوور
رون دەبێ وادیی ئەیمـــەن لە شـــەوی تـارم چی
مـــاڵە بـــابی منـــە «حافـــز»! کە بەهەشتی شایی
لـەم ســـەرا کاولـــە مەڵبـــەندی عـەزادارم چی
خەمی زولفت کە کەمەندی ملی«کۆلیل»ـە ئـەدی
لە وزەی تیــــری مـــژۆڵ و غەمـــی تیمـــارم چی

بی تو ای سرو روان با گل و گلشن چه کنـــم

زلف سنبل چه کشم عارض سوسن چه کنـــم

آه کــز طعنـــه‌ی بـدخـــواه نـدیـــدم رویت

نیست چـــون آینـــه‌ام روی ز آهـن چه کنـــم

بـــرو ای ناصـح و بر دردکشـــان خـــرده مگیـر

کـــارفرمای قـــدر می‌کند این من چه کنـــم

برق غیـرت چو چنین می‌جهـد از مکمن غیب

تو بفـــرما که من سوختـــه خرمـن چه کنـــم

شـــاه ترکان چو پسندید و به چـــاهـم انداخت

دستگیـــر ار نشـود لطـف تهمتـن چه کنـــم

مـــددی گـر به چـــراغی نکنـد آتش طـــور

چـــاره‌ی تیـــره شب وادی ایمـن چه کنـــم

حافظا خلـــد بریـــن خـــانه‌ی موروث من است

انـــدر این منـــزل ویرانـــه نشیمـن چه کنـــم

من نە ئەو رەندەم کە تەرکی مەی لەگەڵ دڵبەر بکەم
شەرتە ئەم کارەم وەکوو دارۆغە تا مەحشەر بکەم
من کە لۆمەی تۆبەکارانم بە تەرکی مەی دەکرد
تۆبە کاتی گوڵ مەگەر شێتم لە کۆی ساغەر بکەم؟!
عەشقی دڵ مرواری و مەیخانە زەریا، من غەواس
خۆم لە بەحری سوور خست ئاخۆ کە رێگا دەربکەم
مەستە نێرگز، لالە مەیگێڕ و کەچی رسوا منم
لەم هەموو بێدادە یاڕەب روو لە چەن داوەر بکەم
تون مەڕۆ ئەی شارشێوێن شۆخی چاوڕەش! تا بە رووی
زەرد و ئەشکی ئاڵ، رێگەت پڕ لە لەعل و زەڕ بکەم
من کە گەنجی لەعل و یاقوتم لە ئەسرین بێ‌حەدە
چۆن لە چاوی خۆر ئەشێ سواڵی دوڕ و گەوهەر بکەم
نەرمە بارانی لەتیفی سروە وا گوڵزاری شت
روم نەبوو چاوێ لە نەزمی جوانی نێو دەفتەر بکەم
عەهد و پەیمانم لەگەڵ جام و شەرابا بۆیە بەست
چون فەلەك پەیمان و عەهدێکی نەبوو باوەڕ بکەم
من بە سامانی هەژاری سەر لە جەمشید و کەیم
بۆ دەبێ داوا لە دەوری چەرخی پەس‌پەروەر بکەم
ناخ وشکی فەقرم ئەرچی شەرمەزاری هیممەتم
گەر لە چەشمەی خۆری ئیحسانی منەت لێو تەڕ بکەم
گەر پەسەندی لوتفی تۆن ئاور لە گیانم وەر بدەم
پێنەزانم گەر نەزەر بۆ زەمزەم و کەوسەر بکەم
دوێنەشەو لێوی لەگەڵ «حافز» بزەی نازی نوواند
من وەلێ باوەڕ بە رازی لێوی ناشێ هەر بکەم
قامەتی دیوانی ئەشعاری منی «کۆلیل»ـە چی
سەیری ئەم دیوانە ئێژن کوفرە تاوێ گەر بکەم!

من نه آن رندم که ترک شاهد و ساغر کنم
محتسب داند که من این کارها کمتر کنم

من که عیب توبه‌کاران کرده باشم بارها
توبه از می وقت گل دیوانه باشم گر کنم

عشق دردانه‌ست و من غواص و دریا میکده
سر فروبردم در آن‌جا تا کجا سر برکنم

لاله ساغرگیر و نرگس مست و بر ما نام فسق
داوری دارم بسی یا رب که را داور کنم

بازکش یک دم عنان ای ترک شهرآشوب من
تا ز اشک و چهره راهت پرزر و گوهر کنم

من که از یاقوت و لعل اشک دارم گنج‌ها
کی نظر در فیض خورشید بلنداختر کنم

چون صبا مجموعه‌ی گل را به آب لطف شست
کج‌دلم خوان گر نظر بر صفحه‌ی دفتر کنم

عهد و پیمان فلک را نیست چندان اعتبار
عهد با پیمانه بندم شرط با ساغر کنم

من که دارم در گدایی گنج سلطانی به دست
کی طمع در گردش گردون دون‌پرور کنم

گرچه گردآلود فقرم شرم باد از همتم
گر به آب چشمه‌ی خورشید دامن تر کنم

عاشقان را گر در آتش می‌پسندد لطف دوست
تنگ‌چشمم گر نظر در چشمه‌ی کوثر کنم

دوش لعلش عشوه‌ای می‌داد حافظ را ولی
من نه آنم کز وی این افسانه‌ها باور کنم

چییە عەشقت گوڵی من! بێژە چ تەدبیر بکەم
تا کەی و چەن لە غەمت ناڵەیی شەوگیر بکەم

دڵی شێتم لەوە دەرچوو بە قسەی ئێمە بکا
مەگەری باز لە کۆی زولفتی زەنجیر بکەم

ئەو غەم و حەسرەتە کێشامە لە دووریت، قەڵەم
جەوهەرێ وایە نەبوو بۆتی کە تەحریر بکەم

کوا مەجالێ کە پەرێشانیی دڵ زۆر و کەمی
بۆ سەری زولفی پەرێشانتی تەقریر بکەم

ئارەزوی دیدەنی گیانم کە لە سەر بێت، دەبێ
نەخشی کوڵمت لە خەیاڵ ئەو دەمە تەسویر بکەم

گەر بە دین دێیە کەنارم دڵ و دین هەردو ئەدەم
بەڵکە سوودێک لە ئەم مامەڵە نێچیر بکەم

بەسیەتی وەعزی درۆ لێم گەڕە واعیز، بە سەرت!
من کەسێ نیم کە بە گوێی مێشکی ریا بیر بکەم

نییە هیوایە بدا «خاجە» لە تەنگانە نەجات
چارەنووسم ئەمە بوو هەرچەنی تەدبیر بکەم

بەختی «کۆلیل» بەڵێ خزمە لەگەڵ زولفی، بەڵام
چۆن دەبێ چەشنی یەک ئەم دوو شەوە تەفسیر بکەم

صنما با غم عشق تو چه تدبیر کنم
تا به کی در غم تو ناله‌ی شبگیر کنم
دل دیوانه از آن شد که نصیحت شنود
مگرش هم ز سر زلف تو زنجیر کنم
آن چه در مدت هجر تو کشیدم هیهات
در یکی نامه محال است که تحریر کنم
با سر زلف تو مجموع پریشانی خود
کو مجالی که سراسر همه تقریر کنم
آن زمان کآرزوی دیدن جانم باشد
در نظر نقش رخ خوب تو تصویر کنم
گر بدانم که وصال تو بدین دست دهد
دین و دل را همه دربازم و توفیر کنم
دور شو از برم ای واعظ و بیهوده مگوی
من نه آنم که دگر گوش به تزویر کنم
نیست امید صلاحی ز فساد حافظ
چون که تقدیر چنین است چه تدبیر کنم

چەم بە زەریـا دەکەم و سەبـری بە سەحرای دەخەم
دڵـی خۆ، یـانی بە ئەم کـارە بە زەریـای دەخـەم
لە دڵـی تەنگـی گـونـابـار هەڵێـنم ئـاخـێ
گـڕی ئـاگر لە خەتای ئـادەم و حـەووای دەخـەم
قاتـە لەو شوێنـە کە ئەو بێ غـەمی دڵ، هەر بۆیـێ
تێـدەکۆشـم کە بنـەوبـاری دڵـم لای دەخـەم
بـاخـی سینـگی کە بە دەر خـا گوڵی زێڕین کەوا
سـەری سەودام وەکوو زولفی لە بەر پـای دەخـەم
بەنـدی جێ‌تیـری فەلەک شەرتە بە مەستی بچـڕم
تیـری چون گیرە لە گیـانم پەکی جەوزای دەخـەم
دەپژێنـم لە زەمیـن، تەختـی رەوان، لەعلی شـەراب
گومەزی شین بە چڕەی چەنگ بە ئەی وای دەخـەم
«حافـز» ئەم چـەرخە لەگەڵ کەس کە وەفـادار نەبوو
شێتم ئەم گۆوەنە یەک چرکە، بەر و دوای دەخـەم؟
وەرە «کۆلیـل»! ئەمـەوێ رازی دەرون هەڵـڕێـژم
دڵ وەکـوو سفـرە یەکاڵا دەکـەم و رای‌دەخـەم

دیـــده دریـــا کنـــم و صبـــر به صحـــرا فکنـــم
و انـــدر این کـــار دل خویـش به دریـا فکنـــم
از دل تنـــگ گنهکـــار بـــــرآرم آهـــی
کــآتش انـــدر گنــــه آدم و حـــوا فکنـــم
مایـه‌ی خوشـدلی آن‌جاست که دلدار آن‌جاست
می‌کنـم جهـــد که خـود را مگر آن‌جا فکنـــم
بگشـــا بنـد قبـــا ای مـــه خورشیـــد کـــلاه
تـــا چـو زلفـت سـر ســـودازده در پـا فکنـــم
خـــورده‌ام تیـــر فلـــک بـاده بده تـا سـرمست
عقـــده دربنـــد کمـــر ترکـش جـــوزا فکنـــم
جرعـــه‌ی جـــام بر ایـن تخـت روان افشـــانم
غلغـــل چنـــگ در ایـن گنـــبد میـــنا فکنـــم
حافظـــا تکیـــه بر ایـــام چو سهـو است و خطـا
من چـــرا عشـــرت امـــروز به فـــردا فکنـــم

سەر وتم دوێشەو بە عەشقی کوڵمی رون تا کەی بکەم
دڵ وتی پێوەن لە کوێن تا چاری ئەم شێتەی بکەم
تا وتم بەژنی بەڕێکی سەروە لێم ئاڵۆز بوو
زیزە ئازیزم بە راسی هاوەڵان چۆن ئەی بکەم؟
عیشوەیێ فەرموو کە تەبعم بێتە سەر خۆ نازەنین!
چونکە تەشبیهم بە سەروێ کردوی خوێن قەی بکەم!
رەنگ زەردی تەبعی ناسکیانم ئەرچی بێ‌خەتام
بێنە ساقی بادە تا روو سوور چەشنی مەی بکەم
ئەی هەوایێ وا لە کۆی لەیلاوە دێی تۆ بی و خودا!
ماڵوێرانی بە جەیحون بێژە پێم تا کەی بکەم
من کە گەنجی جوانی بێ‌پایانی تۆم بێ، سەهلە بۆم
سەد هەزاری چەشنی خۆ دارا بە چەشنی کەی بکەم
ئەی هەتاوی بەختەوەر هەڵبێ! لە سەر «حافز» هەتا
بۆ دەوامی دەوڵەتی بەرزت دوعا بێ پەی بکەم
تۆ شوکور خاوەن هەنار و باخی سێوی بۆیە من
چەشنی «کۆلیل»ـت بە رەنگی زەرد ئەبێ هەی بەی بکەم

دوش سـودای رُخـش گفتم ز سر بیرون کنـم
گفت کو زنجیـر تا تدبیـر این مجنـون کنـم
قـامتش را سـرو گفتم سر کشید از من به خشم
دوسـتـان از راست می‌رنجد نگـارم چون کنـم
نکتـه‌ی ناسنجیـده گفتـم دلبـرا معـذور دار
عشـوه‌ای فـرمای تا من طبع را مـوزون کنـم
زردرویی می‌کشـم زان طبـع نـازک بی‌گنـاه
ساقیـا جـامی بـده تا چهره را گلگون کنـم
ای نسیـم منـزل لیلـی خـدا را تـا به کـی
رَبـع را بر هـم زنـم اطـلال را جیحـون کنـم
من که ره بـردم به گنـج حسـن بی‌پایـان دوست
صد گدای همچو خود را بعد از این قارون کنـم
ای مـه صـاحب‌قران از بنـده حافـظ یـاد کن
تا دعـای دولـت آن حسـن روزافـزون کنـم

به قەستی تۆبە سەحەر عەزمی ئیستیخارە دەکەم
بەهاری تۆبەشکین بێ چلۆنی چارە دەکەم
قسەی دلّم هەر ئەمەن: نامەوێ لە کۆڕێ بم
کە نۆشی بادە دەکا مەست و من نەزارە دەکەم
بە یادی مەجلیسی شاهانە چەشنی خونچە بە شەوق
پیالّە دەگرم و یێخەی کراس پارە دەکەم
لە وەرزی لالە نەخۆشم دەبێ عەلاجم کەن
ئەگەر لە گۆوەنی گوڵدا لە مەی کەنارە دەکەم
گولّی مورادی مە پشکووت چون بە دیدارت
دەلاّلەتی سەری دژمن بە بەردە هارە دەکەم
هەزاری مەیکەدەم ئەمما لە کاتی مەستیدا
فەخر لەسەر فەلەك و مەحکەمەی هەسارە دەکەم
منێ کە نەمبووە دووری لە هەر حەلاڵ و حەرام
چ عارە غەیبەتی مەی‌نۆشی خەو غەوارە دەکەم
بە تەختی گوڵ سەنەمێ دادەنێم و دەیکەمە شا
کە پاوەنی لە سەمەن، شەوبەنی لە سارە دەکەم
مەلوولە «خاجە» لە نۆشینی مەی بە ترس و دزە
بە دەنگی عوود و دەف و نەی حیجابی پارە دەکەم
قەسەم بە دەردی دەروونی خەمین و «کۆلیل»ـم
کە زینی بەرقی غەزەڵ بۆ سەفی پەژارە دەکەم

به عــزم توبه سحـر گفتم استخـاره کنــم
بهــار توبه‌شکن می‌رسد چه چـاره کنــم
سخــن درست بگویـــم نمی‌توانــم دیـد
که مــی خورند حریفان و من نظاره کنــم
چو غنچه با لب خنـدان به یاد مجلس شاه
پیــاله گیـرم و از شوق جـامه پـاره کنــم
به دور لالـــه دمـــاغ مــرا عــلاج کنـید
گر از میــانه‌ی بــزم طـرب کنــاره کنـم
ز روی دوست مرا چون گل مراد شکفت
حوالـه‌ی سر دشمن به سنگ خـاره کنـم
گــدای میکــده‌ام لیک وقت مستی بین
که نـاز بر فلـک و حکـم بر ستـاره کنــم
مرا که نیست ره و رســم لقمــه‌پرهیــزی
چـرا مـلامت رنــد شـراب‌خـواره کنــم
به تخت گــل بنشـــانم بتـی چو سلطـانی
ز سنبل و سمنش ساز طوق و یـاره کنــم
ز بـــاده‌خوردن پنهــان ملول شـد حافـظ
به بانگ بربط و نی رازش آشکاره کنــم

حاشا بڵێم لە وەرزی گوڵا تەرکی مەی دەکەم
سەرگەنجی دەرک و هۆشە من ئەم کارە کەی دەکەم
نەیژەن لە کوێن کە بەرهەمی زانین و زوهدی خۆ
خەرجی سەدای چەنگ و نەوای عوود و نەی دەکەم
زۆرم لە دەرسی مەدرەسە گیراوە حاڵی دڵ
یەک سەردەمێک مەشقی خەت و خاڵ و مەی دەکەم
کەی بوویەتی زەمانە وەفا، جام بێنە بۆم!
تا من حەکایەتی جەم و دارا و کەی دەکەم
ترسم لە رۆژی حەشر و لە نامەی رەشم نییە
سەد دەفتەری وەها بە شکۆی رەحمی تەی دەکەم
لە کوێن سەبا کە من گلەکانی شەوی فیراق
هەر بۆ ئەوانی بەختەوەر و نیکپەی دەکەم
گیانی ئەمانەتێ کە بە «حافز» گەیی لە یار
رۆژێک رووی ئەبینم و پێشکەش بە خۆی دەکەم
«کۆلیل»! جەژنی بەژنی بەهارە و شەرابی ناب
تەبعی حاتەمی شیعر و غەزەڵ وەقفی تەی دەکەم

حاشا که من به موسم گل ترک می کنم
من لاف عقل می‌زنم این کار کی کنم
مطرب کجاست تا همه محصول زهد و علم
در کار چنگ و بربط و آواز نی کنم
از قیل و قال مدرسه حالی دلم گرفت
یک چند نیز خدمت معشوق و می کنم
کی بود در زمانه وفا؟ جام می بیار
تا من حکایت جم و کاووس کِی کنم
از نامه‌ی سیاه نترسم که روز حشر
با فیض لطف او صد از این نامه طی کنم
کو پیک صبح تا گله‌های شب فراق
با آن خجسته طالع فرخنده پی کنم
این جان عاریت که به حافظ سپرد دوست
روزی رُخش ببینم و تسلیم وی کنم

چوو ژیانێک و لە مەیـخانەی ئەوین خـزمـەت دەکـەم
با هـەزارم کـاری دارا، خـاوەنی دەوڵـەت دەکـەم
تا لە تـۆڕی وەسڵی مەیلی خـەم خـەرامـان دڵبـەری
ماتڵی کاتـم مڵاسـم داوە کـەی فرسـەت دەکـەم
قەت قسـەی راسی لە دەم دەرنـایە واعیـز، ئـەڵبـەتـە
غەیبـەتی ناکـەم لە خـزمەت خۆشی وا سوحبەت دەکـەم
نـەرم و ئەسپـایی لەگـەڵ سـروەی دەچـم بۆ مێرگـوڵان
بەس لە یـارانی تەرێقـەت چـاوەڕێی هیممەت دەکـەم
زەحمـەتی ناڵـەم پتـر خاکـی دەرت هەڵنـاگـرێ
لوتفـی زۆرت بوو گوڵـم! بێـڵانە کەم زەحمـەت دەکـەم
زولفـی خـاوی داوی رێ، نـازی وەکـوو تیـری بەڵا
هۆشـی خۆت ئـەی دڵ ببێ بۆ تۆ بە دڵ وەسیەت دەکـەم
چـاوی بـەدبیـن بـا نەبیـنێ ئـەی دڵاوا راز پـۆش!
عەیب و تـاوانێ کە خۆمی پێ لە خەڵـوەت لـەت دەکـەم
«حافـز»ی قورئـان لە کـۆڕێک و لە کـۆڕێ بـادەنۆش
سەیرە چەن دووڕووم و چۆن شۆخی لەگەڵ ئومەت دەکەم
داوی مەکـری هەرکـەسێ جـۆرێک دانـا، وا منیـش
وەک «عومەر» سەدجۆرە باسی زولف و خاڵ و خەت دەکەم

روزگاری شد که در میخانه خدمت می‌کنم
در لباس فقر کار اهل دولت می‌کنم
تا کی اندر دام وصل آرم تذروی خوش‌خرام
در کمینم و انتظار وقت فرصت می‌کنم
واعظ ما بوی حق نشنید بشنو کاین سخن
در حضورش نیز می‌گویم نه غیبت می‌کنم
با صبا افتان و خیزان می‌روم تا کوی دوست
و از رفیقان ره استمداد همت می‌کنم
خاک کویت زحمت ما برنتابد بیش از این
لطف‌ها کردی بتا تخفیف زحمت می‌کنم
زلف دلبر دام راه و غمزه‌اش تیر بلاست
یاد دار ای دل که چندینت نصیحت می‌کنم
دیده‌ی بدبین بپوشان ای کریم عیب‌پوش
زین دلیری‌ها که من در کنج خلوت می‌کنم
حافظم در مجلسی، دُردی‌کشم در محفلی
بنگر این شوخی که چون با خلق صنعت می‌کنم

تەرکی حـەزی نیگـار و سوراحیم لە سـەر نییە
تۆبـــەم چەنێـک کـرد و لە هیچـم خەبەر نیـیە
کۆشکی بەهەشت و سێـبەری toوبا و باخ و کیژ
بـۆ مـن شکـۆی خـاکی لەبەر پێـتی هەر نییە
حاڵی بە رەمـزی دیـدە دەبن خەڵکی دڵ، منیش
کـردم ئیشـارە چونکـە ئەویـن بێنـەزەر نییە
دەستی نـــەداوە بۆم کە لە خۆمـم خەبـەر بیێ
تا سـەر نەدەم لە مەیـکەدە هۆشم لە سـەر نییە
واعیــز وتی بە تـانە بـڕۆ تـەرکی حـەز بکـە
ناکـەم جەنـاب! کاری وەها خێـرە، شـەڕ نیـیە
پارێــزی من ئەوەن کـە لە کۆی دەلالانی شـار
نــازی لەسـەر مینـبەر و کریشمـەم لەبـەر نیـیە
«حافــز»! سـەرای پیری موغان کۆشی رەحمەتە
هەرکـەس لـەم ئاستــانە بچێ بەختــەوەر نیـیە
«کۆلیـــل» گـۆی بە زەنگی مونـــاجاتی بەیـــانە
دەرمانی دەردی ئێمـە مەگەر ئەی سەحـەر نیـیە

من تــرک عشـق شـاهد و سـاغر نمی‌کنــم
صـد بـــار توبـه کـردم و دیگــر نمی‌کنــم

بـــاغ بهشت و سـایه‌ی طوبی و قصر و حور
با خـــاک کـوی دوست بــرابــر نمی‌کنــم

تلقیـــن و درس اهل نظر یک اشـارت است
گفتـــم کنــــایتـی و مکـــرر نمی‌کنــم

هـر گـــز نمی‌شــود ز ســر خـود خبــر مرا
تــا در میـــان میـــکده سـر برنمی‌کنــم

ناصـح به طعن گفت که رو ترک عشق کن
محتـــاج جنـگ نیسـت بـــرادر نمی‌کنــم

این تقویـــم تمـــام که با شـــاهدان شهــر
نـــاز و کرشمــــه بر ســـر منـــبر نمی‌کنــم

حافظ جنـاب پیـر مغـان جـای دولت است
من تــرک خـــاک‌بوسـی این در نمی‌کنــم

مژۆڵــی دڵڕەشت رەخنــەی ئەوەن کردون لەسـەر دینم
دەڵێـم بـەو چاوە بیمـارەت فیـداکەم گیـانی بێ تیـــنم
ئەرێ ئـەی هــاونشینی دڵ! کە یـــارانت لە بیــرۆ چـوو
بە بێ یــادی ئەتۆ یـاڕەب نەفــەس بڕ بێ دەمـی ژیـــنم!
جەهان ئەی زاڵی بێبونیـــاد هەی فەرهــاد کوژ هەی داد!
کە مەکر و فێڵــی تـۆ کردی وەڕەز لە گیـانی شیریـــنم
لە تــاوی ئـاوری دووری وەکوو گوڵ نوقمی ئارەق بووم
نەسیمی سـروە! کوا عەترێ لە دەسرەی بۆ عەرەقچیـــنم
بە قــوربانی بـرۆی سـاقی دەکەم حــەو تـاق و مابــاقی
تەماشـاییکی ئەو نـادەم بە تۆپـی چەرخـی چاوشیـــنم
بە جێگــەی من کەسێ تر هەڵبژێرێ گەر ئەوین، یـاڕەب!
نەمێـــنم گیـان ئەگەر دانـم لە جێـی ئازیـزی مێژیـــنم
سبەینــێ باشــی وت بولبول، مەنوو سـاقی لە خەو هەستە!
لەسەر غەوغا دەکـا خەونـێ کە دوێشـەو هـاتی بۆ دیـــنم
شەوی کۆچم لە جێ مەرگۆ دەچم بۆ کۆشکی چاومەستان
لـە کـاتی گیـان کەنشتا، تۆ ئەگەر شــەم بی لـە باڵیـــنم
قســەی دڵمان و تامــەزرۆی ئەوینێ سـەبتـە لەم شیعـرە
بەڕاسی بێهەڵە و نەقســە کە «حافـز» کـردی تەڵقیـــنم
لە شەوگــاری رەشی بێئێـــوەییدا چەشنی «کۆلیـل»ـت
لەســەر نەزمێکی وا پەخشــانە لەعلی نەسـری ئەسریـــنم

به مژگـــان سیـــه کردی هـــزاران رخنـه در دینـم
بیـــا کز چشـــم بیمـــارت هـــزاران درد برچیـــنم
الا ای همنشیـــن دل که یـــارانت برفـت از یـــاد
مـرا روزی مبـــاد آن دم که بی یـــاد تو بنشیـــنم
جهان پیر است و بی‌بنیاد از این فرهادکش فریـــاد
که کرد افسـون و نیرنگش ملول از جـان شیرینـــم
ز تـــاب آتش دوری شـدم غرق عـرق چون گـل
بیـــار ای بـاد شبـگیری نسیمـی زان عـرق‌چیـــنم
جهـان فـــانی و باقـی فـــدای شـــاهد و ســـاقی
کـه سلطـــانی عـــالم را طفیـــل عشـق می‌بیـــنم
اگر بر جـای من غیری گزیند دوست حاکم اوست
حـــرامم باد اگر من جان به جای دوست بگزینـــم
صَبـاح الخَیـــر زد بلبـل کجـایی ساقیـا برخیـــز
که غوغـــا می کنـد در سر خیـال خواب دوشیـــنم
شب رحلت هـــم از بستـــر روم در قصـر حورالعیـن
اگر در وقت جـــان دادن تو باشـی شمـع بالیـــنم
حـــدیث آرزومنـــدی که در این نـــامه ثبت افتـاد
همـــانا بی‌غلـــط باشـــد که حافـظ داد تلقیـــنم

چوونی بۆ مەیکەدەم ئێستاکە گەلێ مەسڵەحەتە
تا لەوێ خۆش بحەسێمۆ کە فرەم دڵ شەکەتە
دوور لەم خێڵە ریاکارە دەبم جام بە دەست
واتە لەم عالەمە هەر پاکدڵیم رەسم و خەتە
تا لە دونیا بە حەریفانی دەغەڵ تووش نەبم
هەر لەگەڵ یار و شەراب و غەزەلم پێ رەحەتە
هەڵیدێنم سەری سالار لە نێو باخ وەکوو
سەرو ئەگەر مەیلی جەهانم لە سەرا بێ قەوەتە
شەرمەزارم لە حوزووری مەی و مەیگێڕ گەلێ
بەم عەبا شۆڕەوە هەر ئەونەمە لافی غەڵەتە
سینگی تەنگی من و باری غەمی ئەو دوورە لە یەک
پیاوی ئەم بارە نە بێچارە دڵی پڕخەفەتە
من ئەگەر مەست لە مەیخانەم و یا شێخ لە شار
وەک دەبینی ئەمە کاڵامە کە هەر خەوش و چەتە
سەروەرم ئاسەفی دەورانە لەوم لا مەدە رێ
لێو کە تەڕ کەم، لە فەلەک تۆڵەگرم ئەو فەقەتە
دڵ لە گەردی ستەمم پڕ بووە یارەب کە نەکەی
لێڵ ئەو جامی ئەوین ئاینە لەو مەملەکەتە
ماڵی وێرانە، نەبێ ئەو دڵە «کۆلیل»ی بڕۆت
ماڵت ئاوا بە بڕۆی ئێوە دڵی ئێمە لەتە

حالیا مصلحت وقت در آن می‌بینم
که کشم رخت به میخانه و خوش بنشینم
جام می گیرم و از اهل ریا دور شوم
یعنی از اهل جهان پاکدلی بگزینم
جز صراحی و کتابم نبود یار و ندیم
تا حریفان دَغا را به جهان کم بینم
سر به آزادگی از خلق برآرم چون سرو
گر دهد دست که دامن ز جهان درچینم
بس که در خرقه‌ی آلوده زدم لاف صلاح
شرمسار از رخ ساقی و می رنگینم
سینه‌ی تنگ من و بار غم او هیهات
مرد این بار گران نیست دل مسکینم
من اگر رند خراباتم و گر زاهد شهر
این متاعم که همی‌بینی و کمتر زینم
بنده‌ی آصف عهدم دلم از راه مبر
که اگر دم زنم از چرخ بخواهد کینم
بر دلم گرد ستم‌هاست خدایا مپسند
که مکدر شود آیینه‌ی مهرآیینم

ئەگەر هەستێ لە دەس بەختم کە دانیشم لەگەڵ ژینم
لە لێوی لەعلی مەی‌نۆشم، لە باخی وەسڵی گوڵچینم
رەگ و ریشەم دەسووتێنێ شەرابی تاڵی سۆفی کوژ
لە لێوت ساقیا ماچێ لەباتی گیانی شیرینم
دەکا شێتم یەقین فیکری پەرێشانێ، کە شەو تا رۆژ
لەگەڵ مانگم وتووێژە و بە خەو پۆلی پەری بینم
بە مەستان شەکری دا لێوت بە مەی‌نۆشانی مەی چاوت
منم بێبەش لە هەر دوو لا نە شیرین و نە نۆشینم
وەکوو هەر خاک با هێنای و لوتفێکت نەسیبی بوو
لەمەش یادێ بفەرموو چونکە خزمەتکاری دێرینم
نە هەرکەس هۆنیو بەیتێ ئەدیبە و نەزمی دڵگیرە
منم کەوگیری شیعری تازە چون چالاکە شاهینم
بە پێنووسی منی کێشاوە مانی نەخشی وێنووسی
برِوا! برِوا ئەگەر ناکەی بە کۆی سوورەتگەری چینم
لە هەرکەس نایە حەقبێژی، وەفاداری، ئەمن بۆیە
غولامی ئاسەفی دووهەم شکۆی دونیا و هەم دینم
بە واعیز گوێ نەدەی! من رەندی و مەستی دەزانم چین
کە من هەر شەو حەریف و هاوپیاڵەی مانگ و پەروینم
لە زستان و کرێوەی بێ‌وەفاییدا گەلێ دامان
وەکوو «کۆلیل» بۆیێ هەر لە فیکری تینی هاوینم

گرم از دست برخیزد که با دلدار بنشینم
ز جام وصل می‌نوشم ز باغ عیش گل چینم

شراب تلخ صوفی‌سوز بنیادم بخواهد برد
لبم بر لب نِه ای ساقی و بستان جان شیرینم

مگر دیوانه خواهم شد در این سودا که شب تا روز
سخن با ماه می‌گویم پری در خواب می‌بینم

لبت شکر به مستان داد و چشمت می به می‌خواران
منم کز غایت حرمان نه با آنم نه با اینم

چو هر خاکی که باد آورد فیضی برد از انعامت
ز حال بنده یاد آور که خدمتگار دیرینم

نه هر کو نقش نظمی زد کلامش دلپذیر افتد
تذرو طرفه من گیرم که چالاک است شاهینم

اگر باور نمی‌داری رو از صورتگر چین پرس
که مانی نسخه می‌خواهد ز نوک کلک مشکینم

وفاداری و حق‌گویی نه کار هر کسی باشد
غلام آصف ثانی جَلال الحقّ و الدّینم

رموز مستی و رندی ز من بشنو نه از واعظ
که با جام و قدح هر دم ندیم ماه و پروینم

لە سەکـــۆی مـەیکەدە شەو نووری خودا دێتــە نـەزەر
سـەیــرە لەکوێــوە کە نوورێکی وەهـــا دێتــە نــەزەر
نـــاز مەفـرۆشــە بە مـن قافڵـــەســـالاری حەجــاج!
کە لە تـــۆ مـــاڵ و لە مـــن دیــارە بەنـــا دێتــە نــەزەر
بـەو هـەوایەم لە گــرێ بـــاز بکەم زولفـــی ئــەویــن
فیکــری دوورێکە ســەد ئەڵبـەتتە خەتـا دێتــە نــەزەر
سۆزی دڵ، گەوهەری چاو، ئاهی سەحەر، ناڵەیی شەو
گشت ئەمـــــانەم نــەزەری ئێـــوەیــە وا دێتــە نــەزەر
هـــەردەم ئەگــرێ دەمــی رێگــا بە خەیـاڵم جـۆرێ
کـــێ دەزانـــێ کە لە تـــۆی پەردە چها دێتــە نــەزەر
کەس لە میسـکی خوتـــەن و مامــزی ماچیـــنی نـەدی
بۆنی خۆشێ کە سەحـەر خۆش لە سەبـا دێتــە نــەزەر
عەشقــی «حـــافـــز» بە بتـــێ عەیب مەزانـــن یـــاران!
چونکە وەک عاشقـــی ئێـــوەی بەوەفـــا دێتــە نــەزەر
هەر کە مەجنـــوونی قـــەد و قـــامەتی لەیـــلایە «عومەر»!
خۆی خـدر، عەشقی وەکوو ئاوی بەقـــا دێتــە نــەزەر

در خرابات مغان نور خدا می‌بینم
این عجب بین که چه نوری ز کجا می‌بینم
جلوه بر من مفروش ای ملک الحاج که تو
خانه می‌بینی و من خانه خدا می‌بینم
خواهم از زلف بتان نافه گشایی کردن
فکر دور است همانا که خطا می‌بینم
سوز دل اشک روان آه سحر ناله‌ی شب
این همه از نظر لطف شما می‌بینم
هر دم از روی تو نقشی زندم راه خیال
با که گویم که در این پرده چه‌ها می‌بینم
کس ندیده‌ست ز مشک ختن و نافه‌ی چین
آن‌چه من هر سحر از باد صبا می‌بینم
دوستان عیب نظربازی حافظ مکنید
که من او را ز محبان شما می‌بینم

غەمی زەمانە کە هیچی کەنار نابینم
شەرابی سوور نەبێ چاری کار نابینم
مەحاڵە حەزرەتی پیری موغان بەجێبێڵم
کە تەرکی خزمەتی هەرگیز لە بار نابینم
بە خۆری جام مەسەنجێنە عەیش و ئەندازەی
کە بەختی کات لە دەوری مەدار نابینم
نیشانی دۆسی خودا عەشقە، بەس دەبێ بت بێ
کە ئەم نیشانە لەگەڵ شێخی شار نابینم
هەزار داخی گران بۆ دو چاوی حەیرانم
کە بەو دو ئایەنە رووی ئاشکار نابینم
لە جۆیباری دیبەم سەروی قامەتی تا چوو
بە غەیری ئەشکی پڕەنگی گلار نابینم
کەسێ قومێکی شەرابی بە ئەم خومارە نەدا
ئەشا! لە خەڵکی جەهان کەس بە یار نابینم
لە من مەپرسە نیشانی بە چەشنی مووکەمەری
لەوێ کە خۆ بە دەبیری دیار نابینم
ئەدی من و دوڕی زەریای «خاجە» چونکە لەوێ
نەبێت گەنجی قسەی زەڕنیگار نابینم
دڵم لە حەسرەتی زولفی شەواری «کۆلیل»ـە
کە وا شەوارەمە بەژنی بەهار نابینم

غـم زمـانه که هیچش کـران نمی‌بیـنم
دواش جز مـی چون ارغـوان نمی‌بیـنم
به ترک خدمت پیـر مغان نخواهم گفت
چـرا که مصلحت خود در آن نمی‌بیـنم
ز آفتـاب قـدح ارتفـاع عیش بگیـر
چـرا که طالع وقت آن‌چنان نمی‌بیـنم
نشـان اهل خـدا عاشقی‌ست با خود دار
که در مشـایخ شهر این نشان نمی‌بیـنم
بدین دو دیـده‌ی حیران من هزار افسوس
که بـا دو آینـه رویش عیـان نمی‌بیـنم
قـد تو تـا بشـد از جویبـار دیده‌ی من
به‌جـای سرو جز آب روان نمی‌بیـنم
در این خمـار کسم جرعـه‌ای نمی‌بخشـد
ببـین که اهـل دلی در میـان نمی‌بیـنم
نشـان موی میـانش که دل در او بستـم
ز من مپرس که خود در میان نمی‌بیـنم
من و سفیـنه‌ی حافظ که جز در این دریا
بضـاعـت سخـن دُرفشـان نمی‌بیـنم

خۆشــە ئەو رۆژە لە کۆی مەنــزڵی ویـّـران دەڕۆم
گیان دەبێ راحەت و لەشوێن گوڵی گیانان دەڕۆم
با دەزانــم کە لە رێ نابەڵـــەدن خێـــڵی غــەریب
من بە بـۆنی سـەری دوو زولفـی پەرێشــان دەڕۆم
دڵ مەلــوولی هەڕەشــەی بەندی سکەندەر بووە وا
ئــارەزوم کۆچـە، بەرەو (تەختی سلێمــان) دەڕۆم
وەک سەبـــا با ئــەوە بیمـــارم و بێ تــاقــەتــە دڵ
بە حــەزی سـەروی رەوان بەژنی خەرامــان دەڕۆم
وەک قەڵەم گەر بە ســەریشم بووە بۆ لای دەچــم
بە دڵی زەخمـی و کڵپـە و کوڵـی گریـــان دەڕۆم
نەزری سەرشــانمە گەر لەم غەمــە رۆژێ بەدەرێـم
تا دەری مەیکەدە سەرخـۆش و غەزەڵخـان دەڕۆم
لە ئەوینـی وەکـو یەک زەڕڕە بە دەم رەقسـەوە تــا
کانی گەورەی کەرەمی خۆری درەخشـــان دەڕۆم
لە عەرەب نایــە غەمی بـــاری گرانی گەل و تــاک
بێــنە مەیدان کوڕەکـانی عەجــەم ئاســان دەڕۆم
لە بیــاوان وەکـو «حـافــز» ئەگــەرم رێـگە نەبـرد
نیــیە باکـــم لە پەنـــای ئاســەفی دەوران دەڕۆم
خوڕڕەم ئەو رۆژە لە کۆی (ئـاویــەر)ی سـەربەرزم
پاک وەک(کانی شفا) روو بە (سنە)ی جوان دەڕۆم

خرم آن روز کز این منزل ویران بروم
راحت جان طلبم وز پی جانان بروم
گرچه دانم که به جایی نبرد راه غریب
من به بوی سر آن زلف پریشان بروم
دلم از وحشت زندان سکندر بگرفت
رخت بربندم و تا ملک سلیمان بروم
چون صبا با تن بیمار و دل بی‌طاقت
به هواداری آن سرو خرامان بروم
در ره او چو قلم گر به سرم باید رفت
با دل زخم‌کش و دیده‌ی گریان بروم
نذر کردم گر از این غم به در آیم روزی
تا در میکده شادان و غزل‌خوان بروم
به هواداری او ذره صفت رقص‌کنان
تا لب چشمه‌ی خورشید درخشان بروم
تازیان را غم احوال گران‌باران نیست
پارسایان مددی تا خوش و آسان بروم
ور چو حافظ ز بیابان نبرم ره بیرون
همره کوکبه‌ی آصف دوران بروم

گەر لە ئەم مەنـــزلّە وێـــرانە بـەرەو یـــانە بــــڕۆم
شـەرتـە شێـتی کە نەکەم لەو حـەنـە فـــەرزانە بــــڕۆم

بە وەتـــەن لەم سـەفـــەرەم گەر بە سڵامەت بگــەیێـم
نـەزری سەرشـــانمە یەکسەر کە بە مەیـــخانە بــــڕۆم

تا بڵێـــم بەرهـەمی ئەو سەیـــر و سولووکـــەم چ بووە
جوانە بۆ تەکیە لەگەڵ نـەی، دەف و پەیمـــانە بــــڕۆم

ئاشنــــایانی ئـەویـــن بـــا بمـــژن خوێنیـــشـم
ناکەســم بۆ گلەش ئەر لا کــەس و بێگـــانە بــــڕۆم

بەنـــدی زولفی وەکــو زەنجیـــری لەمە و پاشمە جێ
تا کەی و چەنـــدە لە شوێن ئەو دڵــە دێـــوانە بــــڕۆم

دیــم ئەگەر تـــاقی برۆی هەر وەکـو میحـــرابی دەبێ
شـوکـری جێبێـــنم و بێ‌رۆح لە شوکـــرانە بــــڕۆم

خۆزگە بەو رۆژە کە وەک «خاجە» بە دۆسی سـەری تۆ
مـەس لەگەڵ دۆس لە مەیـــخانەوە بۆ یـــانە بــــڕۆم

مەستی بـــادەی خەســی دوو چـــاوتە «کۆلیـــل» دڵێ
تۆ بی و چـــاوی مەسی خـوایە! کە مەستـــانە بــــڕۆم

گر از این منـــزل ویـــران به ســـوی خـــانـه روم
دگـر آن‌جــا کـه روم عاقـــل و فـــرزانه روم

زین سفـــر گر به ســـلامت به وطـــن بـــاز رسم
نــذر کـــردم کـه هـــم از راه بـه میـــخانه روم

تا بگویم که چه کشفم شد از این سیـر و سلوک
بـه در صـومعـــه بـا بـــربـــط و پیمـــانه روم

آشنایـــان ره عشق گـــرم خـــون بخـــورنـــد
نـاکســـم گـر به شکـــایت ســـوی بیگـــانه روم

بعـد از این دست من و زلف چو زنجیـر نگـار
چنـــد و چنـــد از پی کـــام دل دیـــوانـه روم

گر ببیـــنم خـــم ابـروی چو محـــرابش بـاز
سجـــده‌ی شکـر کنـــم و از پی شکـــرانـه روم

خـــرم آن دم که چـو حافـظ به تـولای وزیـر
ســرخوش از میـــکده با دوست به کاشـــانه روم

خۆشە پامالّی جەفاتم وەکو خاکی سەرە رێت
ماچ ئەکەم خاکی دەرت زەحمەتی کێشاوە کە پێت
من نە ئەو کەسمە لە دەس ئێوە بنالّم هەرگیز
دەولّەتی تۆیە مەرامی ئەمنی حەلّقە لە گوێت
بە خەمی زولفی درێژت هەیە هیوام گەلێ
خوانەکا کورت وەکا دەستی مەبەستی، دلّی شێت
زەڕڕە خاکێکم و جێم خۆشە لە بەر دەرکی موراد
هەر لە با ترسمە ئەی دۆس لە ناکاو کە بێت
پیری مەیخانە سەحەر بۆیە دلّی دام جەلا
تێبگەم تا لە پلەی حوسنی خوداداد و بەجێت
زاهیدی سافی مزەوتی سەرەوەم، ئێستە بەلّام
مەیکەدەم جێگەیە لەو شوێنە دلّم دادەکەوێت
لەگەلّ ئەم خاکنشینەت وەرە بۆ مەیکەدە تا
حورمەتی ئێمە بزانیت لەوێ چەندە دەچێت
مەست رۆیشتی و نەتبوو نەزەرێ بۆ «حافز»
خوانەکا ئاگری ئاخم لە پڕێ خۆش بگرێت
شاهی خاوەر لەوە فەرموی کە سەحەر خۆشم هات
مەیلی شاییم نییە من خزمەتی تووڕانم ئەوێت
ملوەنی سوور لە مرواریی ئەسرینی «عومەر»
بۆ مل و گەردنی بەرزی کچی ئێران دەشێت

آن‌که پامال جفا کرد چو خاک راهم
خاک می‌بوسم و عذر قدمش می‌خواهم
من نه آنم که ز جور تو بنالم حاشا
بنده‌ی معتقد و چاکر دولت‌خواهم
بسته‌ام در خم گیسوی تو امید دراز
آن مبادا که کند دست طلب کوتاهم
ذره‌ی خاکم و در کوی توام جای خوش است
ترسم ای دوست که بادی ببرد ناگاهم
پیر میخانه سحر جام جهان‌بینم داد
وندر آن آینه از حسن تو کرد آگاهم
صوفی صومعه‌ی عالم قدسم لیکن
حالیا دیر مغان است حوالتگاهم
با من راه‌نشین خیز و سوی میکده آی
تا در آن حلقه ببینی که چه صاحب جاهم
مست بگذشتی و از حافظت اندیشه نبود
آه اگر دامن حسن تو بگیرد آهم
خوشم آمد که سحر خسرو خاور می‌گفت
با همه پادشهی بنده‌ی تورانشاهم

دیـــداری بوو بە قسمـــەت و مـــاچ و کەنـــار هـــەم
پێمن سپـاسی بەخت و خـولی ڕۆژگـار هـەم

سۆفـی بـڕۆ کـە خـۆری ئەوینـم ئـەوا هـەڵات
جامی مەیم لەدەست و شەوی زولفی یار هەم

عەیبی کەسێـک ئێمـە بە نۆشینی مـەی نەکـەیـم
لەعلی شـەراب خۆشـن و لێـوی نیگـار هەم

بگرن سـوراغی دڵ کە گـوم‌وگـۆڕە موحتـەسیـب
پرپڕ لە مەی جەهان‌و مەزەی خۆشگەوار هەم

خـاتـر بـە دەستـی تەفـرەقە نـادا بلیمـەتێ
بەس کۆوەبن بە شیعر و بە بادەی هەنار هەم

یەک قـوم لە لەعلـی لێـوی بڕێـژن لەسەر گڵـم
تا خاک بێ بە سوورەگوڵ و موشکبـار هەم

چوو ئەو دەمەی کە چاوی چەپەڵ گرتبوی کەمین
دژمن نەمـا لە بەیـن و سرشکـی گـلار هـەم

چون کـائینات پـاکی بە ئوکسێـژنت دەژێـن
تیشکێک ئەی هەتـاوی ژیـان بۆ هـەژار هەم

باخـی گوڵان لە فەیزی جەمـاڵت بە ڕەنگ و بـۆن
هـەوری کـەرەم بگیـرە!کەمێ بۆ کەنار هـەم

لە خـوا بترســـە! «حـافـز» ئەسیـری کـەزێـت بوو
عـەرزەم هەتـا نـەداوە بە عـالی‌تەبسار هـەم

(بورهان)ـی مولـک و دین کە لە ئیقبالـی ئەو زەمان
کانی کـەرەم بەڕاسـی چەپـی بەحـروار هـەم

سوبح ئاسمـان بەیـادی گەشـەی فیکـری ڕۆشنی
گیانی فیـدا دەکات و هەسارەی نیسـار هەم

تۆپی زەوینـە گۆی قـەفی گۆچـانی عـەدلـی ئـەو
ئاسمـانی شین و بەرزی گومەز بەرقـەرار هەم

بۆ عەزمی ڕۆح‌سـووکی دەبێ بێتە گەرد و خـول
نوختـەی مـەداری چەرخ و بنەی پایەدار هەم

تا ئەو دەمـەی لە سووڕی فەلـەک دێتـە ئاڵ‌وگـۆڕ
یەعنی کە ساڵ و مانگ و خەزان و بەهار هەم

خـاڵی نەبێـت کـۆشـکی جـەلالی لە گـۆوەن و
مەیگێڕ و سەروی ناز و قەدی گوڵعوزار هەم

بێـبەش نەبێ لە مـاچی خەت و خاڵ و شیعـری تەڕ
«کۆلیـل»و کۆڕی کیژ و کوڕی دڵ‌پەژار هەم

دیدار شد میسر و بوس و کنار هم
از بخت شکر دارم و از روزگار هم

زاهد برو که طالع اگر طالع من است
جامم به دست باشد و زلف نگار هم

ما عیب کس به مستی و رندی نمی‌کنیم
لعل بتان خوش است و می خوشگوار هم

ای دل بشارتی دهمت محتسب نماند
وز می جهان پر است و بت می‌گسار هم

خاطر به‌دست تفرقه دادن نه زیرکی‌ست
مجموعه‌ای بخواه و صراحی بیار هم

بر خاکیان عشق فشان جرعه‌ی لبش
تا خاک لعل‌گون شود و مشکبار هم

آن شد که چشم بد نگران بودی از کمین
خصم از میان برفت و سرشک از کنار هم

چون کائنات جمله به بوی تو زنده‌اند
ای آفتاب سایه ز ما برمدار هم

چون آب روی لاله و گل فیض حسن توست
ای ابر لطف بر من خاکی ببار هم

حافظ اسیر زلف تو شد از خدا بترس
وز انتصاف آصف جم اقتدار هم

برهان ملک و دین که ز دست وزارتش
ایام کان یمین شد و دریا یسار هم

بر یاد رای انور او آسمان به صبح
جان می‌کند فدا و کواکب نثار هم

گوی زمین ربوده‌ی چوگان عدل اوست
وین برکشیده گنبد نیلی حصار هم

عزم سبک عنان تو در جنبش آورد
این پایدار مرکز عالی‌مدار هم

تا از نتیجه‌ی فلک و طور دور اوست
تبدیل ماه و سال و خزان و بهار هم

خالی مباد کاخ جلالش ز سروران
وز ساقیان سروقد گلعذار هم

هەر بە یارە دەرد و دەرمانیش هەم
دڵ بە قوربانی دەکەم گیانیش هەم
ئەو شتەی ئێژن لە جوانی سەرترە
پڕ کەماڵە دڵبەر و جوانیش هەم
قەستی گیانی کردم ئەو یادی بەخێر
تا شکانی قەول و پەیمانیش هەم
نوکتەیێ ئێژم عەزیزان سەر بە مۆر
وەک دەبێ رۆژێ بە گۆرانیش هەم
هەروەها سەرچوو شەوانی وەسڵی ئەو
دەگوزەرێ رۆژانی هیجرانیش هەم
دین و دونیا پەڕتەوێکی روومەتی
پێم وتی بە زمان و بە گیانیش هەم
باوەڕی پێناکرێ دونیا پەسە
با بڵێم گەردوونی گەردانیش هەم
بێنە مەی عاشق! لە قازیم باک نین
وەک لە باس و خواسی دیوانیش هەم
موحتەسیب زانی کە «حافز» عاشقە
ئاسەفی زانا، سولەیمانیش هەم
خەڵکی کەرکووکم لەگەڵ «کۆلیل» و دڵ
هەر وەکوو ئامێد و بۆتانیش هەم

دردم از یـــار است و درمـــان نیـــز هـم
دل فـــدای او شـــد و جـــان نیـــز هـم
این که می گوینـد آن خـوش‌تر ز حسـن
یـــار مـــا ایـــن دارد و آن نیـــز هـم
یـــاد بـــاد آن کـــو به قصـد خـون ما
عهـــد را بشکست و پیمـــان نیـــز هـم
دوستـــان در پـــرده می گـویـــم سخـــن
گفتـــه خواهـد شد به دستـــان نیـــز هـم
چـــون ســـر آمد دولت شب‌هـــای وصـل
بگـــذرد ایـــام هجـــران نیـــز هـم
هـــر دو عـــالم یک فـــروغ روی اوست
گفتمـــت پیـــدا و پنهـــان نیـــز هـم
اعتمـــادی نیست بـر کـــار جهـــان
بلـــکه بـر گـــردون گـــردان نیـــز هـم
عـــاشق از قـــاضی نتـــرسد می بیـــار
بلـــکه از یرغـــوی دیـــوان نیـــز هـم
محتسب دانـــد کـه حافـظ عاشـق است
و آصـف ملـــک سلیمـــان نیـــز هـم

سەرخـــۆش و بێپـــەژارە دەژێ دڵ بە یـــادی یـــار
مەحرەم بە عەشق و هاونەفەسی جامی خۆش گەوار
گیانـــان هەتـــا لە کـــاری مـــە ئەبرۆ گوشـــا دەکەن
زۆرێ کـــەوانـــی لۆمـــە دەکێشـــن گەلـــی نەیـــار
وەک لالـــە دڵ بە داغـــەوە لەم بـــاخـــە من رووام
تۆ دوێنەشـــەو بە داغـی سەبووحیـــتە دڵپـــەژار
وەستـــاوین ئێمـــە بێـــژە لە کۆی عوزری مەیکەدە
دڵگیـــری تۆبەمـــانە ئەگەر پیـــری مـــەیمـــەدار
تۆ کار چـــاکی ســـا مـــەدەدێ ئەی لە رێ بەڵـــەدا!
ئینســـاف ئەدەم کە کەوتە لە رێگام و هەرزەکـــار
وەک لالـــەمان مەنـــاسە کە جـــامێ لە مەی پڕین
داغـی دەرون بەدی کە لە تۆی جەرگی کۆڵـــەوار
فەرمووتـــە مەیـــکە «خاجـــە»! خەیـــاڵاتی جۆرجۆر
نەخشی غەڵەت مەکێشە کە دڵ پـــاکە عەینی یـــار
«کۆلیـــل» تۆبـــەکـــاری بەهـــاری کریشمـــەتـــە
مەزرای ئەوینـــی دوورە لە خێـــڵی چـــەت و بـــژار

ما بی‌غمان مست دل از دست داده‌ایم
همراز عشق و همنفس جام باده‌ایم
بر ما بسی کمان ملامت کشیده‌اند
تا کار خود ز ابروی جانان گشاده‌ایم
ای گل تو دوش داغ صبوحی کشیده‌ای
ما آن شقایقیم که با داغ زاده‌ایم
پیر مغان ز توبه‌ی ما گر ملول شد
گو باده صاف کن که به عذر ایستاده‌ایم
کار از تو می‌رود مددی ای دلیل راه
کانصاف می‌دهیم و ز راه اوفتاده‌ایم
چون لاله می مبین و قدح در میان کار
این داغ بین که بر دل خونین نهاده‌ایم
گفتی که حافظ این همه رنگ و خیال چیست
نقش غلط مبین که همان لوح ساده‌ایم

عومرێکە رێگــەپێــوی غەمت چەشنی کۆچـەرین
بێمەکــر و بێریـــا لە ئــەوەی فێـــڵە بێـــوەرین
میحـراب و دەرسی حوجـرە، وتووێژی مەدرەسـەم
دۆڕا بە چـاوی ســاقی و مــەی چون هونەروەرین
هـەم دڵ ئـەدەم بە دەستی دو زولفـی رەشـــی بە دڵ
هەم گیــان بە ئەو دو چـاوە فریوکارەی ئەسپـەرین
عومرێکــە چـــاو لە گۆشــەیی ئەبرۆیە بەو هــەوا
خۆش بێ بە یەک ئیشارە دڵی عومری غەم قەرین
تەختی حوکـومەتی مە لەســەر زڵـــم و زۆر نیـن
شــاهی وڵاتـی ئەمنی بە بێفــەوج و لەشکــەرین
دڵ مەیلی نـــازی چـــاوی فریـوی دەکـــا، مەگەر
سیحـری بـرۆی دوبارە لە سینگی شڕ مشتـەرین؟!
چەشنی وەنـــەوشە سەر بە سەر ئەژنـۆ دەبێ بنێین
بێ زولفی سەرکەشی ئەو ئەشێ چۆن بەسەر بەرین
چـــاو چاوەڕێیە چەشنی تەماشــاگەرانی مـانــگ
دڵ گۆشـەگیـری بەژن و هیـلالی بـــرۆی پەرین
پرسیـــتە لێـــم کە «خاجە»! دڵی عاشقت لە کوێن؟
خۆزگەم بە خۆی ئەڵێ کە لە تۆی پرچی دڵبەرین
نووکی قەڵـــەم بە شێـــری برۆی تیژ ئەکا «عومەر»
بـۆیـێ ئـەوەن بە زات و دەرون پڕ لە جەوهــەرین

عمـری‌ست تا به راه غمت رو نهاده‌ایـــم
روی و ریـای خلق به یک سو نهاده‌ایـــم
طاق و رواق مدرســه و قـال و قیـل علـم
در راه جـام و سـاقی مــه‌رو نهاده‌ایـــم
هم جـان بدان دو نرگس جادو سپرده‌ایـم
هـم دل بـدان دو سنبل هنــدو نهاده‌ایـــم
عمـــری گذشت تـا بـه امیـــد اشـــارتی
چشمی بـدان دو گوشه‌ی ابرو نهاده‌ایـــم
مـا ملک عافیـت نـه بـه لشکـر گرفتـه‌ایم
مـا تخت سلطنـت نه بـه بـازو نهاده‌ایـــم
تا سحـر چشـم یار چه بازی کنـد که باز
بنـیاد بر کرشمـــه‌ی جـادو نهاده‌ایـــم
بی زلف سرکشش سر ســودایی از مـلال
همچــون بنفشـه بر سـر زانــو نهاده‌ایـــم
در گوشـــه‌ی امیـــد چو نظـارگان مــاه
چشـــم طـلب بر آن خم ابـرو نهاده‌ایـــم
گفتی که حافظا دل سرگشته‌ات کجاست
در حلقــه‌های آن خـــم گیسو نهاده‌ایـــم

لەبـەر ئەو دەرکە نەکـەوتوومە لەبەر شۆرەت و نام
بـۆ پەنـا هـاتووم ئاخـر فەلـەك ئـالآوە لە پام
لە سنـووری عەدەمـۆ تا دەوەر و شـاری وجـوود
ئەو هەموو رێگەیە بۆ عەشقی گولّی رووتە کوتـام
هەلّیکەنـدم چەمەنی رووت لە گولّزاری بەهەشت
بە خەتی سـەوزی ئەویـن تا بحەسینۆ بە مـەرام
لەگـەلّ ئەم عەشقـە کە بەرپرسییە جبریلی ئەمیـن
ئەوە هـاتوومـەتە بەر مالّی شەهەنشـاهـ و گـەدام
بێ گومـانم کە لە دیـوانی جـەزا چـارەڕەشم
داکـە ئەی هەوری خەتاپۆش هەتا نەچوە حەیـام!
لەنگەری بەخششت ئەی کەشتیی ئیحسان لەکوێـن
من کە بەمجۆرە لە نێو بەحری کەرەم نوقمی گونام
«حافـز»! ئەم کۆنە عەبـا لاوە لەسـەر شـانی درۆ
چون لە شوێـن قافلّـە وێلّین بە نـالّە و گڕی زام
فـوو لە پۆلّوی دلّی «کۆلیـل» وەکوو زولفی بکەن
شـەوی تـاوان لەسـەر رێگەمە، موحتاجی چـرام

ما بدین در نه پی حشمت و جاه آمده‌ایم
از بد حادثه اینجا به پناه آمده‌ایم
رهرو منزل عشقیم و ز سرحدّ عدم
تا به اقلیم وجود این همه راه آمده‌ایم
سبزه‌ی خط تو دیدیم و ز بستان بهشت
به طلبکاری این مهر گیاه آمده‌ایم
با چنین گنج که شد خازن او روح امین
به گدایی به در خانه‌ی شاه آمده‌ایم
لنگر حلم تو ای کشتی توفیق کجاست
که در این بحر کرم غرق گناه آمده‌ایم
آبرو می‌رود ای ابر خطاپوش ببار
که به دیوان عمل نامه سیاه آمده‌ایم
حافظ این خرقه‌ی پشمینه مینداز که ما
از پی قافله با آتش آه آمده‌ایم

پیــری مەیــخانە وتــوویانە لەســەر قــەولی قــەدیــم
مــەی لە ئــەو شوێنــە حــەرامن کە نەبێ یــار نەدیم

شڕشڕ ئاخــر دەکــەم ئەم خەرقــە کە پڕپڕ لە ریــان
سوحبــەتی ڕۆح لەگــەڵ جنسی وەها سەختە حەکیم

بەو هــەوا لێــــم بپــــڕژێنێت قومێ لێــــوی ئــەوان
ئەوە چــەن ســاڵە لە کۆی مەیکــەدە ماتڵم و موقیم

ڕەنگــە ئەو خزمــەتی چەن ساڵەمی چووبێت لە یاد
ســـروە ئامـــانە! وەبیــــری خەوە پەیمـــانی قەدیــم

پاش سەد ســاڵ لەســەر گۆڕم ئەگەر کەی گوزەرێ
شیــن بە شەوقت لە گڵا، بێشک ئەبێ ئێسکی رزیــم

دڵ بە ســـەد وادەیــی دیـــدار دەبــا دڵبــەر ئەرێ
بۆنی قــەولــی دەمــە، دایم گوڵی بــۆنداری سەخیم

خونچــە دڵتەنــگ بڵــێ قــەت لە گرێی زار نەبێ
کە دەگــا کۆمەکی سروەی سەحەر و لوتفی نەسیم

مـن برینـــداری ئەوینـــم چیــیە کــارم بە تەبیب
بە دەســـی چــاوتە دەرمــانی دڵی شێـــتی پەتیــم

گەوهەری دین و ئەوین دەسخە! لەگەڵ خۆتی ئەبەی
کە بەشــی خەڵکیە ســامـــان و تەلار و زەڕ و سیم

داوی فێــــڵ و فــەرەزی سەختە مەگەر لوتفی خودا
حەزرەتــی ئــادەمــی لەغــــزاندووە شەیتــانی رەجیــم

شوکــری زۆری هــەیــە «حافز» لەوە ســامــانی نییە
کێ وەکوو ئەو هەیــەتی شیعــری تەڕ و تەبعی سەلیم

گیــانی «کۆلیــل» دەســی داوەتــە شمشێری برۆت
داوی دانــــاوە لــە ڕێمـــان کــە ئیبلیســـی خەنیــم

فتـوی پیـــر مغـــان دارم و قولی‌ست قـدیـم
که حـرام است می آن‌جا که نه یار است ندیم
چـاک خواهم زدن این دلق ریـایی چه کنم
روح را صحبت نـاجنس عــذابی‌ست الیـم
تـا مگـر جرعــه فشـــاند لب جانــان بر مـن
ســـال‌ها شــد که منــم بر در میخـانه مقیـم
مگــرش خـــدمت دیـرین من از یـاد برفت
ای نسیـم سحــری یــاد دهش عهـد قدیـم
بعد صــد ســـال اگر بر ســر خـــاکم گذری
ســر برآرد ز گلـــم رقص‌کنان عظـم رمیـم
دلبــر از مـا بـه صــد امیـــد ستـــد اول دل
ظاهــرا عهــد فرامـش نکنــد خلق کریـم
غنچــه گو تنگــدل از کـار فــروبستـه مبـاش
کز دم صبـح مـدد یـابـی و انفــاس نسیـم
فکــر بهبـود خود ای دل ز دری دیگــر کــن
درد عـــاشق نشـــود بــه به مـــداوای حکیـم
گوهــر معـــرفت آموز که با خــود ببـــری
که نصیب دگـــران است نصـاب زر و سیــم
دام سخت است مگـر یـــار شود لطف خــدا
ور نــه آدم نبـــرد صرفــه ز شیطـان رجیـم
حافظ ار سیم و زرت نیست چه شد شاکر باش
چه بــه از دولت لطـف سخـن و طبع سلیـم

وەرە بۆ مەیکەدە دۆعــای گوشـادێك بكــەین
ماتڵـی دۆس لە رێ، یــادی مـورادێك بكــەین
نییە تۆشــەی سەفــەرێ بۆ حــەرەمی وەسڵی ئەبێ
روو لە مەیخــانە لەبەر تۆشــە و زادێك بكــەین
بە ریــا تێكـەڵە چـون ئەشكــی رەوانــم، وەرە بـا
تەڵــەبی نامەبــەرێ وەك پەریــزادێك بكــەین
بە قوزوڵقـوردی دەرون بێت غەمی عەشقت ئەگەر
جێ لە بێــدادی ئەتـۆ یــاد لـە دادێك بكــەین
نوختــەیی خاڵی رەشت، نایـەتە سەر لەوحی دییەم
مـەر لـە بیلـبیلە تەمـەننــای میــدادێك بكــەین
دڵ وتی گیــان بە ئیشــارەی لەبی شیــرینت ئەدەم
بە بزەی شەكــری وتی چۆنە مـەزادێك بكــەین
تا دەمــێ عەتــرە دەوا بـۆ دڵـی دێــوانـە، مەگەر
لەو خــەت و خــاڵتە داوای ســەوادێك بكــەین
چون دڵـی خۆشــە فەقەت دەفری غەمی یار، وەرن
بە ئومێــدی غەمی، دڵ خـۆش بە یادێك بكــەین
«خاجــە»! دانیشتنی بەر مەدرەســە تا چەنــدە ئەرێ
هەستـە مەیــخانە هەتـا بـازە جیهــادێك بكــەین
شــەش‌دەری گـرتووە «كۆلیـل»! حەریفت وەرە تـا
لە دڵـی مــۆرە تەقــازای گوشــادێك بكــەین

خیــز تــا از در میخــانه گشــادی طلبــیم
بــه ره دوسـت نشینــیم و مــرادی طلبــیم
زاد راه حــرم وصــل نـداریــم مگــر
بـه گــدایی ز در میــکده زادی طلبــیم
اشــک آلــوده‌ی مـا گرچـه روان است ولـی
به رســالت سوی او پـاک نهــادی طلبــیم
لــذت داغ غمــت بـر دل مـا بــاد حــرام
اگــر از جــور غــم عشـق تو دادی طلبــیم
نقطــه‌ی خــال تو بر لــوح بصـر نتـوان زد
مگــر از مردمک دیــده مــدادی طلبــیم
عشوه‌ای از لب شیرین تو دل خواست به جـان
به شکــرخنــده لبت گفـت مـزادی طلبــیم
تـا بـود نسخــه‌ی عطــری دل سـودازده را
از خــط غالیــه‌سـای تـو سـوادی طلبــیم
چون غمــت را نتــوان یافت مگر در دل شـاد
مـا بـه امیــد غمت خاطـر شــادی طلبــیم
بـر در مـدرســه تـا چنــد نشیــنی حـافــظ
خیــز تــا از در میخــانه گشــادی طلبــیم

بوو لە یاران چاوی یاریمان زۆر
بیر و بۆچوونی هەڵەی بوو زەینی کۆر

تا نمامی خۆشەویستی بەر بدا
ئێستە دڵ تۆوێکی چاند و چوو لە کۆڕ

دابی دەروێشی خوتە و بۆڵەی نییە
سەردە نا سەدها گلەی پێن جۆرجۆر

نازی چاوت شەڕفرۆشە و فێڵەواز
ئێمە پێمان ئاشتین و عەشق و شۆر

نووری روخسارت ئەوەن رۆشن نەبوو
هیممەتی شیعرم سەری خستون لە خۆر

کەس لە دەس جەورت شکاتێکی نەکرد
دەغڵی رێزم پاکە بێ‌خەوشە و مورۆر

پێمی وت «حافز» دڵت پێم داوە خۆت
کەی لە سینگی تۆم کوتا من دەستی زۆر

تا نەبی رسوا وەکوو «کۆلیل»ـی شار
کێ وتی بشکێنە گەنجی سەر بە مۆر

ما ز یـــاران چشـــم یـــاری داشتـــیم

خود غلـــط بود آن‌چـه ما پنـــداشتـــیم

تـــا درخـــت دوستـــی بـر گـــی دهـــد

حـــالیـــا رفتـــیم و تخمـــی کاشتـــیم

گفـت‌وگــو آییـــن درویشـــی نبـــود

ور نـــه بـا تـو مـــاجـــراهـــا داشتـــیم

شیـــوه‌ی چشمت فریب جنـگ داشت

مـــا غلط کردیـــم و صلـح انگاشتـــیم

گلبـن حسـنـت نه خـود شـد دل‌فـــروز

مـــا دم همـــت بـــر او بگـمـــاشتـــیم

نکتـــه‌ها رفت و شکـــایت کس نکرد

جـــانب حرمـــت فـــرونگـــذاشتـــیم

گفت خـــود دادی بـه مـــا دل حافظـــا

مـــا محصـــل بـر کســـی نگمـــاشتـــیم

لە مـن پـارێـــز نایێ چونکە مەستـــانم ســـەلا فەرمـــوو
لە نۆبـەی نێرگزی مەستت لە گیـانم ئەلویدا فەرمـــوو
بکــەی بــڕوا بە من یا نــا دەلێــم هەر وەک وتـوومانـە
کە نەیبـوو خانــەقا کەلکێ دەری مەیخانە وا فەرمـــوو
خــراوی چـــاوتم ســـاقی! ئەگــەرچی دڵ پەیـــامی دا
کە هـەر دەردێ لە دڵبەر بێ هەزاری مەرحەبا فەرمـــوو
پەشیـــمانـۆ دەبی ڕۆژێ ئەگــەر ئەوڕۆکە نەمبــەخشی
فـەرامۆشی نەکەی! کەی پێم وتی لوتفێ عەتا فەرمـــوو
وتــم شمشـــاڵە بەژنت شــەرمـــەزارم بوختـیانم کـرد
زمـــانم لاڵ بـــێ وەختـــێ قیـاسێکی خەتــا فەرمـــوو
وەکوو ئاسکی خوتن نێوکی دڵی خوێنینە کێ وەک من
بە جێگەی زولفی چین‌چینی قسەی چینم خەتا فەرمـــوو
کەلامت ئــاورن «حــافــز»! وەلــێ ئـازیــز دڵسـەردە
لە بەدقەولــی گوڵـت لام وایـە بۆ بــادی سەبا فەرمـــوو
وتم «کۆلیـل»! کێ لە کــوێ وتــی مەی ئاوی حەیوانە
وتی پیری موغـان دوێنەی لە حەوشی خانەقا فەرمـــوو

صلاح از ما چه می‌جویی که مستان را صلا گفتیم
به دور نرگس مستت سلامت را دعا گفتیم
در میخانه‌ام بگشا که هیچ از خانقه نگشود
گرت باور بود ور نه سخن این بود و ما گفتیم
من از چشم تو ای ساقی خراب افتاده‌ام لیکن
بلایی کز حبیب آید هزارش مرحبا گفتیم
اگر بر من نبخشایی پشیمانی خوری آخر
به خاطر دار این معنی که در خدمت کجا گفتیم
قدت گفتم که شمشاد است بس خجلت به بار آورد
که این نسبت چرا کردیم و این بهتان چرا گفتیم
جگر چون نافه‌ام خون گشت کم زینم نمی‌باید
جزای آن که با زلفت سخن از چین خطا گفتیم
تو آتش گشتی ای حافظ ولی با یار درنگرفت
ز بدعهدی گل گویی حکایت با صبا گفتیم

سەرفی مەی و مەیخانە هەموو دەرسی سەحەر بوو
دەسکەوتی دوعا نوقمی ئەوین تووشی خەتەر بوو
خەرمانی دوسەد زاهیدی فەرزانە دەسووتێ
بەو داغە لەسەر ئەم دڵە شەیدامە کە بەر بوو
سوڵتانی ئەزەل خازینی گەنجی غەمی کردین
بەم مەنزڵە وێرانمە تا عەزمی سەفەر بوو
رێگەی نییە شۆخێ بە دڵم شۆری لەمە و پاش
ئەم گەنجە بە مۆری حەزی تۆ شەقڵی لە سەر بوو
دی بەسمە لە ژێر ئەم جبە پەشمینە دورەنگی
رەندانە ژیان بۆمە کە سەردێری هونەر بوو
کەشتی تەمەن ئەڕوات بەرەو کوێ کە سەرەنجام
گیانم لەسەر ئەو گەوهەرە تاقانە هەدەر بوو
سەد شوکری خودا هەر وەکو من بێ دڵ و دین بوو
ئەو ئاقڵ و فەرزانە کە لەم عالەمە سەر بوو
رازی بە خەیاڵێکە لە تۆ دڵ وەکو «حافز»
یارەب چ نەیارن دڵ و چەن سووکنەزەر بوو
بنوێنە وتم روو کە بکەم باسی خەت و خاڵ
فەرموی لەسەر ئەم مەتنە فەقەت شەرحی «عومەر» بوو

ما درس سحر در ره میخانه نهادیم
محصول دعا در ره جانانه نهادیم
در خرمن صد زاهد عاقل زند آتش
این داغ که ما بر دل دیوانه نهادیم
سلطان ازل گنج غم عشق به ما داد
تا روی در این منزل ویرانه نهادیم
در دل ندهم ره پس از این مهر بتان را
مهر لب او بر در این خانه نهادیم
در خرقه از این بیش منافق نتوان بود
بنیاد از این شیوه‌ی رندانه نهادیم
چون می‌رود این کشتی سرگشته که آخر
جان در سر آن گوهر یکدانه نهادیم
اَلمِنةُ لله که چو ما بیدل و دین بود
آن را که لقب عاقل و فرزانه نهادیم
قانع به خیالی ز تو بودیم چو حافظ
یا رب چه گداهمت و بیگانه نهادیم

بێـــلاّ لـە رێ و شەقـــامی خەرابـــات نەگوزەرین
چۆنکـــە هەموو رەجالّی قومێ ئاوی کەوســەرین
لافی قەلّەندەریم کە ئـەزەل بوون و مـافی عەشـق
گەنجـی ئەوین بە مۆرە ئەمێســتەش قەلّەنـدەرین
لەو شوێنە تەخت و بەختی کەی و جەم جەمۆکران
گەر غــەم دەنۆشـن ئێـوە، لە مەی ئێمە مشتــەرین
دەستــــم هەتـا دەچێــتە ملی چەشنـی ملـوەنێ
خـەملاوی خوێنـی دلّ وەکو یاقووتی ئەحمــەرین
لێــواوی رێـی ئەویـن مەکـە واعیــز نەسێــحەتێ
فیــردەوس هیچــە بۆ مـە کە حەیرانی ئەسمــەرین
چون سۆفیـــان بە رەقســی ریـــا بــوونە پێشــەوا
دەستــی درۆ هەلّێـــنە کە شـاگـــردی رێبـــەرین
وا خـــاك بوو بە کـانی جەواهیـر لە جـامی تـۆ
بێــچارە خێـلّی ئێمــە کە لەو خـاکە کەمتــەرین
«حافـز» حەساری بەرزە کە کۆشکی دیـاری یـار
ناچـار ئەبێ بە خـاکێ لە بەر دەرکی سـەر بـەرین
«کۆلیـــل» چـــاوەڕێتـە لە ئاســۆ وەدەرکـــەوی
بۆ چـاری شـەو، رەجـالّی بزەی لێوی ئەختــەرین

بگـــذار تا ز شـــارع میـــخانه بگـذریم
کز بهـر جرعـه‌ای همه محتـاج این دریـم
روز نخست چـون دم رنـدی زدیم و عشق
شرط آن بود که جز ره آن شیـوه نسپریـم
جـایی که تخت و مسند جـم می‌رود به باد
گر غم خوریم خوش نبود به که می‌خوریم
تا بـو که دست در کمـــر او تـوان زدن
در خـون دل نشستـه چو یاقـوت احمریـم
واعـظ مکن نصیحت شـوریـدگان که مـا
با خاک کوی دوست به فـردوس ننگریـم
چون صوفیـان به حـالت و رقصنـد مقتـدا
ما نیـز هـم به شعبـده دستـی برآوریـم
از جرعـه‌ی تو خـاک زمیـن دُر و لعل یافت
بیچـاره ما که پیش تو از خـاک کمتریـم
حافـظ چو ره به کنگره‌ی کاخ وصل نیست
بـا خـاک آستـانه این در بـه سـر بریـم

هەستــە وا خەرقـــەیی زاهید بە خەرابـات دەبەیــن
ئـەم وڕ و واجیـیە بۆ خێـڵی خـورافــات دەبـەیـن
وەرە بەرمـــاڵی ریـــا دەڵقـــی درۆ هـەر دو بـەلای
خەرقەناســانی قەڵەنـدەر وەکـو سەوقـات دەبـەیـن
بگــرن ئـەم خەڵوەنشیـــنانە هەتـــا جـامی سەحـــەر
سوبحـی زوو چەنگ بەرەو پیری موناجـات دەبـەیـن
ئەو قـــەرارەی لەگـــەڵ ئێوەم کە لە (أیمَـن) بووە زوو
چەشنی مووســا (أرِنـی)بێــژ، بە میقـــات دەبـەیـن
دەکوتیـن تەپڵـی شکۆتان لەســەر عەرشـی بەریـن
پەرچــەمی عەشق بە سەربانی سەمــاوات دەبـەیـن
خـــاکی بـەرپـــات بە سەحـــرای قیـامەت بـە دڵ و
گیـان هەموومــان لەبەر حورمەتی بەر پـات دەبـەیـن
ڕێگــەش ئەر پـڕ لە دڕووی تـانــە بکا شێخــی ریـا
ئەو لە گـوڵــزارەوە بۆ بەنــدی موکافــات دەبـەیـن
بەم عەبـــا پەشمیـیە تێکـــەڵ بە گونـــامانــە دەبێ
داڕزیــن دەم لە هونــەر نـاوی کەرامـــات دەبـەیـن
ئەی دڵ ئەر ڕێـزی وەخـت نەگری و کارێک نەکەی
شەرمــەزاری فـرە بۆ بەرهـەمی ئەوقـــات دەبـەیـن
پیــری مەیخــانە پەنـــایێ! کە دەزانیـــت لـە ژێــر
میچی ڕەنگینی فەلەک تاڵ بە سـەر، کـــات دەبـەیـن
لە بیـــاوانی فەنـــا تـــا بە کـــەی ئـــاخر گـــوم و گـــۆڕ
تـا نەپرسیـــن مەگـــەر ڕێگـــە بە بـــالات دەبـەیـن؟
ئاوڕووڕێـــژییە «حافــز»! لە ســـەرای سپڵـــەگوزەر
ئێمــە بۆ یـــار فەقەت حاجـەت و ئـــاوات دەبـەیـن
ئێمــە «کۆلیـــل»ی خەتـــا، دۆس خەتـــاپۆشە هەتـا
رادەیـــێ دەستـــی سکـــالا بە مولاقـــات دەبـەیـن

خیـز تا خرقـه‌ی صوفی به خرابـات بریـم
شطـح و طامـات به بازار خرافـات بریـم
ســوی رنـدان قلنـدر بـه ره‌آورد سفـر
دلـق بسطـامی و سجـاده‌ی طامـات بریـم
تا همـه خلوتیـان جـام صبـوحی گیرنـد
چنگ صبحـی به در پیـر مناجـات بریـم
با تو آن عهـد که در وادی ایمـن بستـیم
همچو موسـی ارنـی گوی به میقـات بریـم
کوس نامـوس تو بر کنگـره‌ی عرش زنیم
علـم عشـق تـو بـر بـام سمـاوات بریـم
خـاک کـوی تو به صحـرای قیامت فـردا
همـه بر فـرق سـر از بهـر مباهـات بریـم
ور نهـد در ره مـا خـار مـلامت زاهـد
از گلستـانش به زنـدان مکافـات بریـم
شرممـان بـاد ز پشمیـنه‌ی آلوده‌ی خویش
گر بدیـن فضـل و هنـر نام کرامـات بریـم
قـدر وقت ار نشنـاسد دل و کـاری نکنـد
بس خجالت که از این حاصل اوقـات بریـم
فتـنه می‌بـارد از این سقف مقرنس برخیـز
تا به میـخانه پنـاه از همـه آفـات بریـم
در بیابـان فنـا گـم‌شـدن آخـر تـا کـی
ره بپـرسیـم مگـر پـی بـه مهمـات بریـم
حافـظ آب رخ خـود بر در هر سفلـه مریز
حاجت آن بـه که بـر قاضی حاجـات بریـم

وەرن میچی فەلەک لابەین و تەرحێ تازە بەرپا کەین
گوزەرگەی یار گوڵفەرش و لە مەی پڕ جامی مینا کەین
ئەگەر غەم لەشکری بێنێ کە خوێنی ئێمە بڕژێنێ
من و ساقی دەبێ خۆی و سپاکەی تەفروتوونا کەین
گولاوی قەمسەری تێکەڵ بە بادەی ئەرخەوانی بوو
لە مەنگەڵ با شەکەر خەین و موعەتتەر دەشت و سەحرا کەین
هەتا سازت لە دەستا سازە، موتریب لێدە ئاهەنگێ!
بە چەپڵە و شیعر و هەڵپەڕکێ کە ئێمەش بۆتی مەعنا کەین
سەبا بڕفێنە بۆ شۆخ ئاستانی، خاکمان بەڵکوو
بە دڵ چاوێ لە سوڵتانی هەموو شۆخانی دونیا کەین
دەنازێ یەک بە عەقڵ و یەک دەڕاوێنێ لە رازی غەیب
وەرن تا لاف و مافی وا حەواڵەی زاتی زانا کەین
بەهەشتی جاویدانت گەر دەوێ مەیخانە هۆکارە
لە پێی کووپەی مەیا هەرتا نەبی کەوسەر عەتا ناکەین
لە شیرازا قسەی خۆش و نەسەقبازاڕی بێشەوقە
وەرن تا مشتەری «حافز» لە شارێ دیکە پەیدا کەین
وتی «کۆلیل»! کوردستان بەجێبێڵین با بەینێ
وتم هەڵخەن پەتیشم، تا ئەبەد کوفرێکی وا ناکەین

بیـــا تـا گـل بـرافشـــانیم و مـی در ســـاغـر انـــدازیـــم
فلـــک را سقـــف بشکـــافیـــم و طـرحی نو درانـــدازیـــم
اگر غـــم لشکـــر انگیـــزد که خـــون عـــاشقـــان ریـــزد
مـن و ســـاقی به هـــم تـــازیم و بنـــیادش برانـــدازیـــم
شـــراب ارغـــوانی را گـــلاب انـــدر قـــدح ریزیـــم
نسیـــم عطـــر گـــردان را شکـــر در مجمـــر انـــدازیـــم
چو در دست است رودی خوش بزن مطرب سرودی خوش
که دست‌افشـــان غـــزل خوانیـــم و پاکوبان سر انـــدازیـــم
صبـــا خـــاک وجـــود ما بـــدان عـــالی‌جنـــاب انـــداز
بـــود کان شـــاه خوبـــان را نظـــر بر منظـــر انـــدازیـــم
یکـــی از عقـــل می‌لافـــد یکـــی طامـــات می‌بـــافـــد
بیـــا کـــاین داوری‌هـــا را به پیـــش داور انـــدازیـــم
بهشـــت عـــدن اگـــر خـــواهی بیـــا با ما به میـــخانه
که از پـــای خمت روزی به حـــوض کوثـــر انـــدازیـــم
سخنـــدانی و خوش‌خـــوانی نمی‌ورزنـــد در شیـــراز
بیـــا حافـــظ که تا خود را به ملکـــی دیگـــر انـــدازیـــم

یا شێـخ! بێ کە دەڵقـی ریـا پـارەپـارە کەیـن
ئەم نەخشە پڕ لە رەنگی فەن و فێڵە چـارەکەیـن
ئەم خەرقــە با لە ئـاوی خەرابــات هەڵـژەنیــن
خێـری مزەوت خەرجی شـەرابی حەوسارەکەیـن
پێمـان ئەگەر نەدەن لە قیــامەت بەهـەشت ئەشێ
غیلمان لە باخ و حـۆری لە جەننەت غەوارەکەیـن
سـەرمەست پـڕ ئەدەینـە مەکۆی بەزمی سۆفییان
تاڵان هەموو شەراب و لە بـاوەش نیگـارەکەیـن
خۆش رابوێــرە! وەرنــە غەم و دەرد ئەمانــکوژێ
رۆژێ کە لەم جەهـانە بـەرەو گـۆڕ بــارەکەیـن
رەمـزی خودا بە مەستی لە ژێر پـەردە دەردەخـەین
کولـمی گەشی لە گۆشەیی غەیب ئاشکارەکەیـن
هەر دەرکەوێ هیــلالی برۆی چەشنی مـانگی نـۆ
گۆی ئاسمان ئەسیری خەمـی زولفـی یارە کەیـن
«حـافــز»! سنــوورمـان نیـیە لاف و گـەزافـی وا
پێ ئەونـە رامەکێشـە کە خۆ شــەرمــەزارەکەیـن
میــوانی کۆی گرینــم و «کۆلیـل»ـی بەرقی چاو
ئـاژیـن خوێنـی سینــە، لە بەژنـی گـلارەکەیـن

صوفی بیا که خرقه‌ی سالوس برکشیم

وین نقش زرق را خط بطلان به سر کشیم

نذر و فتوح صومعه در وجه می‌نهیم

دلق ریا به آب خرابات برکشیم

فردا اگر نه روضه‌ی رضوان به ما دهند

غلمان ز روضه‌ی حور ز جنت به درکشیم

بیرون جهیم سرخوش و از بزم صوفیان

غارت کنیم باده و شاهد به بر کشیم

عشرت کنیم ور نه به حسرت کشندمان

روزی که رخت جان به جهانی دگر کشیم

سرّ خدا که در تتق غیب منزوی‌ست

مستانه‌اش نقاب ز رخسار برکشیم

کو جلوه‌ای ز ابروی او تا چو ماه نو

گوی سپهر در خم چوگان زر کشیم

حافظ نه حد ماست چنین لاف‌ها زدن

پای از گلیم خویش چرا بیشتر کشیم

کـــاتـی گــوڵ لازمــە یـــاران هونــەری مـەی‌نۆشیــن
ئـەمــە فەرمــایشی ئـەهلــی دڵــە بـــا تێکۆشیـــن
نیـیەتی کـەس کەرەمێك و دەمـی خـۆشیـش دەچـێ
هـەر ئـــەوەن چـــارە کە بەرمــاڵ بە مــەی بفرۆشیـــن
خـــورڕەم و خـۆشـە هـــەوا، خـوایـە بنێـریت بتــێ!
کە سـوراحـی بە حـەزی چـــاوی مەسـی دادۆشیـــن
زوهـــرە ئەو ئۆرگ‌ژەنــەی چەرخـــە، لەگەڵ بێ‌هونەرە
چۆن نەنـاڵیـــن لە دەست ئەم غـەمـە، بۆ نەخـرۆشیـــن
گوڵی کێشــا گــوڵ و لێمـــان نەپـژان ئـاوی شـەراب
کە بە گــرپە و گــڕی دڵ داغ وەکــوو حـەوجۆشیـــن
بـــادەنۆشیـــن لە خەیـــالا بە پییـالەی گــوڵی ســوور
چاوی دژ کوێرا! کە بێ موتریب و مەی سـەرخۆشیـــن
بـــاوەڕی کەس نیـــیە بەم حـــالەتە «حافـز»! کە بڵێین
بولبـولانێکی لە نێـــو بـــاخ و چـــەمــەن خامۆشیـــن
بە حەزی حەزرەتی گوڵ هەر وەکو «کۆلیـل»ـی هەژار
قـڕوقــەپ، لاڵ، لە ســـامی ســەنـــەمێ تـەڕپۆشیـــن

دوستان وقت گل آن به که به عشرت کوشیم
سخن اهل دل است این و به جان بنیوشیم

نیست در کس کرم و وقت طرب می‌گذرد
چاره آن است که سجاده به می بفروشیم

خوش هوایی‌ست فرح‌بخش خدایا بفرست
نازنینی که به رویش می گلگون نوشیم

ارغنون ساز فلک رهزن اهل هنر است
چون از این غصه ننالیم و چرا نخروشیم

گل به جوش آمد و از می نزدیمش آبی
لاجرم ز آتش حرمان و هوس می‌جوشیم

می‌کشیم از قدح لاله شرابی موهوم
چشم بد دور که بی مطرب و می مدهوشیم

حافظ این حال عجب با که توان گفت که ما
بلبلانیم که در موسم گل خاموشیم

سەحـەرێ دەست هەڵێنـین و دوعـایێک بکەیـن
چـاری ئەم حەسرەتی هیجرانە بە راییک بکـەیـن
دڵی زەخمـی لە دەسم چوو ئەوە، یاران مەدەدێ!
تـا دەگـا دوکتـوری ئەم دەردە دەواییک بکـەیـن
کێ دڵـی دام لە تێـغ و بە دڵێشـانـەوە چـوو
ئێـوەن و خـوا وەریگێـڕن کە سەفاییک بکـەیـن
شادمـانی گوڵـی بێ‌ئـاوە خەرابـات لە کوێـن
بەڵکـە لەو ئـاو و هـەوا نەشئونومـاییک بکـەیـن
مەگـەر ئەی دڵ مەدەدی پیـری موغـان بێت، دەنا
کار ئەوەن سەختـە کە ناشێت خەتـاییک بکـەیـن
مەلـی بێ‌حەوسـەڵە بێ‌سێـبەرە، شـابـاڵی نیـیە
تەڵـەبی چەتـری موبـارەک لە هومـاییک بکەین
دڵ پەرێشانە، بڵێن «حافز»ی خۆش‌خوێن لە کوێن
کە بـە دەنـگ و غـەزەڵـی سـاز هەواییک بکەین
وەرە بۆ مەیـکەدە «کۆلیـل»! دەڵێـن یـار لـەوێ
دوێنـە فەرمـوویە دەبێ فیکری گەداییک بکەین

ما شبی دست برآریم و دعایی بکنیم

غم هجران تو را چاره ز جایی بکنیم

دل بیمار شد از دست رفیقان مددی

تا طبیبش به سر آریم و دوایی بکنیم

آن که بی‌جرم برنجید و به تیغم زد و رفت

بازش آرید خدا را که صفایی بکنیم

خشک شد بیخ طرب راه خرابات کجاست

تا در آن آب و هوا نشو و نمایی بکنیم

مدد از خاطر رندان طلب ای دل ورنه

کار صعب است مبادا که خطایی بکنیم

سایه‌ی طایر کم‌حوصله کاری نکند

طلب از سایه‌ی میمون همایی بکنیم

دلم از پرده بشد حافظ خوشگوی کجاست

تا به قول و غزلش ساز نوایی بکنیم

ئێمــە نیمــانە دەمی تۆمــەت و ناهــەق نیـیەکەیـم
ڕەش کراسی کەس و شین پەستەکی ڕەونەق نییەکەیـم
زۆر و کەم غەیبــەتی سوڵتــان و گەدا هەق نیـیە هـەر
کــاری نـاهــەق نە هەمیشــە و نە تەقولەق نییەکەیـم
لە کتێـبی هـونــەرا ڕەسمـــی غـەڵــەت نـاکێشـین
تێکـەڵاوی زەڕی خــالیس مس و مەفــرەق نییەکەیـم
خڵتــی ڕەنــدانی ئەگــەر شــاهـ بە بێــزۆ نۆشــی
مەیلـی پـاڵێـوتە و سـاف و خەسی موتڵـەق نییەکەیـم
غــاری دونیــا بە دڵــی هیممــەتی چاکــان ئەدەیـن
فیکری ئەسپی ڕەش و ڕەختی لە زەڕی زەق نییەکەیـم
ئـاسمــان کەشتیــی خێــڵی هـونــەری زۆر شکــان
بـۆیــە متمـــانە بـە زەریـــای موعـەللەق نییەکەیـم
کـە ڕەفێـــقێ دڵــی ئێشــا بە دنــەی فیتــنە بلێــن
خۆش بە چون ئێمە بە گوێی ناکەس و ئەحمەق نییەکەیم
دژمـــن ئەر «خاجــە»! هەڵەی کرد و وتی دەیبـەخشین
وەر قسـەیشــی هەقــە ئینکـاری قســەی هــەق نییەکەیـم
بە قســەی هەق وەکــو «کۆلیــل» گەلێ گۆڕ و گومن
بۆیــە دی ڕوو لە قســەی بەرهــەق و نەستــەق نییەکەیـم

مـا نگویـــیم بـد و میـــل به نـــاحق نکنـــیم
جـــامه‌ی کس سیـه و دلق خود ازرق نکنـــیم
عیب درویش و توانگر به کم و بیش بـد است
کـار بــد مصلحت آن است که مطلق نکنـــیم
رقـــم مغلـــطه بـر دفتـــر دانـــش نـزنیـــم
ســـرّ حـــق بر ورق شعبـــده ملـــحق نکنـــیم
شـــاه اگر جرعـــه رندان نه به حرمت نوشـــد
التفـــاتـش بـه مـــی صـــاف مـروّق نکنـــیم
خـوش برانیـــم جهـــان در نظـــر راهـــروان
فکـــر اسب سیـــه و زیـــن مغـــرّق نکنـــیم
آسمـــان کشتی اربـــاب هنـــر می‌شکـنـــد
تکیـــه آن بـه که بر این بحـــر معلّـــق نکنـــیم
گر بـــدی گفت حسـودی و رفیـــقی رنجیـــد
گو تو خوش باش که ما گوش به احمق نکنیم
حافـــظ ار خصـــم خطـــا گفت نگیـــریم بر او
ور به حـق گفت جـــدل با سخن حـق نکنـــیم

دەڵێم بە دەنگی زوڵاڵ و بە ڕۆحی سەرخۆشم
کە هەر نەسیمی سوراحی حەیاتە بۆ هۆشم
نەبوو تەوێڵی خوماریٚ کە مۆنی زوهدی ریا
غوڵامی خڵتەبنۆشانی ڕەند و ڕووخۆشم
حەکایەتم نە فەقەت چوو بە ڕەندی و سووکی
ڕفانی هەم خەمی گۆچانی زولفی چون گۆشم
کە پیری مەیکەدە دەرکم لە ڕوو نەکاتەوە بەس
بە کام دەر بچم و عەشق و کام نەفرۆشم؟
نە من لە باخ و چەمەن شین لە خۆوە بوویێتم
لە باخەوانمە چەتری سەر و بەر و بۆشم
خودام شایەتە هاوڕێی ئەوم لە هەر حاڵا
چ ڕەندی مەیکەدە یا خۆ چ خەرقە بەردۆشم
غوبارى ڕێگوزەری کیمیای خۆشبەختیم
غوڵامی حەزرەتی گیانان و خاکی ئەو کۆشم
لە شەوقی نێرگزی مەست و سنەوبەری بەژنی
قەدەح گری لچی جۆ، لالەگوێن و خامۆشم
گەرەکمە ڕەنگی ریا لابەرم لە ناخی دڵ
بە قەولی «حافز» ئەشێ مەی لە کووپە دادۆشم
وتم گوناحە مەگەر پرس‌وجۆ لە «کۆلیل»ـێ
وتی مەحاڵە کە ڕەندێ بێ فەرامۆشم

سرم خوش است و به بانگ بلند می گویم
که من نسیم حیات از پیاله می‌جویم

عبوس زهد به وجه خمار ننشیند
مرید خرقه‌ی دردی کشان خوش‌خویم

شدم فسانه به سرگشتگی و ابروی دوست
کشید در خم چوگان خویش چون گویم

گرم نه پیر مغان در به روی بگشاید
کدام در بزنم چاره از کجا جویم

مکن در این چمنم سرزنش به خودرویی
چنان‌که پرورشم می‌دهند می‌رویم

تو خانقاه و خرابات در میانه مبین
خدا گواه که هر جا که هست با اویم

غبار راه طلب کیمیای بهروزی‌ست
غلام دولت آن خاک عنبرین بویم

ز شوق نرگس مست بلندبالایی
چو لاله با قدح افتاده بر لب جویم

بیار می که به فتوی حافظ از دل پاک
غبار زرق به فیض قدح فروشویم

زۆرم ئەم نوکتە بەیـان کردووە ئەمجارەش ئەڵێم
کە نە لەم رێ منی شەیـدا قەدەمی خـۆم دەنێـم
لە بەر ئـاوێنە وەکـوو تـووتی ئەکەن فێری قسـەم
هەر ئەوەم پێیە کە بەخشنـدە هەوەڵ داویە پێـم
پەیکوڵـم من ئەگە یا گـوڵ لە چەمەن عیشوەنووێن
باخـەوان چۆنی بپێـوێ بە گەزی ئـەو دەڕووێـم
دۆستـان لۆمـەیی ئەم بێـدڵە حەیـرانە مەکـەن!
گەوهـەرێکم هەیە بۆ لەعـل‌شنـاسێ دەگەڕێـم
بەم عەبـا کۆنـەوە مەی عـارە بنۆشیـن، بـەڵام
لە ریـا رەنگ دەسێنێت حـەزی کیـژی ترێـم
پێکەنیـن و غـەمی من خەڵکـی وڵاتێـکی‌ترن
کە غەزەڵ‌خوێنی شەوم، شینە سەحەرناڵە لە جێـم
کە وتی «خاجە»! نەکەی خاکی دەری مەیکەدە بۆن
بێژە بمبوورە بە بۆی موشکی خوتەن چونکە دەژێم
خـاکی مەیـخانە کلـی چـاوی فریشتـە و پەرییـە
منـی «کۆلیـل» لە شێتیـمە ئەوینـداری ئەوێـم

بارها گفته‌ام و بار دگر می‌گویم
که من دل‌شده این ره نه به خود می‌پویم

در پس آینه طوطی صفتم داشته‌اند
آن‌چه استاد ازل گفت بگو می‌گویم

من اگر خارم و گر گل چمن‌آرایی هست
که از آن دست که او می‌کشدم می‌رویم

دوستان عیب من بیدل حیران مکنید
گوهری دارم و صاحب‌نظری می‌جویم

گرچه با دلق ملمّع می گلگون عیب است
مکنم عیب کز او رنگ ریا می‌شویم

خنده و گریه‌ی عشاق ز جایی دگر است
می‌سرایم به شب و وقت سحر می‌مویم

حافظم گفت که خاک در میخانه مبوی
گو مکن عیب که من مشک ختن می‌بویم

ئێمـە بـا رایـەت و غـولامی شەهیـن
شـاریـارانی سوبحی خۆش‌نیگـەهیـن
سیـنە پڕ گەنـج و کیسە پڕ لە هــەوا
جـامی دونیـا نووێن، غوبـاری رەهیـن
هۆشیـاری حوزوور و مەستی غـورروور
خوا بە یەك ناس و نوقمی هەر گونەهین
دڵبـەری بەخت ئەگەر کریشمە بکـات
جامی بەر بووکی کوڵمی چەشنی مەهین
هـەر شـەوێ پاسـەوانی بەختـەوەری
یـاری بێـدار بەخت و کەچ‌کولەهیـن
سوحبـەتی ئێمـە بێـژە دەرفەتە بۆت
تۆ لە خەو ئێمـە مۆمـی دیـدگەهیـن
روو لە هەرکـوێ بکـات هیممـەتمـان
شـا دەزانـێ بـە سـانی چـەن سپەهیـن
کفنـی دژمـن لە خوێنی سوور دەکەین
وەك بە خوێن ئاوەدێری باخی شەهیـن
رەنگـی نەیـرنگ ئێمـە نـانـاسێ
شێـری سـوور، ئەژدەهایەکی سیەهیـن
قـەرزی «حافـز» بلێ ئـەدا فەرمـوون!
وەعـدی خۆتـانە ئێمـەشت گەوەهیـن
گیـانی «کۆلیـل» بیـدی مەجنـوونە
بۆیە سەرشۆڕی بەژنی سەروی سەهیـن

گرچه ما بندگان پادشهیم
پادشاهان ملک صبحگهیم
گنج در آستین و کیسه تهی
جام گیتی نما و خاک رهیم
هوشیار حضور و مست غرور
بحر توحید و غرقه‌ی گنهیم
شاهد بخت چون کرشمه کند
ماش آیینه‌ی رخ چو مهیم
شاه بیدار بخت را هر شب
ما نگهبان افسر و کلهیم
گو غنیمت شمار صحبت ما
که تو در خواب و ما به دیده گهیم
شاه منصور واقف است که ما
روی همت به هر کجا که نهیم
دشمنان را ز خون کفن سازیم
دوستان را قبای فتح دهیم
رنگ تزویر پیش ما نبود
شیر سُرخیم و افعی سیهیم
وام حافظ بگو که بازدهند
کرده‌ای اعتراف و ما گوهیم

هــاتییە ســەر گڵم گوڵــم فــاتیحــەیێ کە هەدیــەمان!
لێــو کەوە! من شەهیـــدی تــۆم بمدەوە سەر لە نۆ ژیــان
ئەو کەســە لێمی پرسی و خۆنــدی دوعا لە ســەرم و چوو
بێــژە دەمێ مــەرۆ هەتــا رۆحی لە شوێن دەکــەم رەوان
ئەی ئــەوە دوکتــوری دڵــی شێــتمــی بڕوانــە بە دڵ
دووکەڵی سینگ و باری غەم چەندە وەکۆن لەسەر زمــان
عەشقی ئەویــن بەڵــێ گــڕی لــەرزی لە ئێسکما بڕی
بە چەشنی تێ وەڵــی کە چوو بوو بە گڕێ لە ئێسکمــان
دڵ وەکـو خــاڵی رەش لەســەر ئاگری روومــەتت موقیم
دیـدە بە تیــری چــاوی گەش زەخمییە دینی پێ نەمــان
دابــەزێنی تــاوی دڵ بەڵکو بە ئــاوی چــاوی خۆت
نەبــزی دەســم بگــرە بــزا هیــچ لە ژیــن ئــەدا نیشــان
شووشــە شــەرابی پێــم ئەدا ئەو کەسە بەڵکو شــاد بــم
چۆنــە بە کــن تەبیب ئەبــا شووشــەیی مــن بە ئیمتحــان
شــەربەتی ئــاوی ژینی پێــم نۆشییە «خاجــە»! شیعری تۆ
فەحسی تەبیــب هیچــە هەر، هەر غــەزەڵت لە دڵ دەوان
وەسفی کولێی «عومەر» وەکوو چەپکــەگوڵێکە هەر دەنا
دەستی غــەزەڵ چلــۆن دەگا گیــانە بە بەژنــی ئاسمــان

فاتحه‌ای چو آمدی بر سر خسته‌ای بخوان
لب بگشا که می‌دهد لعل لبت به مرده جان

آن‌که به پرسش آمد و فاتحه خواند و می‌رود
گو نفسی که روح را می‌کنم از پی‌اش روان

ای که طبیب خسته‌ای روی زبان من ببین
کاین دم و دود سینه‌ام بار دل است بر زبان

گرچه تب استخوان من کرد ز مهر گرم و رفت
همچو تبم نمی‌رود آتش مهر از استخوان

حال دلم ز خال تو هست در آتشش وطن
چشمم از آن دو چشم تو خسته شده‌ست و ناتوان

بازنشان حرارتم ز آب دو دیده و ببین
نبض مرا که می‌دهد هیچ ز زندگی نشان

آن‌که مدام شیشه‌ام از پی عیش داده است
شیشه‌ام از چه می‌برد پیش طبیب هر زمان

حافظ از آب زندگی شعر تو داد شربتم
ترک طبیب کن بیا نسخه‌ی شربتم بخوان

زۆرم غـــەمـی دڵ وت بـۆ تـەبیـــبان
ڕێ نـابـەڵەد بـوون چەشنـی غـەریبـــان
ئەی گـوڵ کە هــەردەم بـایێ لەگەڵتن
بۆ عیشـــوە ناکـــەی بۆ عەنـدەلیـــبان
خـــوا ڕوخســـەتێ بـــا دیســـان ببیـــنی
چـــاوی دلاران، کولـمـــی حەبیـــبان
گەنجـــی دلاری شـــەقڵـــی شکـــاوە
یـــارەببی بشکێ ئەستـــۆی ڕەقیـــبان!
ئەی حـــاتەم ئاخـــر تا کەی لە سفـرەی
ئیحســـان بەدەر بـــم وەک بێنەسیـــبان
«حـافـــز» کە وێڵـــی شـــەوگـاری لێڵـــە
فـــووی کرد لە مۆمی لەعلـــی ئەدیبـــان
«کۆلیـــل»ـی ئێـــوەش حـــاڵی شپـــرزە
شـــەللا کە ژینگـــەی پەستـــی نەدیبـــان

چنـــدان که گفتــم غــم با طبیـــبان

درمــــان نکـــردند مسکیــن غریبــان

آن گـل که هــر دم در دست بـادی‌ست

گــو شـــرم بـــادش از عنــدلیـــبان

یـــا رب امـــــان ده تـــا بـــازبیـــند

چشـــم محبـــان روی حبیـــبان

درج محبـــت بر مهـــر خـــود نیست

یـــا رب مبــــادا کـــام رقیـــبان

ای منعـــم آخـــر بر خـــوان جـودت

تـــا چنـــد باشیـــم از بـــی‌نصیـــبان

حافـــظ نگشتـــی شیـــدای گیـــتی

گـــر می‌شنـــیدی پنـــد ادیبــــان

مـردم لە دەردی دووری، دەوری وەفــا وەگێــڕە!
بــۆ دڵ بـەڵایە دووریت، یــاڕەب بەڵا وەگێـــڕە!
مـانگی فەلــەک بە نـازۆ ئەسپی کەوەی دەگێــڕێ
با هەڵگلــێ لە شەرمـــا رەخشی سەفـــا وەگێـــڕە
زولفی خەمین پەرێشـــان فەرموو لە داخی سومبوڵ
دەوری روخت بخـــووریٚ چەشنی سەبا وەگێـــڕە
تەشریف بێـنە سەرمەست بۆ عەقڵ و دین بە نــازۆ
گۆشـــەی کڵاو لادە و چـەتـــری کـــەوا وەگێـــڕە
ئەی نووری چـــاوی مەستـــان چاوم لە رێتە جامێ!
لەعلــی بلـــوور بێـــــنە و چەنگ و نـەوا وەگێـــڕە
دۆعـــایە سـەوزی نووسی دەوران لە دەوری لێـوی
یـاڕەب لە چارەنووسی گوڵ جەوری بـــا وەگێـــڕە
«حافز»! لە کۆڕی شۆخان هەر ئەمتە بوو بە قسمەت
رازی ئەگەر بە بەش نیت حوکمی قـــەزا وەگێـــڕە
فەرمـــانی یـارە «کۆلیـل»! دڵ چوو بە چای چناکەی
جەژنی وەفـــا لە چـــاڵی(قالـــوو بـــەلا) وەگێـــڕە

می‌سوزم از فراقت روی از جفا بگردان
هجران بلای ما شد یا رب بلا بگردان
مه جلوه می‌نماید بر سبز خنگ گردون
تا او به سر درآید بر رخش پا بگردان
مر غول را برافشان یعنی به‌رغم سنبل
گرد چمن بخوری همچون صبا بگردان
یغمای عقل و دین را بیرون خرام سرمست
در سر کلاه بشکن در بر قبا بگردان
ای نور چشم مستان در عین انتظارم
چنگ حزین و جامی بنواز یا بگردان
دوران همی‌نویسد بر عارضش خطی خوش
یا رب نوشته‌ی بد از یار ما بگردان
حافظ ز خوبرویان بختت جز این قدر نیست
گر نیستت رضایی حکم قضا بگردان

یارەب ئەو مامزە بۆ دەشتی خوتەن بێنەوە باز
سەروی خۆش قامەت و بالا بە چەمەن بێنەوە باز
بە نەسیمێ بکە دەرمانی دلی مات و مەلوول
واتە گیانی لە بەدەن چوو بە بەدەن بێنەوە باز
مانگ و خۆر چۆن دەگەیێنیت بە سەرمەنزلی خۆ
مانگی ئێمەش بە شکۆی بەحری عەدەن بێنەوە باز
چاوەکانم بە حەزی لەعلی یەمانی بووە خوێن
خوایە ئەستێرەیی تابان بە یەمەن بێنەوە باز
ئەی موبارەک مەلی خۆش‌لاجە بەرەو شاهی مەلان
خەبەری دال و قەلی رووڕەش و گەن بێنەوە باز
خەبەری بۆ بەرە نیمانە کە بێ ئێوە ژیان
خەبەرێ خۆش و وەلامێکی پەسەن بێنەوە باز
ئەوکەسەی چاوی سەری «حافز»ی یارەب وەتەنە
بە دلی خۆی لە غەریبی بە وەتەن بێنەوە باز
خوایە ئەو عومرە «عومەر» سەرفی غەمی قامەتی کرد
بۆ خەمی پەرچەم و دوو زولفی بە تەن بێنەوە باز

یا رب آن آهوی مشکین به ختن بـازرسـان
وان سهی سرو خرامـان به چمن بـازرسـان
دل آزرده‌ی مـا را بـه نسیمـی بنـواز
یعنی آن جـان ز تن رفتـه به تن بـازرسـان
ماه و خورشیـد به منـزل چو به امر تو رسند
یـار مـه‌روی مرا نیـز به مـن بـازرسـان
دیـده‌ها در طلب لعـل یمـانی خون شد
یا رب آن کوکب رخشان به یمن بازرسـان
بـرو ای طـایر میمـون همـایون آثـار
پیـش عنقـا سخن زاغ و زغـن بـازرسـان
سخن این است که ما بی تو نخواهیم حیات
بشنـو ای پیک خبـر گیر و سخن بـازرسـان
آن‌کـه بـودی وطنش دیـده‌ی حافظ یا رب
به مـرادش ز غریبـی به وطـن بـازرسـان

مەچۆ تۆ خوا لەگەڵ پەشمینەپۆشان!
نەپۆشی روو لە حاسبی خڵتەنۆشان
لە ژێر ئەو دەڵقە هەر مەکر و ریایە
چ خۆشە لۆی کراسی مەیفرۆشان
لە کۆڕی سۆفییان نەمدیوە سافێ
گەوارا بێت لێڵی دڵپەرۆشان
تەبیعەت ناسکی تۆ ناکرێ پێت
لەگەڵ تەبعی گرانی خەرقەپۆشان
کە مەستت کردووم روو دامەپۆشە
بە ئێشت مەمکوژە نۆشت لە کۆشان
تەماشا چەن بە مەکر و فێڵی زاهید
سوراحی دڵ بە خوێنەو نەی خورۆشان
لە ئاخی ناخی «حافز» بێ بترسە
کە دەکولێ سینگی وەک قازانگی جۆشان
مەگەر شاهی زەحاکی، رۆحی «کۆلیل»!
کە دوو ماری رەشت دایم لە دۆشان

خدا را کم نشین با خرقه‌پوشان
رخ از رندان بی‌سامان مپوشان
در این خرقه بسی آلودگی هست
خوشا وقت قبای می فروشان
در این صوفی‌وشان دردی ندیدم
که صافی باد عیش دردنوشان
تو نازک طبعی و طاقت نیاری
گرانی‌های مشتی دلق پوشان
چو مستم کرده‌ای مستور منشین
چو نوشم داده‌ای زهرم منوشان
بیا و از غبن این سالوسیان بین
صراحی خون دل و بربط خروشان
ز دلگرمی حافظ برحذر باش
که دارد سینه‌ای چون دیگ جوشان

سەری شمشـــاڵقەدان، ســەروەری خۆش گفت و زمان
به مژۆلان که ســـەفی ســـەفشـــکەنانی گ شکـــان
نــەزەری بــوو بە هــەژار و گــوزەرا مــەست و وتــی
ئەی لە کۆڕی شوعەرا چاو و چرای هەست و بەیـــان
کیســـه خـــالّی لە زەڕ و سیـــم هەتـــاکەی؟ وەرە تـــا
بە غــولامت کــەم و بەشـــدار لە کۆی سیـملەشـــان
ســەر لە زەڕڕەی لە ئەویـن دانەبــەزی! ســەرکەوە تـا
دەچیـه نێـو خەڵوەتی خۆری گەشـی زێڕین کــەوان
مەکە بـــاوەڕ بە جەهـــان تا هەیە جـــامێکی شـــەراب
چزی لێنێ بە خۆشی رووی گوڵی رووسووری جەهان
پیـــری مەینـــۆش کە شـــا بێت، رەوانی بە بەهــەشت!
مەبە فەرمــوی بە رەفێـقـی گوڵی ســـەد وادە ئەمـــان!
دژ لە خــۆ دوورکە تــون بگرە بە دەس دامــەنی دۆس!
پیـــاوی ئەو بی نیـیە بــاکت لە فـــەن و فێـــڵی دژان
ســـوح لە نێــو باخــی گوڵاڵەم بە سەبا وت کە هەموو
ئـەم کفـــن ســـوور بە خوێنـــانە شەهیـــدانی جەفـــان
وتــی «حافــز»! من و تۆ مەحــرەمی ئــەم رازە چ نیـن
هەر لە مەی بـدوە لەگەڵ نوقڵ و مەزەی لێــوشەکەران
ئەشکی ئـــاڵ و روخی زەردی وەکو «کۆلیـل»ـم ئەوێ
گەنجی بێگەوهــەر و زێڕی کە لە بیــر نـایـه زەمـــان

شـــاه شمشـــاد قـــدان خسرو شیـــرین‌دهنـــان
که به مژگـــان شکنـــد قلب همه صف‌شکنـــان
مست بگـــذشت و نظر بر من درویش انداخت
گفت ای چشـــم و چـــراغ همه شیـــرین‌سخنـــان
تا کی از سیم و زرت کیسه تهـی خواهـــد بود
بنـــده‌ی من شـــو و برخـــور ز همه سیـــم‌تنـــان
کمتـــر از ذره نـــه‌ای پست مشو مهـــر بِـــوَرز
تا به خلوتـــگه خورشیـــد رسی چـــرخ‌زنـــان
بر جهـــان تکیـــه مکن ور قـــدحی مـی داری
شـــادی زهـــره جبیـــنان خور و نـــازک‌بدنـــان
پیـــر پیمـــانه کش من که روانـــش خـــوش بـــاد
گفت پرهیـــز کن از صحبت پیمـــان شکنـــان
دامن دوست به دست آر و ز دشمـــن بگســـل
مـــرد یـــزدان شو و فـــارغ گذر از اهـــرمنـــان
بـــا صبـــا در چمـــن لالـــه سحـــر می گفتـــم
که شهیـــدان کـه‌اند این همه خونیـــن کفنـــان
گفت حافـــظ من و تو محـــرم این راز نـــه‌ایم
از مـــی لعـــل حکـــایت کن و شیـــرین‌دهنـــان

بەهــارە گــوڵ بە کەنیــنــێ شکــانی تۆبەکەمــان
غەمــێ نەمــا لە دڵا عەشقــی گوڵ لە گیانی جەمان
گەیــی نەسیمــی سەبــا خونچــە چوو بە پێشــوازی
لە ســەر چ هۆش و لەبــەر تیکەیێ کراســی نەمــان
لە بەژنــی ســـەروی چەمــەن، بگرە دابــی سەربەرزی
بــە ئــاوی رۆشنــی دڵ رێ بنــاســە! وەک دییەمــان
سەبــا بە کەیفی هونــەر کاکــوڵی گوڵــی لە دەسـا
دەمێ کە پەرچەمی سومبوڵ لە سەر چەمەن دەچەمان
بە چەشنــی بووکی بەخت خونچە هاتە دەر لە حەرەم
کە دڵ ببــات لەبــەر چـــاو و دیــن بنێــتە زەمــان
ســـەدای بولبــولی شەیــدا خورۆشی تەیری سەحەر
لە عەشقــی گوڵ بە دەراتن لە ناخ و نووکی خەمــان
قســە و حەکــایەتی ئازیز و جامی مەی خۆش کەن
بە شیعری «حافز»و قەولی بە هێــزی پیــری زەمــان
لە تیــری نـــاز و کــەوانی بــرۆ مەڵــێ «کۆلیــل»!
کە رۆحی دەوڵــەتی بــارامی گــۆر دێتــە ئەمــان

بهـــار و گل طـــرب‌انگیز گشت و توبه‌شکـــن
به شـــادی رخ گل بیـــخ غـــم ز دل بـر کـن
رسیـــد بـــاد صبـــا غنچـــه در هـــواداری
ز خود بـــرون شـــد و بر خـــود درید پیراهـــن
طـــریق صـــدق بیـــاموز از آب صـــافی دل
بـــه راستـــی طلـــب آزادگـــی ز ســـرو چمـــن
ز دستـــبرد صبـــا گـــرد گل کُـــلاله نگـــر
شکنـــج گیســـوی سنـــبل ببین به روی سمـــن
عـــروس غنچـــه رسید از حـــرم به طـــالع سعـــد
بـــعینـــه دل و دیـــن می‌بـــرد به وجـــه حســـن
صفیـــر بلبـــل شـــوریده و نفیـــر هـــزار
برای وصـــل گل آمـــد بـــرون ز بیت حـــزن
حـــدیث صحبت خوبـــان و جـــام بـــاده بگو
به قـــول حافـــظ و فتـــوی پیـــر صاحب فـــن

گوڵئاسا تا بە دامەن پێخە پارە
دەکەم هەردەم بەهۆی عەشق و پەژارە
کراسی گوڵ وەکوو مەستان دڕیوە
لە باخان بەژنی دیوی وا دیارە
دڵت راحەت رفان و سەختە رۆحیش
نەبا خێڵی غەمت وەک ئەو هەژارە
نەبێ یارەب کەسێ دژمن بە دۆسی
وەکوو یارم لەگەڵ کۆڕی نەیارە
لە نوقرەی سینەدا دڵ چەشنی پۆلا
لە جامی جامە لەش چون مەی دیارە
کە رۆشن بوو لە خەڵکی سۆزی گیانت
لە چاو ئەی مۆمی فرمێسک ببارە
مەکەن! ئەینا لە ناخم ئاخی دڵسۆز
وەدەر دێ وەک لە تەندووری شەرارە
دڵم مەشکێنە، پێشێلی مەفەرموو!
کە ماڵ و مەنزڵی زولفی شەوارە
دڵی «حافز» کە بەستەی پەرچەمی تۆن
بە سووکی مەگرە، جێگەی ئیفتیخارە
مەگەر کافر دەبی جارێ بە «کۆلیل»
لە چاوت مەرحەمەتکەی یەک ئیشارە؟!

چو گل هـــر دم به بـویت جـامه در تـن

کنـم چـــاک از گریبـــان تـــا به دامـن

تنـــت را دیـــد گل گویـــی که در بـــاغ

چـو مستـــان جـــامه را بـدریـــد بر تـــن

من از دست غمــــت مشکــل برم جــــان

ولـــی دل را تـــو آســـان بـــردی از مـــن

به قـــول دشمنـــان برگشتـــی از دوست

نگـــردد هیــــچ کس دوســـت دشمـــن

تنـــت در جـــامه چـــون در جـــام بـــاده

دلـــت در سینـــه چـــون در سیـــم آهـــن

ببــار ای شمــع اشک از چشم خونیـــن

کــه شـــد ســـوز دلت بر خلــق روشـــن

مکـــن کــز سینـــه‌ام آه جگـــرســـوز

بـــرآیـــد همـــچـــو دود از راه روزن

دلـــم را مشکـــن و در پـــا میـــنداز

کــه دارد در ســـر زلـــف تـــو مسکـــن

چـو دل در زلــف تو بستــه‌ست حافــظ

بدیـــن‌ســـان کـــار او در پـــا میفکـــن

خێوەتی سوڵتانی گوڵ هەڵدا لەسەر سەحنی چەمەن
هاتنی یارەب موبارەك بێ لە سەرو و یاسەمەن
ئەم نزوولی خوسرەو ئاسایەت گەلێ شیرین بوو
چون دەناسێ هەرکە شوێنی خۆ لە کۆڕ و ئەنجومەن
بۆ نگینی جەم بەرن مۆژدەی سەرەنجامی بەخێر
ئیسمی ئەعزەم وا نەجاتی دا لە دەستی ئەهریمەن
تا ئەبەد ئەم ماڵە ئاوا بێ کە دێنێ هەر نەفەس
عەتر و بۆی رەحمان لە ئەو ماڵەم، شەماڵی کۆی یەمەن
شەوکەت و تێخی جەهانگیری کوڕی ئەفراسیاب
بوو بە شانامە و حەکایەت، فەخری لاوانی وەتەن
ئەسپی توند و تیژی چەرخت چون لە ژێر زین رامە، ئەی
شاسواری لاوی مەیدان گۆی دڵم فەرموو پەسەن!
ئاوی رووباری رەوانی مەملەکەت شمشێری تۆن
وا نمامی عەدڵ ئەبێ شین، زوڵمی زاڵم ریشەکەن
شك نەکەی ئیدی ئەگەر بێژم لە بۆی خۆشی خدەت
دەشتی (ئیزە)م بوو بە کانی موشکی تاتار و خوتەن
چاوەڕێی جیلوەی جەماڵی تۆم لە سووچێکا، دەسا
لادە رووبەند و کڵاوی کەچ لەسەر ئەبرۆ مەخەن!
پرسی عەقڵم کرد ئەڵێ ئاوی ژیان کیژی ترێن
تێکە مەی ساقی بە «خاجە»و عەقڵ ئەگەر باوەڕ دەکەن
ئەی سەبا عەرزم بە مەیگێڕی (ئەتابەك) بێژە تا
پێم بدا لەو جامە زێڕینەی قومێ سینگم خەفەن
پڕ بە دڵ «کۆلیل»ەکەی ساڵانم و سالاری غەم
چون وەکوو جاران پەلاماری دڵم عەشقت ئەدەن

افسر سلطان گل پیدا شد از طرف چمن
مقدمش یا رب مبارک باد بر سرو و سمن
خوش به جای خویشتن بود این نشست خسروی
تا نشیند هرکسی اکنون به جای خویشتن
خاتم جم را بشارت ده به حسن خاتمت
کاسم اعظم کرد از او کوتاه دست اهرمن
تا ابد معمور باد این خانه کز خاک درش
هر نفس با بوی رحمان می‌وزد باد یمن
شوکت پور پشنگ و تیغ عالم‌گیر او
در همه شهنامه‌ها شد داستان انجمن
خنگ چوگانی چرخت رام شد در زیر زین
شهسوارا چون به میدان آمدی گویی بزن
جویبار ملک را آب روان شمشیر توست
تو درخت عدل بنشان بیخ بدخواهان بکن
بعد از این نشکفت اگر با نکهت خلق خوشت
خیزد از صحرای ایذج نافه‌ی مشک ختن
گوشه‌گیران انتظار جلوه‌ی خوش می‌کنند
برشکن طرف کلاه و برقع از رخ برفکن
مشورت با عقل کردم گفت حافظ می بنوش
ساقیا می ده به قول مستشار مؤتمن
ای صبا بر ساقی بزم اتابک عرضه دار
تا از آن جام زرافشان جرعه‌ای بخشد به من

خـۆش‌تر ئـەی گوڵ لە مەی و جام لە ئەم ژینگەیە چین
کـێ دەزانـێ کە سـەرەنجـام لە ئەم ژینگـەیە چیـن
غەمـی دڵ چەنـدە بنۆشیـن کـە ئـەییـام نـەمـا
گـەر نـە دڵ بێـت و نە ئەییـام، لە ئەم ژینگـەیە چیـن
غەمی خۆی بێ! مەلی بێ‌حەوسەڵە، فەرمـوو کە بـەزەی
ئـەوە دەیخـاتـە ملـت دام لە ئەم ژینگـەیە چیـن
مەی وەخـۆ چـاکە نە غـەم وەعزی نەزان مەژنەوە هەی!
بیـر و بـڕوا بە قسـەی خـام لە ئەم ژینگـەیە چیـن
بەرهـەمی کار وەهـا چـاکە بکـەی سەرفی بە کـام
خەرجی دەس‌ڕەنـج بە ناکـام لە ئەم ژینگـەیە چیـن
دوێنـەشـەو پیری موغان حەو خەتی جامی حەل‌ئەکرد
مـەبـەسـی ئـەووەڵ و ئەنجـام لە ئەم ژینگـەیە چیـن
بردم ئاخـر بە دەف و عـوود و غـەزەڵ، «خاجە» لە رێ
تـۆڵـەم ئاخـۆ کە لە ئاکـام لە ئەم ژینگـەیە چیـن
جـێ لە خـاڵ و خەت و خاڵی لە خەیـاڵ و غـەمـی تۆ
منـی «کۆلیـل» تـەمـەنـام لە ئەم ژینگـەیە چیـن

خـوش‌تر از فکـر می و جـام چه خواهـد بودن
تـا ببیـــنم کـه سـرانجـــام چه خواهــد بودن
غـــم دل چنـــد توان خورد که ایـام نمانــد
گـو نه دل بــاش و نه ایـــام چه خواهــد بودن
مرغ کم‌حوصله را گو غـــم خود خـور که بر او
رحـم آن کس که نهـد دام چه خواهــد بودن
بـــاده خور غـــم مخور و پنـــد مقلد منـیوش
اعتـــبار سخـــن عـــــام چه خواهــد بودن
دست‌رنـج تو همـــان به که شود صرف به کـام
دانی آخـــر که به نـاکـــام چه خواهــد بودن
پیـــر میـــخانه همی‌خوانـــد معمـــایی دوش
از خـط جـــام که فرجــــام چه خواهــد بودن
بـردم از ره دل حافـظ به دف و چنگ و غـزل
تـا جــــزای من بدنـــــام چه خواهــد بودن

بڕوا کە بەخت و سامان روخساری یار دینە
دانانی تاجی شایی بە سوالّی کۆی ئەوینە
ئاسانە گیانی شیرین دەرچێ لە لەش، بەلاّمێ
بڕیان لە دۆسی گیانی دژوار و ناشرینە
پێم خۆشە بچمە گولزار دلّتەنگ چەشنی خونچە
بدڕم کراسی پاکی وەختی کەوا بڕینە
گا پەی دەبەم بە رازی ژوانی مەلی بەیانی
گا وەک نەسیم بۆ گولّ ئەسرار دەربڕینە
ئەووەلّ بکەی لە لێوی لەعلی نیگار ماچێ
ئاخر دەنا پەشیمان هەر کاری لێوگەزینە
دیداری گولّ لە دەستت با دەرنەچێ، کە دەرچوو
ئەم چۆڵە دوو گوزەرگا بڕیاری یەکنەدینە
هەر وەک لە یادی شاهم چوویێت یادی «حافز»
یارەب وەبیری لوتفی بێنا! کە ئێمە بینە
یارەب لە (گوێزەکان)و (بالوول)ی(شەمسە) باسێ
«کۆلیل» چون بە چەشنی دێوانە گەرمی شینە

دانـــی که چیست دولت دیـــدار یار دیـــدن
در کـــوی او گـــدایی بر خسروی گزیـــدن
از جـــان طمـع بریـــدن آســـان بود ولیکن
از دوستـــان جـــانی مشکل تـــوان بریـــدن
خواهـم شدن به بستان چون غنچه با دل تنـگ
وآن‌جـا به نیـک‌نـامی پیـراهنی دریـــدن
گه چـون نسیـــم بـا گل راز نهفتـــه گفتـن
گه سـّـر عشـق‌بـازی از بلبـــلان شنیـــدن
بوسیـــدن لب یـــار اول ز دست مگـــذار
کآخر ملـول گردی از دست و لب گزیـــدن
فرصت شمـــار صحبت کز این دوراهـه منـزل
چون بگـــذریم دیگر نتـــوان به هـم رسیـــدن
گـــویی برفت حافـــظ از یـــاد شـــاه یحیـی
یـــا رب به یـــادش آور درویـش پروریـــدن

منـــم کە شـــۆرەتی شـــارم بە عەشـــق و دڵـــداری
منـــم کە پـــاکە گـــلارم لە خڵتی گـــەن کـــاری
وەفـــا دەکـــەم بە بەڵێـــن و مەلوولی مەلامەت نیـــم
بە دینـــی ئێمـــە لە دڵبـــەر کە کوفـــرە بێـــزاری
لە پیـــری مەیـــکەدە کـــردم سوئالی ڕێگەنەجـــات
وتـــی پییـــاڵە بـــەدەس: تەرکـــی شوغڵـــی شۆفـــاری
بە دەستی خەڵکی دییەم گوڵچنیـن لە روخســـارت
مورادی دڵـــمە لە باخـــی جەهـــان و گوڵـــزاری
بە مـــەی‌پەرەستـــی ئەدەم نەخشی خۆ بە ئاوا، چـــون
لە خۆپـــەرەستـــی ئەشـــۆمـــۆ دەروونـــی رزگـــاری
دڵـــم بە کۆمـــەکی زولفـــت مەگەر بگـــا بە مـــەرام
خەبـــاتی ئـــەو چیـــیە ئـــەم گـــەر نەکـــا گرفتـــاری
دەڕۆمـــە مەیـــکەدە ئەم کـــۆڕی وەعـــزە جێ‌دێڵـــم
لـــە بێ‌عـــەمـــەل کە دەبیســـم وتـــاری مـــۆژاری
لە دەوری روومـــەتی دڵبـــەر لە مەشقـــی دایـــەرەدام
بە عەشقـــی خـــاڵییە فێـــرم بە دەوری روخســـاری
لە لێـــوی ســـاقی و جـــامی بچێـــنە «حافز»! مـــاچ
نە دەستـــی زاهیـــدی تەقـــوافـــرۆشـــی نێوشـــاری
نە ژێـــری ســـەرجەمە «کۆلیـــل» یا نە شێـــتی پەتـــی
موریدی ئەهلـــی تـــەریقـــم نە شێخـــی دەربـــاری

منـــم که شهـره‌ی شهـــرم به عشق ورزیـــــدن
منـــم که دیـــده نیـــــالــودم به بـــد دیـــدن
وفـــا کنـیم و مـــلامت کشیم و خوش باشیم
که در طریقـــت مـــا کافـــری‌ست رنجیـــدن
به پیـــر میکـــــده گفتم که چیست راه نجـات
بخواست جـام مـی و گفت عیب پوشیـــدن
مراد دل ز تمـــاشـــــای بـــاغ عـــالـم چیست
به دست مردم چشـــم از رخ تـو گل چیـــدن
به مـی پرستـی از آن نقش خود زدم بـــر آب
که تا خـــراب کنـــم نقش خود پرستیـــدن
بـه رحمـــت ســـر زلـف تـو واثقـــم ورنـه
کشش چو نبود از آن سو چه سود کوشیـــدن
عنـــان به میـــکده خواهیـم تافت زین مجلس
که وعـــظ بی‌عمـــلان واجب است نشنیـــدن
ز خـــط یـــار بیـــاموز مهـــر بـا رخ خـوب
که گرد عارض خوبان خوش است گردیـدن
مبـــوس جـز لب ســـاقی و جام مـی حافـــظ
که دست زهـــدفروشـان خطـاست بوسیـــدن

ئەی کوڵمی چەشنی مانگی ئەتۆ نۆبەهاری حوسن
خـاڵ و خەتت هەواری جەماڵ و مەداری حوسـن
سیحـر و فوسـون رووەوە لە چـاوی خومـارتـان
لـەو زولفـە بێقـەرارە پەیـا بوو قـەراری حوسـن
وەك تـۆ لـە ئاسمـانی ئەویـن رۆژ هەڵنـەهـات
بـاڵای هەڵنـەچوو وەکـو بەژنت چنـاری حوسـن
شیـرین بەهـۆی جووانی ئەتـۆ دەوری دڵبـەری
رۆشـن بە لوتفی شەوقی بزەت رۆژگـاری حوسـن
داوی کەزێـت و دانـەیی خـاڵت لـە هـەر وڵات
چی تەیری دڵ بو کردی بەجارێ شکاری حوسـن
پەروەردە ئێـوە داکـی تەبێعـەت ئـەکـا بـە نـاز
دایـم بە سۆزی گیانی، لە کۆش و کەناری حوسـن
ئـاوی حەیـاتنۆشـە وەنـەوشـەت لە دەوری لێو
وا شیـن و شـادمـانە لەسـەر جۆیبـاری حوسـن
پێـت وا نەبێ کە «خاجـە» دەلالێـکی چەشنـی تـۆ
پەیـدا بکـا لە عـالـەمی بـوون و دیـاری حوسـن
«کۆلیـل» و سیحری شیعـر و بەیان و شنەی غەزەڵ
لاڵـن لە کۆی بەیـانی شکـۆی شاسواری حوسـن

ای روی ماه منظر تو نوبهار حُسن
خال و خط تو مرکز حسن و مدار حُسن
در چشم پرخمار تو پنهان فسون سحر
در زلف بیقرار تو پیدا قرار حُسن
ماهی نتافت همچو تو از برج نیکویی
سروی نخاست چون قدت از جویبار حُسن
خرم شد از ملاحت تو عهد دلبری
فرخ شد از لطافت تو روزگار حُسن
از دام زلف و دانه‌ی خال تو در جهان
یک مرغ دل نماند نگشته شکار حُسن
دایم به لطف دایه‌ی طبع از میان جان
می‌پرورد به ناز تو را در کنار حُسن
گرد لبت بنفشه از آن تازه و تر است
کآب حیات می‌خورد از جویبار حُسن
حافظ طمع برید که بیند نظیر تو
دیار نیست جز رخت اندر دیار حُسن

روومـەت نهێن بە سومبولی بۆنخۆش و خاو کە!
داپۆشـە واتـە کولـّم و جەهانێ خـراوکـە
ئـارەق لە روو بڕێـژن و گولزاری رووت وەك
شووشـەی گـلاری ئێمـە شـەواوی گولاوکـە
رۆژانی گـولّ بە چەشنی تەمەن چوو بە تاو، تۆش
مەیگێـڕ زوو بـە جامـی گولّین پڕ لە تـاوکـە
هەلّبێـنە چـاوی مەست و خومـارت بە ناز و جا
چـاوی حەسـوودی نێرگزی فیـزن رەچـاوکـە
هەلّبمژە بۆی وەنەوشە، لە دەس بگرە زولفی یار!
بڕوانـە رەنگـی لالـە خەیـالّی شـەراوکـە
داب و نەریتـی ئێـوە کە عاشق کوژیـن، قـەدەح
پڕپڕ لە مـەی کە! بۆ دژ و جەرگم کـەواوکـە
بخشێـنە چەشنـی تۆقلـە لەسـەر جام چاوی دلّ
بنچینـەی ئـەم جـەهـانە حوبـابێ حەسـاوکـە
«حافــز» لە رێی دوعاوە دەکـا مەیلی وەسلەتێ
یـارەب رجای خەستـەدلاّن خۆش جوواوکـە
«کۆلیل»ـی تۆوی عەشقـە زەمیـن و گلّی دلّـم
بۆ بەرهـەمێ پتـر بە شـەراوی کەشـاوکـە

گلبرگ را ز سنبل مشکین نقاب کن

یعنی که رخ بپوش و جهانی خراب کن

بفشان عرق ز چهره و اطراف باغ را

چون شیشه‌های دیده‌ی ما پر گلاب کن

ایام گل چو عمر به رفتن شتاب کرد

ساقی به دور باده‌ی گلگون شتاب کن

بگشا به شیوه‌ی نرگس پرخواب مست را

وز رشک چشم نرگس رعنا به خواب کن

بوی بنفشه بشنو و زلف نگار گیر

بنگر به رنگ لاله و عزم شراب کن

زآن‌جا که رسم و عادت عاشق‌کشی توست

با دشمنان قدح کش و با ما عتاب کن

همچون حباب دیده به روی قدح گشای

وین خانه را قیاس اساس از حباب کن

حافظ وصال می‌طلبد از ره دعا

یا رب دعای خسته‌دلان مستجاب کن

ساقی بەیانە هەستە قەدەح پڕ گولاو کە
گەردون لە سووڕە زوو بە! تەمەن خۆش تەواو کە
زووتر لەوەی کە عالەمی خاکی خراو بێ
بەو جامە گوڵ جەمینە دەروونم خراو کە
هەڵچوو لە خۆرهەڵاتی سوراحی هەتاوی مەی
خەو بەستە هەستە بۆ مەزە گیانم کەواو کە
رۆژێ کە چەرخ ئەکا بە کەل‌وپەل کەلاکمان
کاسەی سەرم دەخیلە بە کووپەی شەراو کە
من ئەهلی وەرع و تۆبە لە گوڵزاری راز نیم
وەک عاشقی شەرابی خۆلاسەم حەساو کە
کاری سەواو بادە لەسەر نانە «حافز»!!
سا هەستە قەستی کار و مەبەستی سەواو کە
«کۆلیل»! ئەشکی ئێوە لە نەسڵی شەرابە وا؟
دڵبەر دەڵێ کە مەست و خراوم بە چاو کە

صبح است ساقیا قدحی پرشراب کن
دور فلک درنگ ندارد شتاب کن

زان پیش‌تر که عالم فانی شود خراب
ما را ز جام باده‌ی گلگون خراب کن

خورشید می ز مشرق ساغر طلوع کرد
گر برگ عیش می‌طلبی ترک خواب کن

روزی که چرخ از گل ما کوزه‌ها کند
زنهار کاسه‌ی سر ما پرشراب کن

ما مرد زهد و توبه و طامات نیستیم
با ما به جام باده‌ی صافی خطاب کن

کار صواب باده‌پرستی‌ست حافظا
برخیز و عزم جزم به کار صواب کن

لە حەوشە بێرە سەر و شەوسەرا مونەووەر کە
دەماخی مەنزڵی ڕۆشن‌دڵان موعەتتەر کە
مەلا نەسیحەتی کرد ئەر، نەکەی کە عاشق بی!
پییاڵەیێ بدە پێی و بڵێ دەمێ تەڕ کە
لە تاقی دیدەیی گیانانە من دڵ و گیانم
دە زووبە زوو وەرە! سەیرێکی تاق و مەنزەر کە
هەسارەکەم شەوی دووری گزینگ و نووری نەما
هەتاوی روو بکە ڕۆشن لە کۆشک و شەو دەرکە
بە دەرکەوانی بەهەشتێ بڵێ کە خاکی مە
بە ڕەسمی هەدیە لە جەننەت بە عوود و عەمبەر کە
لە ئەم کڵاو و عەبا کۆنە یاس و دڵتەنگم
بە ئەو کریشمەیە شۆخانەتم قەڵەندەر کە
کە شۆخەکانی گوڵستان کەنیزی جوانیتن
ئیشارە بۆ سەمەن و ناز بۆ سنەوبەر کە
فزوولمایە حەکایەت گەلێ دەکا مەیگێڕ!
لە دەستی خۆت نەدەی کار و مەی لە ساغەر کە
عەقڵ بە نووری جەماڵت بڕا تروسکی لە چاو
دە هەستە خێوەتی خۆری دییەم مونەووەر کە
تەماحی قەندی ویساڵت لە شانی ئێمە کە نین
دڵم حەواڵە بە دوو لێوی کانی شەککەر کە
لە لێوی جام بنێ ماچ و جا بە مەستان مەی
بە ئەم لەتیفە حەریفان دەماخ گوڵبەر کە
بەجێ لە مەجلیسی نۆش و ئەوینی نازاران
دەرون لە جەوهەری «حافز» بە کانی گەوهەر کە
دڵم بە باوەڕی عەشقت گەییوە چون «کۆلیل»
کە نیتە باوەڕی عەشقم دڵت بە داوەر کە

ز در درآ و شبستان ما منور کن
هوای مجلس روحانیان معطر کن
اگر فقیه نصیحت کند که عشق مباز
پیاله‌ای بدهش گو دماغ را تر کن
به چشم و ابروی جانان سپرده‌ام دل و جان
بیا بیا و تماشای طاق و منظر کن
ستاره‌ی شب هجران نمی‌فشاند نور
به بام قصر برآ و چراغ مه بر کن
بگو به خازن جنت که خاک این مجلس
به تحفه بر سوی فردوس و عود مجمر کن
از این مزوّجه و خرقه نیک در تنگم
به یک کرشمه‌ی صوفی‌وشم قلندر کن
چو شاهدان چمن زیردست حسن تواند
کرشمه بر سمن و جلوه بر صنوبر کن
فضول نفس حکایت بسی کند ساقی
تو کار خود مده از دست و می به ساغر کن
حجاب دیده‌ی ادراک شد شعاع جمال
بیا و خرگه خورشید را منوّر کن
طمع به قند وصال تو حد ما نبود
حوالتم به لب لعل همچو شکّر کن
لب پیاله ببوس آنگهی به مستان ده
بدین دقیقه دماغ معاشران تر کن
پس از ملازمت عیش و عشق مه‌رویان
ز کارها که کنی شعر حافظ از بر کن

ئەی نووری چاوم ئەم قسە وەک دورِ لە گۆش کە
تا جــام پڕ شــەرابە لەگــەڵ یــاری نــۆش کــە
دێــوی فریــو زۆرە ئەگــەرچی لە رێــی ئەویــن
کۆڵ هەر نەدەیت و گوێ لە کریشمەی سرۆش کە
بەرگی تەمــەن شــڕی شــڕ و ســازی ژیــانە کپ
ئەی چەنگ خۆش بناڵە لەگەڵ دەف خورۆش کە
تەزویــح و خەرقــە قودرەتــی مەستیت نــادەنێ
چـــاوی مــەدەد لە دەستی وزەی مەیفــرۆش کە
پیــران وەکوو وتــوومە دڵاوان و خــۆشبەیــان
پیــر بی ئەتــۆش رۆڵە لە گوێ پەندی خــۆش کە
سامـــان و گەنــج حەیفــە درێغــی لە دۆستـــان
سەد گیـــان فیــدات گیانە! قسەی من لە گۆش کە
زولفــی ئەویـــن کەمەنــدی سەری هۆشیــار نین
پێــت خۆشە کەویە داوی، لە سەر تەرکی هۆش کە
ســاقی هەمیشە جــامی دەست پڕ لە لەعلی ساف!
چـــاوی سەخـــاوەتێ لــە منــی خڵتــەنــۆش کە
تەڕپۆش و مەست، خێــرە بە لاما کە دێــی دەڕۆی
مــاچــێ خەڵاتــی «حافــز»ی پەشمیــنەپــۆش کە
«کۆلیـــل» و زامـــداری بـــزەی لێــوەکــانتــم
خەڵکی شــاری هەڵەبجــەیە دڵخۆشی جۆش کە

ای نور چشم من سخنی هست گوش کن
چون ساغرت پر است بنوشان و نوش کن

در راه عشق وسوسه‌ی اهرمن بسی‌ست
پیش آی و گوش دل به پیام سروش کن

برگ نوا تبه شد و ساز طرب نماند
ای چنگ ناله برکش و ای دف خروش کن

تسبیح و خرقه لذت مستی نبخشدت
همت در این عمل طلب از می فروش کن

پیران سخن ز تجربه گویند گفتمت
هان ای پسر که پیر شوی پند گوش کن

بر هوشمند سلسله ننهاد دست عشق
خواهی که زلف یار کشی ترک هوش کن

با دوستان مضایقه در عمر و مال نیست
صد جان فدای یار نصیحت‌نیوش کن

ساقی که جامت از می صافی تهی مباد
چشم عنایتی به من دُردنوش کن

سرمست در قبای زرافشان چو بگذری
یک بوسه نذر حافظ پشمینه‌پوش کن

کریشمەیێ بکە بـێ! سیحر و ساحیری جەم کە
بە نـاز رەونەق و نێـوبانـگی سامیـری جەم کە
کلاو کـەچ کـە بـە ئایینـی گـەورەیی واتـە
کە، لارەپێـچی جووانی بە دڵبـەری جەم کە
بە زولـف بێـژە کە شێـوازی سـەرکەشی دانێ
بە عیشـوە بێـژە سپـاهی ستەمگـەری جەم کە
بـە نـاز دەرکـەوە بڕفێـنە گـۆ بە سـالاری
لە روو فریشتـە بەرە و حورمەتی پـەری جەم کە
بە مامـزی دییـە شێـری هەتـاو بگرە گولـم
خەمێ بە جووتە برۆ خەو کەوانی مشتەری جەم کە
کە عەتری پەرچـەمی سومبول سەبـا دەکات بڵاو
دەم و دوکانی بە دوو زولفـی عەمبـەری جەم کە
فەخـر دەکا بە فەساحەت کە بولبول ئەی «حافز»!
ئەتۆ بە شیعری دەری قەدری گەوهەری جەم کە
غـەزەڵ لە بەژنـی ئەبـارێ دەخیـلە سا «کۆلیل»!
لە سـەر خەیاڵ و دنەی شیعـر و هۆنەری جەم کە

کرشمه‌ای کن و بازار ساحری بشکن
به غمزه رونق و ناموس سامری بشکن
به باد ده سر و دستار عالمی یعنی
کلاه گوشه به آیین سروری بشکن
به زلف گوی که آیین دلبری بگذار
به غمزه گوی که قلب ستمگری بشکن
برون خرام و ببر گوی خوبی از همه کس
سزای حور بده رونق پری بشکن
به آهوان نظر شیر آفتاب بگیر
به ابروان دوتا قوس مشتری بشکن
چو عطرسای شود زلف سنبل از دم باد
تو قیمتش به سر زلف عنبری بشکن
چو عندلیب فصاحت فروشد ای حافظ
تو قدر او به سخن گفتن دری بشکن

بـــالآی بـــەرز و نـــازی گولـــی فیـــلّسازی من
کۆتـــای کرد بـــاسی لـە مێـــژینـە رازی من
ئەی دڵ ئەشا لە کـاتی کەنەفتیم و عیلم و دین
چـم پێـــدەکات چاوی ئەوین، شۆخ بـازی من
ئیمـــانچوونە ترســـی دەروونـــم، دەبـات چـون
قەوســـی بـــرۆی، مەبەستی نوویـژی نیـازی من
خەرقـــەی ریـــا وتم کە دەپۆشـێ ئەوینی دڵ
جاسووسـی چاوە لابەری پەردەی حیجازی من
ئازیـــز مەستــە فیکـری کەسـانی لە ســەر نییە
یـادی بەخێـــر ساقیـیە هەر، کەسنــەوازی من
کــەی ســـروە بێ خـودایە کە بۆی لوتفی بێتە
عەتـــری دەمـــاغ و چارەگـەر و کارسازی من
ئەشکـــی ریـــا دەرێـــژم ئەمێستـــاکە شینـــمە
تـا کــەی بێ بە یـاری حەقێـقەت مەجـازی من
وەك شــەم بە پێـکەنیــنەوە شیــوەن دەکـەم بزا
چۆن نەرم ئەکات قەلبـی رەقت سۆز و سازی من
زاهیـــد کە نوێـژی ئێـوە نەبوو چارەسازی کار
بـــردی پەنـــا بە بـــادە شـــەوانی نیـــازی من
«حافـــز» بە شیـــن تـوواوە، خەبـەر با سەبا بەرێ
بۆ شـــاریـــاری یـار و نەیـــاران گـودازی من
وەك سەقری (بازیان) و هەڵۆی (بەردە قارەمان)
دژمـــنڕفێـــنە چـــاوی شەهێـنی بەنـــازی من

بـــالابلنـــد عشـــوه‌گر نقـــش‌بـــاز مـن
کوتـــاه کـرد قصـــه‌ی زهـــد دراز من
دیــدی دلا که آخر پیری و زهد و علم
با من چه کرد دیـــده‌ی معشـوقه‌بـــاز من
می‌ترســـم از خـــرابی ایمـــان که می‌برد
محــراب ابـــروی تو حضـــور نمـــاز من
گفتـــم به دلـــق زرق بپوشـــم نشان عشق
غمـــاز بود اشک و عیـــان کـــرد راز من
مست است یـــار و یـــاد حریفان نمی‌کنـد
ذکرش به خیـــر ســـاقی مسکیـن‌نواز من
یـــا رب کی آن صبـــا بوزد کز نسیم آن
گردد شمـــامه‌ی کرمش کـــارســـاز من
نقشی بر آب می‌زنـــم از گریـــه حالیـــا
تا کـی شـود قریـــن حقیقت مجـاز من
بر خود چو شمع خنده‌زنان گریه می‌کنم
تا با تو سنگ دل چه کند سوز و ســاز من
زاهـــد چو از نمـــاز تو کـــاری نمی‌رود
هـــم مستـــی شبـــانه و راز و نیـــاز من
حافظ ز گریه سوخت بگو حالش ای صبا
با شـــاه دوست‌پـــرور دشمن‌گـــداز من

خاکی بەر پێ و دامەنیشی بم لە من بێزارە هەر
گەر بڵێم بۆ دڵ سەفایێ ئەو جەفا بڕیارە هەر
چەشنی گوڵ کولمی نیگارینی دەبینێ هەرکەسێ
گەر بڵێم بیپۆشە دەیپۆشێ لە ئەم بێچارە هەر
وتمە چاوی خۆ، بە جارێ تیر بکەن سەیری! وتی
چۆمی خوێن جاری لە چاوانم دەکا ئەمجارە هەر
ئەو بە ژینم دژمن و من لێوی ئاوی ژینمە
فەخرە بۆم رێکەوتی هەر کامێ لە ئەم دوو کارە هەر
چەشنی فەرهادم بە تاڵی گیان بەدەر بێ خۆشە چون
داستانی عەشقی شیرینم لە شوێن تۆمارە هەر
گەر وەکوو مۆمی لەبەر بمرم کەنینی گوڵ دەکا
وەر بکەم ئۆفی لە دەس ڕەنجاوە لێم دووبارە هەر
بۆ دەمی ڕۆحم عەزیزان داوە بڕوانن کە چەن
خۆش دەشارێتۆ گوڵی زاری لە ئەم کڕیارە هەر
«حافز»! هێور بە! دەرسی غەم ئەگەر بەم شێوە بێ
دەفتەری عەشقم حەکایەتبێژی لادێ و شارە هەر
داستانی عەشق و ریسوایی دڵی «کۆلیل»ی من
ئێستە شانامە و (ئەلیف لەیلا) لە هەر گۆڤارە هەر

چون شوم خـاک رهش دامـن بیفشـاند ز من
ور بگـویـم دل بگـردان رو بگـرداند ز مـن

روی رنگین را به هـر کس می‌نماید همچو گـل
ور بگویـم بـازپوشـان بـازپوشـاند ز مـن

چشـم خود را گفتم آخر یک نظر سیرش ببین
گفت می‌خواهی مگر تا جوی خون رانـد ز مـن

او به خونـم تشنه و من بر لبش تـا چـون شـود
کـام بستـانم از او یـا داد بستـاند ز مـن

گر چو فرهـادم به تلخی جـان برآید باک نیست
بس حکایت‌هـای شیـرین باز می‌مـاند ز مـن

گر چو شمعش پیش میرم بر غمم خنـدان شود
ور برنجـم خاطـر نـازک برنجـاند ز مـن

دوستـان جـان داده‌ام بهـر دهـانش بنـگرید
کو به چیـزی مختصر چون بـاز می‌مـاند ز مـن

صبر کن حافظ که گر زین دست باشد درس غم
عشق در هر گوشه‌ای افسانـه‌ای خوانـد ز مـن

وەی کە چەن دڵگیرە نوختەی خاڵی خۆری رووی ئەشا!
گیـــان و عەقڵـــم بەند و زنجیرن لـە داوی مووی ئەشـــا
وتمە دڵ تا کـــەی وەها شــــەیدای و سەرگەردان وتی
چاوی نازی شێرگیر و رەوتــــی وەك ئاهــووی ئەشـــا
جەغــــزی دوو زولـــفی تەماشاخانە بۆ سروە و شەمـــاڵ
داوی هـــەر خاوەن دڵێـــکە پەرچەمی جادووی ئەشـــا
خۆرپەرستـــان بـێ‌گومـــان غافـــڵ لە روویـن تۆخـودا
لـۆمەچـی لەو رووگە روو وەرگێڕە! قیبلەی رووی ئەشـــا
پێــــچی زولفی دڵ دزی پێـــچا لە مل سروەی ســـەحەر
بۆ هەوادارانی خۆی ئەفســــوونی دوو هێـندووی ئەشـــا
سەخت و چۆڵێ من بە دوویا گیان بە کەف پێوامە، کەس
نیـــن و نـــابێـــتیش ئـــاوا سەخت‌کۆشـــی دووی ئەشـــا
گەر لە میحرابـــــی ئەویـــــــــن «حافز» دەناڵێنێ رەوان
واعیـــزا تۆ بی و خودا! ئەبرۆی خەمی، گێسـووی ئەشـــا
ئەی فەلەك هەرگیـــــز لە ئەمری شاریـــارم دەرنەچـــی
زەربی شمشێـــری تەماشـــا! قودرەتــــی بازووی ئەشـــا
ئـــاوری تێــــــچوو دڵــی «کۆلیـــــل» ساقــی ئـــاورێ!
دووکەڵـی ئاخــــم لە داخـی چاوی نیوخەتووی ئەشـــا

نکته‌ای دلکش بگویم خال آن مه رو ببین
عقل و جان را بسته‌ی زنجیر آن گیسو ببین
عیب دل کردم که وحشی وضع و هرجایی مباش
گفت چشم شیرگیر و غنج آن آهو ببین
حلقه‌ی زلفش تماشاخانه‌ی باد صباست
جان صد صاحب‌دل آن‌جا بسته‌ی یک مو ببین
عابدان آفتاب از دلبر ما غافلند
ای ملامتگو خدا را رو مبین آن رو ببین
زلف دل‌دزدش صبا را بند بر گردن نهاد
با هواداران رهرو حیله‌ی هندو ببین
این که من در جست‌وجوی او ز خود فارغ شدم
کس ندیده‌ست و نبیند مثلش از هر سو ببین
حافظ ار در گوشه‌ی محراب می‌نالد رواست
ای نصیحتگو خدا را آن خم ابرو ببین
از مراد شاه منصور ای فلک سر برمتاب
تیزی شمشیر بنگر قوّت بازو ببین

شــــەرابی سوور بنۆشـــە و لە کوڵمی دۆ بڕوا!
لە داخــی مەزهـەبی زاهیـــد لە شۆخی خۆ بـڕوا

ئەشـــا کە ئەم کولـــەبالآنە چەن درێـــژدەسن!
لە لۆچــی کۆنــەعـەبـــا بۆ گەلـــی درۆ بڕوا

دەســـێ درێـــژ لە خەرمانی دوو جەهـان ناکـــا
دەماری گوڵچـــــنی جاڕی ئەویـــن شکۆ بڕوا

لە بێـــحی نیـــوە نیــگایەک هەزار گیانت ئـەوێ
نیــــازی عاشــــق و نــازی گــلاری تۆ بـڕوا

بە بـادی سەڕسەڕی دا قیمـــەتی بەڵێــن و چوو
بەڵێـــنی ئێمــە بەلآمێ بە چەشنـــی کۆ بـڕوا

لە بەند بوونـــی ئەوینـــم، مەگـــەر بە داد بگـات
دەروونی رۆشن و خۆش‌فیکر و غەیب‌گۆ بـڕوا

لە گیانی «حافز»ی لێڵی نەهێشت کەوسـەری یار
سەفـای زەمزەمـــی پاکـــانی پـــاک‌بۆ بـڕوا

لە چـــاوی بازی و شابازی نازی ئەو «کۆلیـــل»!
لە ترســی تەیـری دڵ و هەڵـمـەتی هەڵـــۆ بـڕوا

شراب لعل کش و روی مه جبینان بین
خلاف مذهب آنان جمال اینان بین
به زیر دلق ملمّع کمندها دارند
درازدستی این کوته‌آستینان بین
به خرمن دو جهان سر فرو نمی‌آرند
دماغ و کبر گدایان و خوشه‌چینان بین
بهای نیم کرشمه هزار جان طلبند
نیاز اهل دل و ناز نازنینان بین
حقوق صحبت ما را به باد داد و برفت
وفای صحبت یاران و همنشینان بین
اسیر عشق شدن چاره‌ی خلاص من است
ضمیر عاقبت‌اندیش پیش‌بینان بین
کدورت از دل حافظ ببرد صحبت دوست
صفای همت پاکان و پاک‌دینان بین

گیانە بۆ کۆمەڵـــی ڕەندان نەزەرێ! سەر لە مە بێ
لە دەری مەیکەدە فەرمـوو گوزەرێ سەر لە مە بێ

لوتفـی لێــوت فـرە شیــرینە لەگەڵ ئێمە، بەڵام
کەمە خوێـــنم شەکەری با قـەدەرێ سەر لە مە بێ

بەو کەسەی قوفڵــی جەهان باز دەکا فیکری، بڵێن
بـۆم بنێـــرێ بە سەبـــادا خەبـەرێ سەر لە مە بێ

وتی واعیـــــز هونەری هەر غەمە ئەم عەشقە، وتم
وس بـە وس! کوا هەیە عاقڵ هونەرێ سەر لە مە بێ

دڵ لە ئەو ڕۆڵەیی ئازیـــزە مەگـەر هەڵـدەکەنم
داکی گەردون کە نەزا یەک بەشەرێ سەر لە مە بێ

تا وتم بـــادە بنـــۆشە و دەمـــی ساقی بکە ماچ
لێـــمی وەربگـرە! کە ناشێ گوهەری سەر لە مە بێ

قەڵــــەمی «حافز»ە هەر، دارە بەری شەکر و نەبات
نیـیەتی باخـــی ئەدەب نەیشەکەرێ سەر لە مە بێ

چەشنــــی «کۆلیل» ئەگەر هەڵچنی ئەو میوەیە بـم
نامەوێ قـەت لە ژیـانا ســــەمەرێ سەر لە مە بێ

می‌فکن بر صف رندان نظری بهتر از این
بر در میکده می کن گذری بهتر از این

در حق من لبت این لطف که می‌فرماید
سخت خوب است ولیکن قدری بهتر از این

آن که فکرش گره از کار جهان بگشاید
گو در این کار بفرما نظری بهتر از این

ناصحم گفت که جز غم چه هنر دارد عشق
برو ای خواجه‌ی عاقل هنری بهتر از این

دل بدان رود گرامی چه کنم گر ندهم
مادر دهر ندارد پسری بهتر از این

من چو گویم که قدح نوش و لب ساقی بوس
بشنو از من که نگوید دگری بهتر از این

کلک حافظ شکرین میوه نباتی‌ست به چین
که در این باغ نبینی ثمری بهتر از این

به گیانی پیری موغان و به شەکری سوحبەتی ئەو
له سەر کە نیمە هەوایێ بە غەیری خزمەتی ئەو
بەهەشت ئەگەرچی نەجێگەی شەرابخۆرانە
پیاڵە پڕ کە! کە دڵ گەرمە هەر بە هیممەتی ئەو
رمی بروسکەیی ئەو هەورە خوایە رون! کە لە نێو
دڵ و دەروونمی خست ئاگری مەحەببەتی ئەو
لە دەرکی مەیکەدە بینیت ئەگەر سەرێ کەوتوو
وەبەر شەقی نەدەی! ئەی بێخەبەر لە نییەتی ئەو
وەرن کە دوێنەشەوێ مژدە هات بۆ مەستێ
لە پشتی پەردە کە بۆ گشتە لوتف و رەحمەتی ئەو
بە چاوی سووک مەفەرموو نەزەر لە ئێمەی مەست
کە خێر و شەڕ نییە، نابێ، مەگەر بە قودرەتی ئەو
لە زوهد و تۆبە ئەگەرچی دڵم مەلووله بەلام
بە ناوی خاجە لە هەولام و عەشقی دەوڵەتی ئەو
هەمیشە خەرقەیی «حافز» لە رەهنی مەیدایە
دەڵێی لە نەسڵی خراباتە خاك و فیترەتی ئەو
بە یادی چاویە «کۆلیل»! ئەڕۆمە مەیخانە
کە نیمە روخسەتی دیدار و رێ بە خەڵوەتی ئەو

به جـان پیـر خرابـات و حـق صحبت او
که نیست در سر من جز هوای خدمت او
بهشت اگرچه نه جـای گنـاهکاران است
بیـار بـاده کـه مستظـهـرم به همت او
چـراغ صاعقه‌ی آن سحـاب روشن بـاد
کـه زد بـه خرمـن مـا آتش محبـت او
بر آستـانه‌ی میـخانه گر سـری بیـنی
مـزن به پـای که معلـوم نیست نیـت او
بیـا که دوش به مستی سروش عـالم غیب
نویـد داد که عـام است فیض رحمت او
مکن به چشم حقـارت نگـاه در من مست
که نیست معصیـت و زهـد بـی مشیت او
نمی‌کنـد دل من میـل زهـد و توبـه ولی
به‌نـام خواجه بکوشیـم و فـرّ دولت او
مـدام خرقه‌ی حافظ به باده در گرو است
مگر ز خـاک خـرابـات بود فطـرت او

فەرموی کە چوویە سەیری کەوانی هیلالی نــۆ
شـــەرمت نەبوو لە مانگـــی برۆکانی ئێمـە بۆ؟
عومرێـــکە دڵ لە خێڵی ئەسیـــرانی زولفی مەن
هەی هەی لە خەتتی کۆڕی هەوالآن بەدەر مەچۆ
مەفرۆشە عەتری سادە بە کاکۆڵـــی چـارەڕەش
موشکی خوتەن هەزاری، لەوێ هەر لەتێـکە جۆ
لەم کۆنە کێڵـــگە تۆوی وەفـا، میهر، ئەبێ عەیان
دروێنە ئەو دەمەی کە دەکەن عومری خۆم و تۆ
مەیگێـــڕ بادە بێـنە! هەتا روونی کـــەم لە تۆش
رازی هیلال و رەمــزی هـەسارەی لە هات و چۆ
شێـــوەی هیـلالی رەمزە لە تاجـی (سیامەک)و
تەرکـــــی کڵاوی زێـــڕی هیلالی نیشانی (زۆ)
هەر ئاستانی پیــری موغان «خاجە»! کۆی وەفان
هەر لەو ببیسە دەرســی حەدیس و ئـەوینـــی نۆ
«کۆلیل»! دوێ لە مــەیکەدە مەستێ وتی دوعای
مەستـان قوبووڵە لێـــرە وەکوو جام، دەم کەرۆ!

گفتا برون شدی به تماشای ماه نو
از ماه ابروان منت شرم باد رو
عمری‌ست تا دلت ز اسیران زلف ماست
غافل ز حفظ جانب یاران خود مشو
مفروش عطر عقل به هندوی زلف ما
کآن‌جا هزار نافه‌ی مشکین به نیم جو
تخم وفا و مهر در این کهنه کشته‌زار
آن‌گه عیان شود که بود موسم درو
ساقی بیار باده که رمزی بگویمت
از سرّ اختران کهن‌سیر و ماه نو
شکل هلال هر سر مَه می‌دهد نشان
از افسر سیامک و ترک کلاه زو
حافظ جناب پیر مغان مأمن وفاست
درس حدیث عشق بر او خوان و زو شنو

داسی مانگی فەلەک و کێڵگەیی سەرسەوزی لە شەو
بانگەشەی کاری فەلای عومرن و ئەنجامی درەو
وتم ئەی بەخت هەموو خەوتی و خۆر کەوت، وتی
هەر بە هیوا بی ئەبێ شۆرەتی بەخشەندەیە ئەو
پاک و بێ‌خەوشی ئەگەر دەچیە سەرێ چەشنی مەسیح
نووری روخسارت ئەباتۆ لە گوڵی خۆر گرەو
دڵ بەم ئەستێرە عەیارەی دەزی شەوگارە نەدی
چونکە جامی جەمی برد و کەمەری کەیخوسرەو
خۆشە گوارە و گوڵی زێڕین لە دڵی گوێچکە بەڵام
لێمی وەربگرە کە خۆشی گوزەرانن وەکو خەو
چاوی دژ دوور لە خاڵت! کە لە شەترەنجی جەماڵ
کش‌وماتن بە روخت خۆر بە رۆ مانگ بە شەو
ئاسمان ناز نەکا با، کە لە بازاڕی ئەوین
مانگ خەرمانی بە گاڵێ گوڵی پەروین بە دو چەو
زوهدی تێکەڵ بە ریا بەرهەمی دین ئاور ئەدات
«حافز» ئەو خەرقە لە کۆڵت کەوە دەرچۆ بە بدەو
بێژە «کۆلیل» نەبا نێوی جبەی ئێمە دەنا
دژمنی شێخ و مەلا و دین وەکو شمقارە بە کەو

مزرع سبـــز فلــک دیـــدم و داس مـــه نـو
یــادم از کشتـه‌ی خویش آمد و هنگام درو

گفتم ای بخت بخفتـیدی و خورشید دمیـد
گفت با این همـــه از سابقــه نومیـــد مشـو

گر روی پاک و مجـرد چو مسیحـا به فلک
از چــراغ تو به خورشیــد رســد صـد پرتو

تکیــه بر اختـــر شب‌دزد مکـن کـاین عیار
تــاج کـــاووس ببـــرد و کمـر کیخسـرو

گوشـوار زر و لعل ارچه گران دارد گـوش
دور خـوبــی گـــذران است نصیحت بشنـو

چشم بد دور ز خـال تو که در عرصه حسن
بیـــدقی رانـــد که برد از مه و خورشید گرو

آسمان گو مفروش این عظمت کاندر عشق
خرمن مه به جوی خوشه‌ی پروین به دو جو

آتش زهد و ریا خرمن دین خواهد سوخت
حافــظ این خرقـــه‌ی پشمینه بینـــداز و برو

ئەی خۆری گەش وەک ئایەنەداری جەمالـــی تۆ
ئەی موشکی رەش بوخووری بەلاگێڕی خالّی تۆ
شوشتی ســەرای دیــدە سرشـــکم بەلام حەیف
ئەم گۆشـە چووکـە بۆ گەلی خێڵـی خەیالّی تۆ
ئەی شـــاریاری تـەختی دەلالی لە دونـدی نــاز
یــارەب هەتــا هەتـایە نەبیـــنم زەوالـــی تۆ!
جوان‌تر لە نەخشی کولـمی وەکوو مانگتی نەبەست
کێـــشای هەرکە نەخشـــی بــرۆی پڕکەمالـی تۆ
ئەی‌دڵ لە چیـــنی پەرچـەمی چۆنی کە وا ســەبا
شێـــــواو بوو لە شــــەرحی پەریشانی حالّی تۆ
گوڵ بۆی بڵاوە یــەعنـی ئەبێ مەیل تــازە کەین
ئەی ئەو کەسەی بەهاری مە دوو چاوی کالّـی تۆ
بنوێــنە نازی قەوســـــی برۆ تاکـــــو ئاسمان
فەرمان بەرێ لە ئێـــمە بە خۆشـــــی هیلالی تۆ
تـا بچمە کۆشکی بەختـم و تەبریکـی پێ بڵێـــم
کوا مژدەیـــــێ لە هاتنی جێـــژنی ویسالّی تۆ
نوختەی رەشـــێ کە نووری بـــەهاری گـلارمن
عەکسێـــکە هەر لە خـالّی بە چەشنی زوخالّی تۆ
بۆ شاریار کامـــــە شکاتـــــی دەرون بڵێــم
شــەرحی نیـــازی خۆمە هەوەڵ یا مـــەلالی تۆ
«حافز»! لە بەندی زولفی سەری سەرکەشـان فرەن
خـالّـی کە سەر لە فیکری خەیـالّی مەحالّی، تۆ
«کۆلیل» وس بە! شەقڵی ئـــەوین ناشکێ بە لێـو
کێ گوێ ئەدا بە شیـــعری کەڕ و زاری لالّی تۆ

ای آفتــاب آینــه‌دار جمــال تـو
مشک سیـاه مجمـره گردان خـال تو
صحن سـرای دیـده بشستم ولی چه سود
کاین گوشه نیست درخور خیل خیـال تو
در اوج نـاز و نعمتی ای پـادشـاه حسن
یـا رب مبـاد تـا به قیـامت زوال تو
مطبـوع‌تر ز نقـش تو صورت نبست بـاز
طغـرانویس ابـروی مشکیـن مثـال تو
در چیـن زلفش ای دل مسکین چگـونه‌ای
کآشفته گفت بـاد صبـا شـرح حـال تو
برخـاست بـوی گـل ز در آشتـی درآی
ای نوبهـار مـا رخ فـرخنـده فـال تو
تـا آسمـان ز حلقـه‌به‌گوشـان مـا شود
کـو عشوه‌ای ز ابـروی همچـون هـلال تو
تـا پیـش بخت بـازروم تهنیت‌کنـان
کـو مژده‌ای ز مقـدم عیـد وصـال تو
ایـن نقـطه‌ی سیـاه کـه آمـد مـدار نور
عکسی‌ست در حدیقـه‌ی بینش ز خـال تو
در پیش شـاه عرض کدامیـن جفـا کنـم
شـرح نیـازمنـدی خود یـا مـلال تو
حافظ در این کمند سـرّ سرکشان بسی‌ست
سـودای کج مپـز که نبـاشـد مجـال تو

ئەی وشری نێوکی مـــامزی چین! خـاکی دامەنت
ئەی خۆر مووچەخۆری جوقەی تـاجی کەچبەنت
بنوێـنە روو! کە نێرگزی مەس دەرنەچێ لە خـۆی
ئەی من فـەدای چاوی رەش و کولمی سۆسەنت
خوێـنم برێـژە! چون دڵـــی نایـێ فریشتـەیێ
هەر ئەونە جوانـی خوێنـی ئەمن خـاتە گەردەنت
تۆ هـۆی قـەراری گیـانی هەموو خەڵکی عالـەمی
پەوکـێ بە دڵ، بە دیـــدە، رەجاڵـــم بە دیـــدەنت
دەدوم هـــەموو شـــــەوانە لەگەڵ هەر هەسـارەیێ
بۆ مانـگی رووتە حەسرەتـــم و شـەوقـی دیمەنت
یـــارانـی هـاوپیياڵە هەمـــوو هەڵبـــڕان لە یەك
ئێمـــەین و ئاستــــانی شکۆی خاکی کەوشەنت
«حافـــز»! ئەوینـی لوتفـی لە سـەر دامەنـێ هەتـا
ئـاور دەخـاتە خـەرمـەنی غـــەم سۆزی شیوەنت
«کۆلیـل»! تیـــری چـــاوی ئەگەرچی خەتـای نین
دڵ داکـە بۆ نیشـانەی بـــرۆی دەســـمە دامـەنت

ای خون‌بهای نافه‌ی چین خاک راه تو
خورشید سایه‌پرور طرف کلاه تو
نرگس کرشمه می‌برد از حد برون خرام
ای من فدای شیوه‌ی چشم سیاه تو
خونم بخور که هیچ ملک با چنان جمال
از دل نیایدش که نویسد گناه تو
آرام و خواب خلق جهان را سبب تویی
زان شد کنار دیده و دل تکیه‌گاه تو
با هر ستاره‌ای سر و کار است هر شبم
از حسرت فروغ رخ همچو ماه تو
یاران همنشین همه از هم جدا شدند
ماییم و آستانه‌ی دولت پناه تو
حافظ طمع مبر ز عنایت که عاقبت
آتش زند به خرمن غم دود آه تو

ئـەی کراسـی سـەروەری بـڕیا بـە بەر باڵای تۆ
فەڕڕی تـاج و مۆری سوڵتـانی، لە سای ئـاڵای تۆ
هـەردەمێ خـۆری زەفەر جۆرێ لە ئاسـۆ سەردەخا
مـانگی روخسـارت، لە ژێـر تاجـی سلێمان‌سای تۆ
تەیـری خۆشبەختـی دەکا هێـلانە لەو جـێ رادەخا
سێـبەرێ باڵـی هـوما، چەتـری فەلەك واڵای تۆ
شـەرحی شـەرع و فەلسـەفەش بەو هەموە بۆچوونانەوە
گەنجـە سـەر پاکـی لـە گـەنجینـەی دڵـی زانـای تۆ
ئاوی ژیـن دەتکێ لە نووکی تەیری خۆش‌لاجەت رەوان
کانـی شەکـرە یانی پێـنووسـی شەکـەر سەودای تۆ
نـووری چـاوی عـالەمن هەرچەن هەتـاوی ئـاسمـان
چـاوی ئـەو رۆشـن بە سورمەی خاکی سەر رێگای تۆ
ئـاوەژینێـکی سکـەندەر ویستـی و دەستـی نەکەوت
هەر دڵـۆپـێ بـوو لە ئـاوی سافـی نێـو مینـای تۆ
نامـەوێ راز و نیـازی خـۆ لە مەحـزەرتا بڵێـم
چـون هەمـوو رازێ دەبـێ رۆشـن بە بیـر و رای تۆ
سـەروەرم! بەو پیـریەش «حافز» جووانـی گەر دەکا
خۆش خەتـا بڕفێـنە بەخشینـی فەلـەك بـاڵای تۆ
پـێ لە سەحنی عەرشـی ئـازادی دەنـم «کۆلیـل»وار
گەر بخـەم وەك زولفەکـانت سەر لە ژێر دوو پـای تۆ

ای قبـــای پادشـــاهی راسـت بـر بـــالای تو
زینت تـــاج و نگیـــن از گوهــــر والای تو

آفتـاب فتــح را هــر دم طلـوعی می‌دهـد
از کلاه خســـروی رخســـار مـه سیمـــای تو

جلـــوه‌گاه طـــایر اقبـــال باشــد هرکجـــا
ســـایه اندازد همـــای چتـر گردون‌ســـای تو

از رســـوم شرع و حکمت با هـــزاران اختلاف
نکتـــه‌ای هرگز نشــد فـوت از دل دانـــای تو

آب حیـــوانش ز منقـــار بـلاغت می‌چکـــد
طوطی خوش‌لهجـــه یعنی کلک شکّرخـــای تو

گرچه خورشید فلک چشم و چـراغ عـالم است
روشنـــایی‌بخش چشـــم اوست خاک پـــای تو

آن‌چه اسکنــدر طلب کرد و نـدادش روزگـــار
جـرعـــه‌ای بود از زلال جـــام جان‌افـــزای تو

عرض حاجت در حریم حضرتت محتـاج نیست
راز کـس مخـفـی نمـــانـد بـا فـــروغ رای تو

خسروا پیـــرانه ســر حافــظ جوانـی می‌کنـــد
بر امیـــد عفـــو جـــان‌بخش گنه‌فرســـای تو

بوغڵــی وەنەوشــە جۆش ئەدا کاکوڵـی موشکبێنــی تۆ
چـاک یەخەی خونچــە دەکا زاری خەفـەتڕەوێنی تۆ
ئەی گوڵی بۆنخۆشـی ئەمن گڕ مەدە ناخـی بولبولت!
چونکە بە دڵ هەموو شـەوێ هەر ئەوە خۆش خوێنی تۆ
من کە تەنانەت نەفەســی حوور و پەری وەڕەزم ئەکات
تـۆمــەتی عالــەمــم بەســەرهــاتووە بۆ بەڵێــنــی تۆ
هیممەتی عەشقـی تۆ ئەڵێ هەڵــدە لە تەخت و تاجی شا
فـەخـرە شکۆی هەژاری بەر دەرگەهی شــانووێنــی تۆ
پێــکەوە جۆر ئەگەر چ نین جامی شەراب و خەرقەکەم
نـەخشــە دەکێــشــم لەگێ لا بـۆ دڵـی دڵــڕفێنــی تۆ
عـەشقی شەراوی لێوی تۆم ئەو دەمە دەردەچێ لە ســەر
کـەو سـەرە پڕ لە تاسـەیەم خاکە لە کـۆی کەلێــنی تۆ
شاهـ نشینــی چاوی من خەڵــوەتە بۆ خـەیاڵی رووت.
شوێــنی دوعاتە وا کـــەسم رێگــە نەدا بە شوێنی تۆ
خۆش چەمەنێــکە روومەتت وەرزی بەهــاری جوانییە
بولبـولی شاگوڵـی چەمەن «حافـز»ی خۆشدووێنی تۆ
قافـیـەوانـی شیعــری من قــامەتی تۆیـە وا «عومـــەر»
هـەڵدەفڕێ بەرەو ئــەوین وەک مەلی دەستـەڵێنی تۆ

تـــاب بنفشـــه می‌دهـــد طـــره‌ی مشک‌ســای تو
پـــرده‌ی غنچـــه می‌درد خنـــده‌ی دلگشـــای تو
ای گل خوش نسیـــم من بلبـــل خویش را مسوز
کز سر صـــدق می‌کنـــد شب همه شب دعـــای تو
مـن کـه ملـــول گشتمـــی از نفـــس فرشتگـــان
قـــال و مقـــال عالمـــی می‌کشـــم از بـــرای تو
دولت عشق بین که چـــون از سر فقـــر و افتخـــار
گوشـــه‌ی تـــاج سلطنت می‌شکنـــد گـــدای تو
خرقـه‌ی زهـد و جـام مـی گرچه نه درخور همـنـد
این‌همـــه نقـش مـی‌زنـــم از جهت رضـــای تو
شـــور شـــراب عشـــق تو آن نفســـم رود ز ســـر
کـاین ســـر پرهوس شـــود خـــاک در ســـرای تو
شـــاهنشین چشـــم من تکیـــه‌گه خیـــال توست
جـــای دعـــاست شاه من بی تو مبـــاد جـــای تو
خوش چمنی‌ست عارضت خاصه که در بهار حسن
حافـــظ خـــوش‌کلام شـــد مرغ سخن‌ســـرای تو

بلاّ با چاوی خوێن بارم بە تیرێکی کەوان ئەبرۆ
جەهان پڕ کا لە خوێنی گەش، لە من دیدە و لەوان ئەبرۆ
غولاّمی چاوی ئەو شۆخەم لە شیرین خەونی مەستیدا
کە کولّمی باخی ریزوانە و شەواری سایەبان ئەبرۆ
بە غەم خەم بوو لەشم ئاخۆ لەگەلّ نەخشی برۆی چۆنی
لە روو هەلّدێ کە بنوێنێ هیلالی ئاسمان، ئەبرۆ
رەقیبان غافلّن دیدە و تەوێلّی بۆ مە هەر ساتێ
هەزاران نامە دەسپێرن بە دەستی دەرکەوان ئەبرۆ
شکۆی گولّزارە بۆ گیانی گەلی خەلّوەتنشین هەنیەی
لە گۆشەی یاسەمەندا چون بە کەیفی دلّ چەمان ئەبرۆ
ئەوەن شۆخ و چەلەنگی کەس بە حۆری یا پەری نالێ
کە ئەمیان چاوی وەك تۆ ئەو لە چەشنت رێنمان ئەبرۆ
بە بێ رەحمی لەسەر روو پەرچەمت لادا هەتا لادەن
لە رووگەم، تاقی میحراوی کەچی دو قیبلەتان ئەبرۆ
لە راوگەی عەشق ئەگەرچی «خاجە» وەك بازی سپی سەر بوو
شکاری تیری نازی کردوون چاوی کەوان ئەبرۆ
لە رۆژێکۆ برۆی هانداوە لەم «کۆلیل»ـە زامارە
لە جەرگم خوێن دەچۆڕێ چونکە زامی بێ دەوان ئەبرۆ

مرا چشمی‌ست خون‌افشان ز دست آن کمان‌ابرو
جهان بس فتنه خواهد دید از آن چشم و از آن ابرو

غلام چشم آن ترکم که در خواب خوش مستی
نگارین گلشنش روی است و مشکین سایبان ابرو

هلالی شد تنم زین غم که با طغرای ابرویش
که باشد مه که بنماید ز طاق آسمان ابرو

رقیبان غافل و ما را از آن چشم و جبین هر دم
هزاران گونه پیغام است و حاجب در میان ابرو

روان گوشه‌گیران را جبینش طرفه گلزاری‌ست
که بر طرف سمن‌زارش همی‌گردد چمان ابرو

دگر حور و پری را کس نگوید با چنین حسنی
که این را این‌چنین چشم است و آن‌را آن‌چنان ابرو

تو کافردل نمی‌بندی نقاب زلف و می‌ترسم
که محرابم بگرداند خم آن دلستان ابرو

اگرچه مرغ زیرک بود حافظ در هواداری
به تیر غمزه صیدش کرد چشم آن کمان‌ابرو

خـــەتتی کەناری لێــوی کە خۆر گیر ئەکات لەو
جەغزێکە خۆش ئەگەرچـی کەسـێ دەرنەهات لەو
ڕووگـــەی مراد و بـــەختە بـــڕۆی دۆس بێ گومـان
ڕوومـەت بســاوە خاکـــی نیـــاز و بـــەرات لەو
مەیٔنۆشی کۆڕی حەزرەتی جەم سینە چا بە! چون
ئـاوێـــنەیێــکە جـــامــی دەبینـــێ هەوات لەو
کرداری خەڵـــکی مزگتە کردوومی مەی بە کەف
ئـــەم دووکەڵەی ببیـــنە کە ڕوم ڕەش هەڵات لەو
سوڵتـــــانی غـــەم لە دەستی چ نایــێ ئەدی بڵــێ
بردوومە چون بە مــــەیکەدە نامـــەی شکات لەو
مۆمـی شـــــەراب ساقی لەسـەر ڕێــــی هەتاو نێ!
فەرموو کە هەڵکە شۆلە! سـەحەر هەرکە هات، لەو
تـــــاوێ لە ڕۆژنامــــــە سیاکـــەم ببــارە خۆش
پیـــتی گونـــاحشۆرە دڵـــۆپــێ خـــەڵات لەو
«حافـــز» کە کۆکـ ســازی مەقاماتی عەشق ئەکات
خاڵـــی نەبـــێ مەیـــانی بەهـــاری نیشـات لەو!
بەو عـــــەشقە وا لەسـەریەتی دەروێشی شاری حەز
ئاخــــــۆ دەبـــێ کە لوتفی ئەوین سەر بدات لەو
لام وایـــە نایـــە ئەو دەمە «کۆلیـل»ـی کەفتەکار!
ماچـــێ عەتا لە لێـــوی بکـا وەکـ زەکـــات لەو

خط عـــذار یـــار که بگـــرفت مـــاه از او
خوش حلقه‌ای‌ست لیک به در نیست راه از او
ابروی دوست گوشـه‌ی محـراب دولت است
آن‌جـا بمـــال چهـره و حاجت بخـواه از او
ای جرعـــه‌نوش مجلس جـــم سینه پاک دار
کآیینـــه‌ای‌ست جـام جهـان‌بین که آه از او
کـــردار اهـــل صـومعـــه‌ام کرد مـی پرست
این دود بیـــن که نامـه‌ی من شد سیـاه از او
سلطـــان غـــم هر آن چه توانـــد بگـو بکن
من بـرده‌ام به بـــاده‌فروشـــان پنـــاه از او
ســـاقی چـــراغ مـــی بـه ره آفتـــاب دار
گـو برفـــروز مشعلـــه‌ی صبحـــگاه از او
آبـی به روزنـــامه‌ی اعمـــال مـا فشـــان
باشـــد توان ستـــرد حـــروف گنـــاه از او
حافـظ که ســـاز مطـرب عشـاق ســاز کرد
خـــالی مبـــاد عرصـه‌ی این بزمگـــاه از او
آیـا در این خیـــال کـه دارد گـــدای شهـــر
روزی بـود کـه یـــاد کنـــد پادشـــاه از او

گــوڵ ئەوە هـــاتە پێـــکەنین نێـرگزی لا نسار کوا؟!
بــۆی نەفەسی بەهارە دێ شەربەتی خۆش گـەوار کوا
هـــــەر گوڵەتـازەیێ دەسی کردە ملی گوڵێ وەلـــێ
گـوێی قســەبیس کامەن و چــاوی ئەوین‌مـەدار کوا
کـــۆڕی زەماوەن و بـــەزم بۆنی موورادی لـێ‌نەهات
ئـەی نەفـەسی پاکی سەحەر سومبوڵی زولفی یار کوا
عیشوەنووانــدنی گوڵــم سەختە لە لا سەبـــا! دڵــم
خوێـنیـــیە تۆبیت و خودا وسکوتی چاو خـومار کوا
خـــۆری بەیانیـــان ئەڵێـــن لاف لە روومـــەتت ئەدا
زوانـی درێــژە دژ ئــەرێ خـەنجـــەری ژاردار کوا
یـــار وتـــی لە لـەعلـــی من ماچتە ئـارەزو؟ وتـــم
کوشتـــمی ئەم هـــەوا وەلـــێ دەرفەت و ئیختیار کوا
«حافـــز» ئەگەر چ خەزنــەداری غەزەڵە و هونەرپـەژۆ
تـەبعـــی رەوان لەگـەڵ غــەم و مەینەتی رۆژگار کوا
لا بدە پەرچەمی رەش و گیانی«عومەر» بە خۆری روو
گـڕ بـــدە! با نەڵـــێن ورە و ســۆزی هەژاری شار کوا

گلبن عیش می‌دمد ساقی گلعذار کو
باد بهار می‌وزد باده‌ی خوشگوار کو
هر گل نو ز گل‌رخی یاد همی کند ولی
گوش سخن‌شنو کجا دیده‌ی اعتبار کو
مجلس بزم عیش را غالیه‌ی مراد نیست
ای دم صبح خوش‌نفس نافه‌ی زلف یار کو
حسن فروشی گلم نیست تحمل ای صبا
دست زدم به خون دل بهر خدا نگار کو
شمع سحرگهی اگر لاف ز عارض تو زد
خصم زبان دراز شد خنجر آبدار کو
گفت مگر ز لعل من بوسه نداری آرزو
مُردم از این هوس ولی قدرت و اختیار کو
حافظ اگرچه در سخن خازن گنج حکمت است
از غم روزگار دون طبع سخن‌گزار کو

ئـــەی پەیـــکی عاشقـــان خەبەرێ دڵنـــەوا بڵێ!
عەشقی گوڵان بە تەیری گەروو خۆش‌سەدا بڵێ

من شـــارەزای رازی ئـەوینـــم غـــەمت نەبێ!
بۆ ئاشنـــا مەترســـە قســـەی ئاشنـــا بڵـــێ

دو زولفـــــی موشک‌بێـــنی پەرێشان بە کۆڵێـو
بۆ مـــەی لەســـەر چ بوو چ بە خـــاتر خودا بڵێ

هـــەرکەس وتی کە خاکی سەکۆی یار سورمەیە
تاقـــی کەنـــۆ بە چاوی من ئـەم تووتیـا بڵێ

هـــەرکەس کە لۆمەی ئێمە بە مەیخانە چون دەکا
بۆ مـــەی‌فرۆش بێـــژە قسە و باســـی وا بڵێ

جارێکی دی عوبوورت ئەگەر بوو سەبا! بە کۆی
دوا پێشـــکەشی گوڵاوی سڵاو و دوعـــا بڵێ

تۆ گـــەورەکەم ببوورە لە تاوانی چووکی خۆت!
شایـــانە شێـــوە سروە! گوناحـــی گـــەدا بڵێ

لای ئـــەم هەژارە نامـــە لە شانامە خوێـــنەوە
بۆ ئـــەم گـــەدا حەکـــایەتی ئەو پادشـــا بڵـێ

وەختـــێ بە داوی پەرچەمی عاشق دەخاتە خاك
گـــۆڕی غـــەریبی ئێمە لە کوێن ئەی سەبا بڵێ

گیـــان‌پەروەرن حـــەکایەتی یـــارانی رێ‌بەڵـــەد
رازێ هەوەڵ ببیـــسە لـــە لێـــویان جـــا بڵێ

«حافـــز» لە کۆی ئەوانت ئەگەر جێیە تـــۆ خودا
مـــەی نۆشی گیان و تـــەرکی فریو و ریا بڵـــێ

بـــەم پەیکە عاشقانەیە «کـــۆلیل» ســـەر ئەدات
گـــەر وەك پەپـــوو لە تەختـــی وڵاتی سەبا بڵـــێ

ای پیـــک راستـــان خبـــر یـــار مـــا بگـــو
احـــوال گل به بلبـــل دستـــان‌ســـرا بگـــو
مـــا محرمـــان خلوت انسیـــم غـــم مخـــور
بـــا یـــار آشنـــا سخـــن آشنـــا بگـــو
برهـــم چو می‌زد آن ســـر زلفیـــن مشکبـــار
با ما ســـر چه داشت ز بهـــر خـــدا بگـــو
هر کس که گفت خاک در دوست توتیـاست
گو این سخـــن معاینـــه در چشـــم مـــا بگـــو
آن کس که منـــع ما ز خرابـــات می‌کنـــد
گو در حضور پیـــر من این ماجـــرا بگـــو
گر دیگـــرت بر آن در دولت گـــذر بود
بعـــد از ادای خدمت و عـرض دعـــا بگـــو
هر چنـــد ما بـــدیم تو ما را بـــدان مگیـــر
شاهـــانه ماجـــرای گنـــاه گـــدا بگـــو
بر این فقیـــر نامـــه‌ی آن محتشم بخـــوان
با این گـــدا حکـــایت آن پادشـــا بگـــو
جـــان‌ها ز دام زلف چو بر خـــاک می‌فشاند
بر آن غریب ما چه گـذشت ای صبـــا بگـــو
جـــان‌پـــرور است قصـه‌ی اربـــاب معرفت
رمـــزی بـــرو بپـــرس حدیثی بیـــا بگـــو
حافـــظ گـــرت به مجلس او راه می‌دهنـــد
مـــی نوش و ترک زرق ز بهـــر خـــدا بگـــو

بـــە دڵ چ خۆشە نەسیمـــی شەمـــامە شەوبـــۆمان
ســـەحەر بە عەشقی جەمـــاڵت کە هاتە ئاســـۆمان
نیشـــانمی بدە ڕێ ئـــەی هـــومای ڕێگە نووێن!
بە شـەوقی خاکی لە دەرکی دییـەم کە بێ‌ســـۆمان
لە مـــانگی یەک‌شـــەوە بڕوا! دەمـــێ لە ئاســـۆدا
بە یادی پـــەیکەری زاری پـــەژارە دڵ‌جـــۆمان
منـــم هەنـــاسە بە بێ تۆ ئـــەدەم کە وا خەجڵـــم
مـــەگـــەر سەخاوەتـــی عەفـوت بکا تکـا بـــۆمان
ســـەحەر بە عەشقی موریـــدانی تۆ حیجابی ڕەشـی
دڕی بە شێـــــری ســـــەبا شەو بڕا لە شانـــۆمان
لە عەشقی ڕوومەتت ئەو ڕۆژە لەش بە خاک دەبەم
گوڵاڵەســـوورە فەقەت شیـن دەبـێ لە گڵکـــۆمان
کە دوێنە «خاجە» وتـــی سەر لە ڕێـــتە، بیسمیـــللا
مـــەخـــەن بە خـــاتری ناسک مەلالی ئـــەوڕۆمان
دەمێـــــکە بێـــکەسە «کۆلیـــل» و دڵ لە بـێ‌تـۆیی
نەبـــــێ بە قسمەتـــی هەردوو دەمێ بە بێ تۆ مـان

خنک نسیم مُعنبر شمامه‌ای دلخواه
که در هوای تو برخاست بامداد پگاه

دلیل راه شو ای طایر خجسته لقا
که دیده آب شد از شوق خاک آن درگاه

به یاد شخص نزارم که غرق خون دل است
هلال را ز کنار افق کنید نگاه

منم که بی تو نفس می‌کشم زهی خجلت
مگر تو عفو کنی ورنه چیست عذر گناه

ز دوستان تو آموخت در طریقت مهر
سپیده‌دم که صبا چاک زد شعار سیاه

به عشق روی تو روزی که از جهان بروم
ز تربتم بدمد سرخ گل به‌جای گیاه

مده به خاطر نازک ملالت از من زود
که حافظ تو خود این لحظه گفت بسم‌الله

مەستی هەمیشەم بەو لێوە ئاڵە
خوایا سپاست! عەشقم لە پاڵە
ئەی بەختی سەرکێش دەستی لە مل کە!
گا ماچی لێوی گاگا پیاڵە
زەنگی زڕانین دوو خێڵی رسوا
شێخی لە رێ گوم پیری مناڵە
ئەستەغفیروڵڵا عابید لە کارت
تۆبەی وەکوو تۆم سۆفی مەحاڵە
بێژم چلۆنم گیانا لە دووریت
چاو بەحری سوورە و دڵ مەوجی ناڵە
کافر نەکێشێ ئەو دردە کێشای
بۆ بەژن و بۆتان سەرو و هەلاڵە
دەرسی شەوانە و زیکری بەیانی
سەندۆ لە «حافز» ئەو دیدە کاڵە
سا چون لە «کۆلیل» ئاڵۆزی ئازیز!
فەرموو بە ئەبرۆت خوێنم حەلاڵە

عیشـــم مـــدام است از لعـل دلخـــواه
کـــارم بـه کـــام است الحمـــدلله

ای بخت ســـر کِش تنگش به بـــر کِش
گه جـــام زر کِش گه لعـل دلخـــواه

مـــا را بـه رنـــدی افســـانه کردنـــد
پیـــران جاهـــل شیخـــان گمـــراه

از دست زاهـــد کردیـــم تـوبـــه
وز فـعـــل عـــابـد استـغـفـــرالله

جانـــا چه گویـــم شـــرح فـــراقت
چشمـــیّ و صـــد نـم جـانیّ و صـد آه

کافـــر مبیـــناد این غـــم که دیـدهٔست
از قـــامتت ســـرو از عـــارضت مـاه

شـــوق لبت بـــرد از یـــاد حـــافظ
درس شبـــانه ورد ســحـــر گـــاه

خــــەنجەر ببــاریّ ســـەر هــەر لــە ریّتــە
گـەردن لە حوکمــی گـەردوون و ویّتــە
ئاییـنی پاریّـــــز ئیّــــمەش دەزانیـــن
چ بکـــەم کە بەختـــی گومــڕا لە پیّــتە
شیّـــخ و مـەلاکـان کەمتـــر دەنـاسیـن
یــا بـــادە بیّـــــنا یــا وس بــە شیّـــتە!
مــانگی گولاّن و تۆبـــەی منی رەنـد؟!
ســـەد تـــۆبە یـــارەب لەو تـــۆبە ویّتــە
شـــەوقیّ لە جـامی رووتی نـەدی رووم
وەی لـــەو دەروونـەی مـەڕمـەڕ هەویّتـــە
وەختیّ سەبووری تــالّە و تەمــەن هیـــچ
خۆزگەم دەزانـــی کەی جیّـم لە جیّـــتە
گـــولّ گـــویّ گرانن «حافـــز» لە نالّیــن
ئەو کـاتە حالّیــن خویّـن خانـەخویّــتە
فـــــەرموو بە «کۆلیـــل» بـاوانەکەی دلّ
(من هــەولّی تـۆمە تۆ هــەولّی کیّـــتە؟!)

گر تیغ بارد در کوی آن ماه
گردن نهادیم اَلحُکمُ لله

آیین تقوا ما نیز دانیم
لیکن چه چاره با بخت گمراه

ما شیخ و واعظ کمتر شناسیم
یا جام باده یا قصه کوتاه

من رند و عاشق در موسم گل
آن گاه توبه أستَغْفِرُالله

مهر تو عکسی بر ما نیفکند
آیینه رویا آه از دلت آه

اَلصَّبْرُ مُرٌّ وَ الْعُمْرُ فانٍ
یا لَیْتَ شِعْرِی حَتّامَ اَلْقاه

حافظ چه نالی گر وصل خواهی
خون بایدت خورد در گاه و بیگاه

گەیشتـــن بـەو، ژیـــانێ بــــێ نەمـــانە
خودایــا پێــمی بـەی ژیــنی کـــەوانە!

وەبـەر شمشێـــری دام و وســکوتم کـرد
لە دژمـــن رازی دۆســـی دڵ نـەهــانە

بە داخـــــی بەنـــدەگی مـــردن لە رێـــتا
بە ســـەر تۆ! ســـەر لە سوڵتـــانی جەهـــانە

بپـــرسن ئێـــوەن و خوا لەو حـــەکیمـــەم
کە کـەی دەرمـــان ئـــەکا ئەم دەردمـــانە

گڵـــێ پامـاڵـــی ســـەروم بۆگە بێشک
گەلـێ چاتـــر لە خوێـــنی ئـەرخـــەوانە

بەهەشت و کـۆشکی پێشکەش بێ بە ســۆفی
کە چـاڵی ســەر چەنـەی بۆ من جیـــنانە

هـــەژاری دەرکی ئەو ئـــەی دڵ دەزانـی؟!
ســـــەرۆکی هەر هــەمیشەی ســـەرووەرانە

وتـــەی پیـــران بە دڵ وەر بـــگرە جوانا!
کە بیـــری پیـــرە رۆحـــی بەختـی جوانـــە

شـەوێ دەیوت وەک ئەو مرواریەی گوێـم
لە چـــاوی کـــێ لە دونیـــادا رەوانـــە؟!

بە شیـــراز، ئــەسفەهـــان ناگـــا بە بــــالاّ
ئـەگـەرچی (زینـدە روود) ئــاوی ژیـــانە

لـە زاری هـــــاوەڵان شیـــرینە راوێـــژ
قســـەی «حافـز» گەلـــێ شەکری لە بـــانە

وتەی تاڵت نـــەبـــاتی گیـــانی «کۆلیـــل»
ئـەگـەرچی بۆ رەقیـــبان قـــەندی گیـــانە

وصـــال او ز عمـــر جـــاودان بـه
خـداونـــدا! مـــرا آن ده کـــه آن بـه

به شمشیـــرم زد و بـــا کس نگفتـــم
کـــه راز دوست از دشمـــن نهـــان بـه

بـه داغ بنــــدگی مـــردن بـر ایـــن در
به جـــان او که از ملـــک جهـــان بـه

خــــدا را از طبیـــب من بپرسیــــد
که آخـــر کـــی شود این ناتـــوان به

گلـــی کـــان پایمـــال سـرو ما گشت
بود خـــاکش ز خـــون ارغـــوان به

به خلـــدم دعوت ای زاهـــد مفـــرما
که این سیـب زنـــخ زان بوستـــان به

دلا دایـــم گـــدای کـــوی او بـــاش
بـه حکـــم آن کـــه دولت جـــاودان بـه

جوانـــا سـر متـــاب از پنـــد پیـــران
کـه رای پیـــر از بخت جـــوان بـه

شبـــی می‌گفت چشـــم کس ندیـده‌ست
ز مـــروارید گوشـــم در جهـــان بـه

اگرچـــه زنـــده‌رود آب حیـــات است
ولـــی شیـــراز مـــا از اصفهـــان بـه

سخن انـــدر دهـــان دوست شکـــر
ولیکـــن گفتـــه‌ی حـافـــظ از آن بـه

رووبـــەنت وا لە پـــڕا نـــاوەتە لا یانـــــی چی؟
دێیە دەر مەست لە تۆی پەردەسەرا یانـــــی چی؟
گـــوێ بە فەرمانی دژ و زولف لە نێو دەستی سەبا
لەگەڵ ئەو عالـــەمە دەمســازی وەها یانـــــی چی
شـــای جووانـــانی و مەقسوودی هـــەژارانی بڵـــێ
ڕێـــزی ئەم نیعمەتە گەورەت نییە لا یانـــــی چی
سـەری زولفت بە دەسی خۆت هەوەڵ خستە دەسم
ئێـــستە خستوومـــتە ژێر پێ بە جەفـا یانـــــی چی
دەم وتم گفت و کـــەمەر خەنجەرە نیشانی ئەدەی
ساوی شمشێرت ئەدەی بۆم لە جەزا یانـــــی چی
هەرکە سەرقاڵە بە یەک شێوە لە نەردی غـــەمی تۆ
شـــەش‌دەرن گشتـی لە تاسـی هەوەلا یانـــــی چی
خەبەرت بوو لە دڵـــی تەنگت ئەویـــــن دادەبەزێ
«حافز»! ئەو غەیرە لە کۆی ماڵەکەتا یانـــــی چی
زولفی مەعنا مەکە «کۆلیـل»! لە لای ئـــەم دڵە چون
خـــۆم وەرم گـــرتووە زووتر لە سەبا یانـــــی چی

ناگهـــان پرده برانداختــه‌ای یعنـــی چـه
مست از خانه برون تاختــه‌ای یعنـــی چـه
زلف در دست صبا گوش به فرمان رقیب
این‌چنین با همه درساختــه‌ای یعنـــی چـه
شـاه خوبـانی و منظـور گــدایان شده‌ای
قـدر این مرتبـه نشناختــه‌ای یعنـــی چـه
نه سـر زلف خود اول تو به دستـم دادی
بـازم از پـای درانداختــه‌ای یعنـــی چـه
سخنت رمز دهـان گفت و کمر سرّ میـان
وز میـــان تیغ به ما آختــه‌ای یعنـــی چـه
هر کس از مهره‌ی مهر تو به نقشی مشغول
عاقبت با همه کـج باختــه‌ای یعنـــی چـه
حافظا در دل تنگت چو فــرود آمد یـار
خانــه از غیـــر نپرداختــه‌ای یعنـــی چـه

درابـو دەرکی مـوغان گەسک و دەم بو عەتر و گولاب
خــەلاتی مورشیــدی مــەیخانەدا بە شێخ و شــەباب
غــولامی خزمــەتی گشتی قەدەح بە دەست و هــەموو
کـلاویان سـەر و سێـبەر لەسەر حوبــابی سـەحاب
گزینگــی جــام لە مـــانگی پـــڕی، جەمـاڵ بـــڕی
لە تـاوی روومـەتی ســاقی هەتـاو چوو بە نـیقاب
بە سـەد کریشمە لە ئەو بەزمە بـووکی پەردە چ شـەنگ
خــەمێکی دابـوە ئەگریجە وەك لە کولمی گــولاب
لە دەستی گرتووە جـــامی بـەزم کەنیشکی سەحــەر
بە لــەعلی لێــوی فریشتەی ئەدا گولاوی شــەراب
لە قیـــژ و واژی جووانـانی شـــۆخ و شیـرین لێــو
شــــەکەر شکا ســەمەن ئاوارە گۆشەگیرە روبـــاب
ســلاومی بـە کەنیـــن پیــــر دا وەلام و وتـــی
کە ئەی خـوماری هەژار و زەدەی شەراب و خـــەراب
چ کەس دەکا ئەوە کردت بە هێــزی مێشـکی کزت
لە گـــەنج و ماڵی دەرێ بۆ ئــەوینی خێوە حوبـــاب
گــەییــن بە دەوڵەتی وەسڵت گـرانە چون دەخــەوی
هــەموو لە باخەڵی بەختــی خەفـۆکی دوورە مەئــاب
وەرن بە مـــەیکەدە «حـافـــــز» هەتـا نیشـانت دەم
هــەزار و یەك سەفی دۆعا رەوا، لە عـەرشی جـــەواب
فــەلەك لەگەڵ مەلەکـــا بۆ ســەرۆك (نەسرەتەدین)
یەکـی لە ئـەسپــــی دەکا زین و ئەو تری لە ریکـــاب
ســورووشی غەیبی عەقڵ هاتە سـەر کە بۆ بەرەکـــەت
بکا زیارەتـــی خــاکی شـەرەف لە دەرکی جەنـــاب
لە خــاك و مەڵبــەنی کـــوردم بنێژە وەك «عومەر»ت
بە مـــاچ نایــــە تەسەللای گیـــانی پڕ تەب و تـاب

در ســـرای مغـــان رفتـــه بـــود و آب‌زده
نشستـــه پیـــر و صـــلایی به شیـخ و شاب زده
سبـــو کشان همه در بنـــدگیش بستـه کمـــر
ولـــی ز تـــرک کلـه چتـــر بـر سحـاب زده
شعـــاع جـــام و قـــدح نور مـــاه پوشیـــده
عـــــذار مغبـچگـــــان راه آفتـــــاب زده
عـــروس بخت در آن حجلـه با هـــزاران نـاز
شکستـه کسمـــه و بـر برگ گل گـــلاب زده
گرفتـــه ســـاغر عشـــرت فرشتـــه‌ی رحمت
ز جرعـــه بر رخ حـــور و پری گـــلاب زده
ز شـــور و عربـــده‌ی شاهـــدان شیـرین‌کار
شکر شکستـــه سمـن ریختـــه ربـــاب زده
ســـلام کردم و با مـن به روی خنـــدان گفت
که ای خمـــارکش مفلـس شـــراب زده
که این کنـــد که تو کردی به ضعف همت و رای
ز گنـــج خـانه شـــده خیمـــه بر خـــراب زده
وصـــال دولت بیـــدار تـرسمت نـدهنـــد
که خفتـــه‌ای تو در آغـوش بخت خـــواب زده
بیـــا به میـــکده حافظ که بر تو عرضـه کنـم
هـــزار صف ز دعـاهـــای مستجـــاب زده
فلـــک جنیبـه‌کش شـــاه نصـــره‌الدین است
بیـــا ببیـن ملکـــش دست در رکـــاب زده
خـــرد که ملهم غیب است بهـــر کسب شـرف
ز بـــام عرش صـــدش بوسـه بر جنـــاب زده

ئـــەی ئەوەی بەو شـــەوی یەڵـــداتەوە بازاتیـیەوە
بە تــەمــەن بــی! بە دڵـــێ شێـــتنەوازاتیـیەوە
نــاز مەفرۆشـە سەعاتێـک و لە عــادەت وەرە دەر!
تـۆ کـە بـــۆ خـاتــری یــارانــی نیـازاتیـیەوە
لەبــەر ئەو بەژنتـــە بمــرم لە شـــەڕ و ئاشتیـیا
وەکـــو یەک هەر بە قەد و قامــەتی نـــازاتیـیەوە
تێــکەڵی کـردوە لێـــوت بە یەکا ئاگـر و ئـــاو
چـــاوی ناپـــاک دەرێ! شـــەعبەدەبـازاتیـیەوە
مەرحەبـــا لەو دڵە نــەرمەت! کە بە ئیحسانی برۆ
بۆ سـەر ئـەم کوشتـە بە نـــازەت بە نمـــازاتیـیەوە
وەرعی من سووکە لە حـاست کە بە تالانی دڵـــم
مەست و ئاڵـــۆز بە خەڵـــوەی گوڵـــی رازاتیـیەوە
وتی «حافز»! بە مەی ئالودە جەبەی، رەنگە لە کۆی
تەکیـــە بازشتـــی کە بۆ مەیـــکەدە بـــازاتیـیەوە
بێـــژە «کۆلیـــل»! چ قەومـاوە هەمیســان کە وەها
گــەرمــەشینت بە کوڵی سـۆز و گـــودازاتیـیەوە

ای که با سلسلـــه‌ی زلـف دراز آمــــده‌ای
فــــرصتت بــاد که دیـــوانه‌نواز آمــــده‌ای
ساعتـــی نــــاز مفرمــا و بگــردان عــادت
چون به پرسیـــدن اربـــاب نیــاز آمــــده‌ای
پیش بالای تو میرم چه به صلح و چه به جنگ
چون به هرحـال برازنـده‌ی نــاز آمــــده‌ای
آب و آتش به هــم آمیختــه‌ای از لب لعل
چشم بد دور که بس شعبـده‌باز آمــــده‌ای
آفـــرین بر دل نــرم تو که از بهـــر ثواب
کشته‌ی غمزه‌ی خود را به نماز آمــــده‌ای
زهد من با تو چه سنجد که به یغمـــای دلـم
مست و آشفتــه به خلوتگـه راز آمــــده‌ای
گفت حافظ دگرت خرقه شراب‌آلـوده‌ست
مگر از مـذهب این طایفــه بـاز آمــــده‌ای

دوێنەشـــەو چوومە خەراباتەوە خەو پڕ لە ســـەرێ
تەڕ بە مـەی دامـەن و بەرمـاڵ و عەبـا کۆنی بــەرێ
خـــازنی مـــەیکەدە هــات و بە تووانجێکـــۆ وتــی
زوو بە زوو راپەڕە ئەی ڕێبەری خۆش‌خەو هونـەرێ!
خـۆ لە خـۆ پــاك وەشـۆ جا لە خــەرابات خــزێ
تاکــو ئالــوودە نەبێ تەکیـــە بە هەر بێ خەبــەرێ
گـەوهەری گیـــان مەدە یاقــووتە تراوێ بە هـەوای
لێــوی شیرین شەکەر و نوقڵی بزەی موو کەمـــەرێ
چووە تـەشـــــریفی جووانی مەکە پیـــریت چەپـەڵ
تۆشـە لەم مەنــزڵە هـــەڵبگرە سەفـــەر وا لە بــەرێ
چون سەفایێـــــکی نەدا ئاوی گڵ‌ئالــوو بە کەســێ
رۆشـن و ساف لە نێو بیـری جـــەهان وەرنـــە دەرێ
وتــم ئەی گیـــانی هەموو دەفتــەری گوڵ قــەی‌ناکا
لە بەهـــــارا کە بە مـــەی سوور بکـــا بەختـــەوەرێ
مەلەوانــانی عەشـق چـوونە بن ئەم بەحــــرە بـەلاّم
تەڕ نەبوو دامەنی کەس، کەس نەبو تووشــی زەرەرێ
وتی مەفــرۆشە ئەدەب «خاجە»! بە یـــارانی ئەدیب
ئـــاخ لەم لوتفـــە سەراســەر هەڕەشـــەی لێ‌دەوەرێ
نە بە ئەبجـــەد لە موعەممـــای ئـــەوین بـــازە گرێ
نە بە «کۆلیـــــــل» کوڵ و کۆی غەمی دڵ دادەمرێ

دوش رفتم به در میکده خواب‌آلوده
خرقه تر دامن و سجاده شراب‌آلوده

آمد افسوس‌کنان مغبچه‌ی باده‌فروش
گفت بیدار شو ای رهرو خواب‌آلوده

شست‌وشویی کن و آن‌گه به خرابات خرام
تا نگردد ز تو این دیر خراب آلوده

به هوای لب شیرین پسران چند کنی
جوهر روح به یاقوت مذاب آلوده

به طهارت گذران منزل پیری و مکن
خلعت شیب چو تشریف شباب آلوده

پاک و صافی شو و از چاه طبیعت به درآی
که صفایی ندهد آب تراب آلوده

گفتم ای جان جهان دفتر گل عیبی نیست
که شود فصل بهار از می ناب آلوده

آشنایان ره عشق در این بحر عمیق
غرقه گشتند و نگشتند به آب آلوده

گفت حافظ لغز و نکته به یاران مفروش
آه از این لطف به انواع عتاب آلوده

تۆخوا لە من مەتـــۆرە کە نووری گـلاری تۆ
ئارامـی گیـــان و یـــاری منی بێـقەراری تۆ
وەك هەر کەسێ دەسی مە بە داوێنی ئێوە بێ
دڕیا کراســی ســەبر و قـــەراری هەژاری تۆ
وەشیـــار بی نەکەویە کەمینـــی نیینی خۆت!
چون بێ حـــەد و ئەنـازە دەلال و نیـگاری تۆ
لۆمـەم لە عەشقـی ئەو مەکە زاهید! هەتا منیش
لۆمـــەت نەکـەم کە چۆنە لەوێ نادیـاری تۆ
«حافـز» مەگەر لە حەد بە دەرت پێ درێژ کرد
دلّبــەر کە وا تووانجی دەکا هەر نیســاری تۆ
دژمانی یـــار بۆ منی «کۆلیـــل»و هیچی کە
دونیـا هەموو خەلاّتی تەمـاحی نەیـــاری تۆ

از من جـــدا مشو که توام نـور دیـــده‌ای
آرام جـــان و مـــونس قلب رمیـــده‌ای
از دامـــن تـــو دسـت ندارنـــد عاشقـــان
پیـــراهن صبـــوری ایشـــان دریـــده‌ای
از چشم بخت خویش مبادت گزند از آنک
در دلبـــری به غـــایت خوبی رسیـــده‌ای
منعـــم مکن ز عشـق وی ای مفتی زمـــان
معـــذور دارمت که تـــو او را ندیـــده‌ای
آن ســـرزنش که کرد تو را دوست حافظا
بیش از گلیـم خویش مگر پـا کشیـده‌ای

وا خۆش دەچوو تەلاریـز کراسی خزی لە بەر دا
پێخەی کەتانی مانگی بۆ چاك ئەبوو لە سەر دا
ئارەق بە ئاگری مەی تک‌تک لە روو بە چەشنی
شەونم لەسەر پەڕەی گوڵ بڕژێ بە دەور و بەردا
شیرین‌کەلام و شێوا، قامەت بلێند و ئازا
چاوڕەش خومار کولمی تانەی لە مانگ و خۆر دا
شمشاڵ قەد خەرامان نازار و نازپەروەر
لێوی کەنیشکی لوتفی ئاوی ژیانی دەر دا
ئەو لەعلە دلڕفێنەی ئەو زەردە غەمرەوێنەی
ئەو رێگەچوونە خۆشەی بڕوا! لە باخی وەر دا
ئەو دیدە شۆخ و مەستەش دەرچوو بە لەز لە داوم
یاران بکەن تەوێرێ! دڵ دایە کێو و هەردا
وەشیار بی کە ئەهلی دڵ قەت نەکەی پەرێشان!
دونیا کە نووری چاوم ئەوڕۆیە تاکو فەردا
ئەو چاوە دڵفریوەت بۆ دەمکوژێ بە قاری
تاقانەکەم بە نازێ تاقیم کەرۆ لە بەر دا
رەنجاوە گەر لە «حافز» بووکی شکۆی خەیاڵت
بێرۆ کە تەف لە هەرچی بیستم، وتم، لە دەر دا
بێ‌حەد دەکەم سپاسی لوتفت ئەگەر بە دەس بێ
میوەی گەییوی باخی ئێوەم لە هەر گوزەر دا
هیجرانی تۆ لە سینگی «کۆلیل» زۆری هێنا
چاوم کە وا پولوسکی بەردا بە دار و بەردا

دامن کشـــان همی‌شـــد در شـــرب زر کشیده
صـــد ماه رو ز رشکش جیب قصب دریـــده

از تـــاب آتش مـی بر گرد عـارضش خـوی
چون قطره‌هـــای شبنم بر برگ گل چکیـــده

لفظی فصیـــح شیـــرین قـــدی بلنـــد چـابک
رویـــی لطیف زیبـــا چشمـــی خـوش کشیـــده

یاقـــوت جـــان‌فـــزایش از آب لطـــف زاده
شمشاد خوش‌خـــرامش در نـــاز پروریـــده

آن لعل دلکشش بین وآن خنـــده‌ی دل‌آشوب
وآن رفتن خوشش بیـــن وآن گام آرمیـــده

آن آهوی سیـــه‌چشم از دام ما بـــرون شـــد
یـــاران چه چـــاره سازم با این دل رمیـــده

زنهـــار تا تـــوانی اهـــل نظـــر میـــازار
دنیـــا وفـــا ندارد ای نور هـــر دو دیـــده

تا کی کشـــم عتیبت از چشـــم دل‌فـــریبت
روزی کرشمـــه‌ای کن ای یـــار برگزیـــده

گر خاطر شـــریفت رنجیـــده شد ز حافـــظ
بـــازآ که توبه کردیـــم از گفتـــه و شنیـــده

بس شکر بـــازگویم در بنـــدگی خواجـــه
گر اوفتـــد به دستـــم آن میوه‌ی رسیـــده

نامەم لە خوێنی دڵ بوو، بۆ سەروی سـەوز قامـەت
دیتــم لە دەردی دووریت رۆژی رەشـی قیامـەت
چـاوم لە دەردی دووری سـەد جۆری پێن نیشـانە
ئەسرینـی ئاڵــم ئاخــۆ نابێ بە یەک عـەلامـەت
کەڵــکی نەبوو چەنێـــکم تـاقی بە دڵ کە کردۆ
تاقــی کراوە بوو ئـەو من گێـــژ بووم و نــامـەت
پرسیــم لە حــاڵزانێ نیسبەت بە گوڵ، وتی پێــم
دووری لە یـار دەردە و دیـداری کۆی سـەلامـەت
پرسیــم دەبــم نزیکی لۆمـــەم دەکەن لە دوورۆ
فەرمــوی نەماندی وەڵڵا عەشقی بە بێمەلامــەت!
بۆیـــێ ئـەدا بە جامــێ گیـانی شرینـــی «حافــز»
گاهەس قومێ بنۆشـێ شیرین لە جـۆی کەرامــەت
نەیکردە بۆ لە ژینــا «کۆلیـــل» گــوڵ لە باخـــێ
سەرتر لە عەتری زولفت خۆش‌تر لە بۆی شەمامەت

از خـون دل نوشتـم نزدیک دوست نامـه

إنّـی رَأیْـتُ دَهــراً مِنْ هِجرِک القِیـامـة

دارم من از فراقـش در دیـده صد عـلامت

لَیسَتْ دُمـوعُ عَیْنـی هـذا لَنـا العَـلامـة

هرچنـد کـآزمودم از وی نبـود سـودم

مَنْ جَـرَّبَ الْمُجَـرَّب حَلَّتْ بِهِ النَّـدامـة

پرسیـدم از طبیبی احـوال دوست گفتـا

فی بُعـدِها عَـذابٌ فی قُربِهـا السَّلامـة

گفتـم ملامت آیـد گر گرد دوست گردم

وَ اللهِ مـا رَأیْنـا حُبّـاً بِـلا مَـلامـة

حافظ چو طالب آمد جامی به جـان شیرین

حَتّی یَـذوقَ مِنـهُ کَأسَـاً مِنَ الْکرامـة

کە شەوقی روومەتی تۆ رۆژی کردە پەروانە
سەرم بە ئێوەیە ئاوا، لە ئێمە وێرانە
عەقڵ کە شێتی ئەوینی دەخستە کۆی زەنجیر
لە بەندی پرچی رەشتدا بە چەشنی دێوانە
بە بۆنی زولفت ئەگەر سەر بەها بدەم هیچە
هەزار گیانی عەزیزم نیساری گیانانە
لە حەسرەتا دڵی وێڵم کەوت لە پا دوێشەو
کە دیم دەلال و گوڵی خۆ لە دەستی بێگانە
چ فێڵ و نەخشە کە کێشام و ئاوی دڵمی نەدا
فسوونی ئێمە لە لای ئەو گەڕایە ئەفسانە
لەسەر گڕی روخی کێ دی بە جێگەی ئەسپەننەر
بە غەیری خاڵی رەشی تۆ، بێ بە شادانە؟!
لە مۆمی رووتی کە شەم پێگەیی شەماڵە گڕێ
ژیانی دا بە سەبا یەکنەفەس لە مژدانە
لە وەرزی دەوڵەتی لێوت لە سەرمە پەیمانێ
نەبەم کە ناو لە هیچێ مەگەر لە پەیمانە
نەکەی لە مەدرەسە یا خانەقا قسە و باسێ!
کە گیانی پڕیەتی «حافز» لە عەشقی مەیخانە
ئەدی چ مەرگتە «کۆلیل» گەرمەناڵێنت؟!
تەنووری داغی ئەوینت لە سینگی ناڵانە

چـــراغ روی تو را شمـــع گشت پــروانه
مرا ز حـــال تو با حـــال خویش پروا نــه
خـــرد که قیـــد مجانین عشق می‌فرمـــود
به بـــوی سنـــبل زلف تو گشت دیـــوانــه
به بوی زلف تو گر جان به باد رفت چه شد
هـــزار جـــان گرامی فـــدای جـــانانــه
من رمیـــــده ز غیـــرت ز پا فتـــادم دوش
نگـــار خویش چو دیـــدم به دست بیگانــه
چه نقشه‌ها که برانگیختیم و ســود نداشت
فســـون مـــا بر او گشتـــه است افســانــه
بر آتش رخ زیبـــای او به‌جـــای سپنـــد
به غیـــر خـــال سیاهش که دیـــد به دانــه
به مژده جـــان به صبا داد شمـــع در نفسی
ز شمـــع روی تـواش چون رسیـــد پروانــه
مـــرا بـه دور لب دوست هست پیمـــانی
که بر زبـــان نبـــرم جـــز حـــدیث پیمانــه
حـــدیث مدرسه و خانقه مگـــوی که بـــاز
فتـــاد در ســـر حافظ هـــوای میـــخانــه

سەحەر هێشتا سەرم مەستی شەوانە
من و مەی عوود و قانوون و تەرانە
بە عەقڵم بادە بۆ تۆشەی سەفەردا
لە شاری بوونیم فەرموو رەوانە
جووانی مەیفرۆشم چاوی قرتان
نەما ترسم لە ئەفسوونی زەمانە
لە مەیگێڕی کەوانئەبرۆ شنەوتم
کە ئەی بۆ تیر و تانە و خەم نیشانە
کەمەربەندی قەدی دڵبەر کەسێکە
کە خۆ گوم کات و وس بێ لەم دوانە
برۆ ئەم داوە دانێ بۆ قەل و داڵ!
کە سیمورغ ئاشیانی کاکەشانە
دەبێ کێ دەستی وەسڵی گا بە شایێ
کە هەر خۆی عاشق و مەعشووقە گیانە
هەواڵی موتریب و ساقی ئەون ئەو
خەیاڵی ئاو گڵ پەڵپە و بەهانە
بە من بسپێرە کەشتی مەی کە تەی کەم
بە مەستی بەحری ناپەیداکەرانە
وجوودی ئێمە رازێ سەر بە مۆرە
کە لێکۆڵینەوەی «حافز»! گرانە
سپی «کۆلیل»! چاوی عەقڵە لەم رێ
شەوارەی خێڵی زانا و نەزانە

سحرگاهان که مخمور شبانه
گرفتم باده با چنگ و چغانه
نهادم عقل را ره توشه از می
ز شهر هستیش کردم روانه
نگار می فروشم عشوه‌ای داد
که ایمن گشتم از مکر زمانه
ز ساقی کمان‌ابرو شنیدم
که ای تیر ملامت را نشانه
نبندی زان میان طرفی کمروار
اگر خود را ببینی در میانه
برو این دام بر مرغی دگر نه
که عنقا را بلند است آشیانه
که بندد طرف وصل از حسن شاهی
که با خود عشق بازد جاودانه
ندیم و مطرب و ساقی همه اوست
خیال آب و گل در ره بهانه
بده کشتی می تا خوش برانیم
از این دریای ناپیداکرانه
وجود ما معمایی‌ست حافظ
که تحقیقش فسون است و فسانه

مەیگێڕ بێ کە لالە پیاڵەی پڕن لە مەی
لاف و گەزاف چەند و خورافات تا بە کەی؟!
ناز و غووروور لاوە کە دیتوویە رۆژگار
چینی کەوای قەیسەر و گۆشەی کڵاوی کەی
وەشیار بی کە تەیری چەمەن مەستی مەستە شەو
بێدار بی کە خەونی هەمیشەت لە پێشە هەی!
چەن خۆش بە نازی تازە خەرامان دەچی بە رێ
نەتبێ خەزانی سەرد و هەناسەی سەهۆڵی دەی!
هاوار بۆ کەسێ کە فەلەک پێکەنێ لە رووی
باوەڕ بە لوتفی چەرخ و بزەی لێوی هەی نەکەی!
سەیزوو شەرابی کەوسەر و چاوڕەش کچان ئەدەن
ئەورۆش لوتفی ساقی و دوو چاوی پڕ لە مەی
دێنێتە یاد بادی سەبا ژینی لاوەتیم
مەی بێنە غەم رەوێنە ئەیا لاوی بێ لە وەی!
چاوت نەبێ لە سەڵتەنەتی گوڵ، خەزان کە بێت
زریان بە یەک هەناسە ئەساسی دەکات پەی
بێنا بە یادی حاتەمی تەی مەی! مەنێ، هەتا
نامەی رەش و رەجاڵی بەغێلان بکەین تەی
لەو بادە وا جەماڵ و شکۆی دا بە ئەرخەوان
لەو بادە بوو بە شەونمی سەر کوڵمی کاڵەبەی
خێوەت لە باخ هەڵدە کە ئامادە خزمەتن
سەروی سەوزە کراس و کەمەر بەستە شەکرە نەی
«حافز»! فریوی سیحری حەڵاڵت گەیی بە رۆم
تێپەڕ لە میسر و چین بو سەمەرقەندی گرت و رەی
چەشنی هەواری خاڵییە «کۆلیل» دەورە چۆڵ
ئەی وەی لە جەوری چەرخ و وزەی دەوری ئاشەکەی

ساقی بیا که شد قدح لاله پر ز می
طامات تا به چند و خرافات تا به کی

بگذر ز کبر و ناز که دیده‌ست روزگار
چین قبای قیصر و طرف کلاه کی

هشیار شو که مرغ چمن مست گشت هان
بیدار شو که خواب عدم در پی است هی

خوش نازکانه می‌چمی ای شاخ نوبهار
کآشفتگی مبادت از آشوب باد دی

بر مهر چرخ و شیوه‌ی او اعتماد نیست
ای وای بر کسی که شد ایمن ز مکر وی

فردا شراب کوثر و حور از برای ماست
و امروز نیز ساقی مه‌روی و جام می

باد صبا ز عهد صبی یاد می‌دهد
جان دارویی که غم ببرد دردِه ای صُبَی

حشمت مبین و سلطنت گل که بسپرد
فراش باد هر ورقش را به زیر پی

دردِه به یاد حاتم طی جام یک منی
تا نامه‌ی سیاه بخیلان کنیم طی

زان می که داد حسن و لطافت به ارغوان
بیرون فکند لطف مزاج از رخش به خوی

مسند به باغ بر که به خدمت چو بندگان
استاده است سرو و کمر بسته است نی

حافظ حدیث سحرفریب خوشت رسید
تا حد مصر و چین و به اطراف روم و ری

به دەنــگی بولبــول و قومـــری دەبێ بنـۆشی مــەی
دەنــا به داغتــه دەرمـــان به من كه گـــوێ نـــادەی
له رەنــگ و بۆنـــی بەهـــاری جەمـۆكه تۆشــه! دەنا
دەگا له پڕ رەشەمـەی رووڕەش و چەتەی وەك دەی
كه گوڵ حیجـابی فـــڕێدا، كه مــەل وتی هوو هوو
له دەس پیاڵه نەدەی! فیكری چی دەكەی هەی هەی!
حـەزی حوكوومەت و گەنجی به كەس نەما تا ســەر
له تەختـی جەم قســه هەر ماوه وەك له تـاجی كـەی
خـــەزێنەواینیـــی میـــراتخۆرەكـــان كوفـــره
به شەرعی موتریب و ســاقی به ئەمری عوود و نــەی
فـــەلەك خـەڵاتی به كێ بێـــژه دا كه نەیسەنـدۆ؟!
له سپڵـــه نـــایه سەخـــاوەت كه تاڵـــه هەڵـــواكەی
رەقـــــەمكراوه له هەیـــــوانی جەننەتـــا خەتتـــێ
كه عیشوەسێنـــی جەهـــان وەی به حـاڵی پەیتاپــەی!
سەخـــا نەمــاوه غەزەڵ تەی دەكەم دە تێكـه شەراب!
به یـــادی رۆح و رەوانـی كەریمـــی خێـــڵی تـــەی
بەغێـــڵ گوێ كـــەرە «حافـــز»! له بەزمی خوانـــاسان
كـەرەم كه جورمی لەسـەر من، بنۆشــه جامێ مــــەی!
دڵـــت چ فەرقـــی لەگەڵ ناڵی ئەسپـــه هــەی هـــاوار
له چاڵــی گەردنی ئەر وەك «عومەر» نەبێ جەزبـــەی

به صوت بلبـــل و قمـــری اگر ننوشـی مـی
عـــلاج کـــی کنمت آخـــرالدواء الکـــی
ذخیـــره‌ای بنـــه از رنگ و بـوی فصل بهـــار
که می‌رسنـــد ز پی رهزنـــان بهمـن و دی
چو گل نقـــاب برافکنـــد و مـرغ زد هوهو
منـــه ز دست پیـــاله چـه می کنـــی هی هی
شکـــوه سلطنت و حسن کـی ثبـــاتی داد
ز تخت جـم سخنی مانده است و افسر کـی
خزینـــه‌داری میـــراث‌خوارگان کفـر است
به‌قول مطرب و ســاقی به فتـوی دف و نـی
زمانـــه هیـــچ نبخشـــد که بـازنستـــاند
مجـو ز سفلـــه مروت که شیئـــه لا شـــی
نوشتـــه‌اند بر ایـــوان جنّـــةالمَـــأوی
که هر که عشوه‌ی دنیـــا خریـــد وای به وی
سخـا نماند سخن طی کنـم شراب کجـاست
بـــده به شـــادی روح و روان حاتـــم طـی
بخیـــل بوی خـــدا نشنـود بیـا حافـــظ
پیـــاله گیـر و کـــرم ورز و الضّمـان علـی

هەنــــاری لێـــوی دەمــژم بۆ مـــەزەی مـــەی
بە ئـــاوی خــزری زینـــدوم بـــردوون پـــەی
نــە دەتـــــوانم ببیـــــنم کــەس لەگـــــەڵ ئــەو
نــە دەتـوانـــــم بڵێـــــم رازێ لــەبـــــارەی
ســوراحی خوێــن لە دڵ، لێـــوی دەکا مـــاچ
دەبیـــــنی کوڵمــی گوڵ عـــارەق دەکا هـــەی
لە فیــکری جــەم گـــەڕێ مەیگێڕ جـــامێ!
چوزانــم من کە جەم کەی بوون و کەی کەی؟!
لە باخـــەڵ بگرە چەنـگ ئــەی موتریبی شــۆخ!
رەگـــی بخورێنـــە بـــۆم تا بێمـــە وەی وەی
لە خەڵــوەت کەوتـــە رێ گوڵ بۆ چەمـــەنزار
ئەســـاسی وەرع ئەبێ وەك خونچـــە بێ تـــەی
وەکـــوو چـــاوی مـــەهێلا نێـــوە مـــەستێ
بە یـــادی لێـــوی مـــەی بێـــنا پەیـــاپەی
جودا لەو پەیـــکەرەم گیـــان چۆن دەبێ چـۆن
کە خوێنی جـــامی مـــەی دەتکێ لە هەنیـــەی
زمـــانت بســـرەوێ «حافـــز» زەمـــانێ
زمانـــی بێزمانـــان بێـــڵە بـــۆ نـــەی
وتـــاری رێبـــەنانـــی زاری «کۆلیـــــل»
هـــەموو نـــابێ بە تـاوێـــکی هەناســـەی

لبش می‌بوسم و در می‌کشم می
به آب زندگانی برده‌ام پی
نه رازش می‌توانم گفت با کس
نه کس را می‌توانم دید با وی
لبش می‌بوسد و خون می‌خورد جام
رخش می‌بیند و گل می‌کند خوی
بده جام می و از جم مکن یاد
که می‌داند که جم کی بود و کی کِی
بزن در پرده چنگ ای ماه مطرب
رگش بخراش تا بخروشم از وی
گل از خلوت به باغ آورد مسند
بساط زهد همچون غنچه کن طی
چو چشمش مست را مخمور مگذار
به یاد لعلش ای ساقی بده می
نجوید جان از آن قالب جدایی
که باشد خون جامش در رگ و پی
زبانت درکش ای حافظ زمانی
حدیث بی‌زبانان بشنو از نی

نێـومەستی جامــی عەشقــم مەیگێـڕ بادە با بێ!
مەی تێکە هەی کە مەجلیس بێ مەی سەفـای نـابێ
تاریفــی مانگــی کولمــی ئاهەنگی ســاز نایــێ
(هەی‌نـار) بێـژە (زیـرەک)! مەیگێـڕ سا شــەرابێ
بــالام بوو بە حەلقــەی دەرگات تـا غـولامــــان
راوم نەنــن لە ئــەرکت بۆ دەرکــی هــەر جەنــابێ
ئێــمە و فریوی نــازت تێکـەڵ خەیــاڵ و خــەونێ
ئێـــمە و هــەوای بەژنت بەلکو لەگەڵ مــە رابــێ
نێومــەستی ئەو دو چـــاوەم ئاخۆ لە کوێن جــامێ
بیمـــاری ئەو دو لێـــوەم کەنگێ ئەدەن جـــەوابێ
بۆ دلبــەنی خەیالی شۆخــانی؟ «خاجە»! هــەی داد
تینوو بە بـــەرقی وشکی تراویلکە چـــۆن دەوا بێ
مەجنــون لە زولفــی لەیـلا «کـۆلیــل»! گیرە عەقلی
کێ عەقڵ و عەشقـی بینی پێکۆ لە یەک ســەرابێ

مخمور جام عشقم ساقی بده شرابی
پر کن قدح که بی می مجلس ندارد آبی
وصف رخ چو ماهش در پرده راست ناید
مطرب بزن نوایی ساقی بده شرابی
شد حلقه قامت من تا بعد از این رقیبت
زین در دگر نراند ما را به هیچ بابی
در انتظار رویت ما و امیدواری
در عشوه‌ی وصالت ما و خیال و خوابی
مخمور آن دو چشمم آیا کجاست جامی
بیمار آن دو لعلم آخر کم از جوابی
حافظ چه می‌نهی دل تو در خیال خوبان
کی تشنه سیر گردد از لمعه‌ی سرابی

ئەی ئەوەی پەردەی رەشی کێشا لە کوڵمت زولفی خاو
سایەبانێکت لە پەرچەم ساز فەرموو بۆ هەتاو
تا بزانم ئاوی روخساری لەگەڵما چی دەکا
نەخشی دڵگیری چ خۆش کێشا لە روو رۆشن وەک ئاو
شاد بن چون گۆی جووانیتان لە خانبالغ رفاند
جامی کەیخوسرەو بنۆشن تێشکا ئەفراسیاو
هەرکەسێ جۆرێ بە مۆمی رووتی دانا نەردی عەشق
وەک پەپوولەی ئێمە باڵی هەستی کێ سووتا تەواو
ئەو دڵەی وێرانمت تا کردە گەنجینەی ئەوین
چەتری هەڵدا سێوەری بەختت لەسەر گۆشەی روخاو
وەی کە لێوی وشکی شێران تەڕ بە ئاوی روومەتت
قەت نەبوو، خێڵی سکەندەر بۆ نمێکی دڵ کەواو
خەونی بێدارانی بەست ئەمڕا بە فەرمانی خەیاڵ
تۆمەتی سازان، سپای شەورەو کە خەویان ناوە ڕاو
تا لە مەیدانی جەماڵا یەک نەزەر کوڵمت نووان
چوونە تۆی پەردەی حەیا حۆری، پەری دەرچوو لە ناو
مەی بە جامی جەم بنۆشی چون لەسەر تەختی جەما
رووبەنت لادا لەسەر روخساری کیژی ئافتاو
مەکری چاوی نێوەمەست و فێڵی لێوی مەی‌پەرست
«حافز»ی خەڵوەت‌نشینی خستە نێو گۆمی شەراو
بۆ نەچیری دڵ قژت ئاڵانە دەوری گەردنم
هەر غوڵامێ حەققی ئاغەی وا لە ئەستۆ بێ حەساو
شاریاری دادگەر ئەی ئەو کەسەی تاجی سەری
کردە شاباشت بە گیان و دڵ هەتاوی گەرمەتاو
نەسرەدین یەحیا کەسێکی وا بریقەی خەنجەری
دژمنی گڕ دا دڵ و گیانی لەگەڵ مێشکی رزاو
هەر ئەوەن ئازیزەکەم! «کۆلیل»و خەستەی هیجری تۆم
دڵ لە دووریت ئەنجن‌ئەنجن بوو وەکوو کۆتەی قەساو

ای که بر مـاه از خط مشکیـن نقـاب انـداختی
لطف کـردی سایـه‌ای بر آفتـاب انـداختی

تا چه خواهـد کرد با مـا آب و رنگ عـارضت
حالیـا نیـرنگ نقشی خـوش بر آب انـداختی

گوی خوبـی بردی از خوبـان خلّخ شـاد بـاش
جـام کیخسـرو طلب کـافراسیاب انـداختی

هـر کسی با شمع رخسـارت به وجهی عشق باخت
زآن میـان پـروانه را در اضطـراب انـداختی

گنـج عشـق خود نهـادی در دل ویـران ما
سـایه‌ی دولت بر این کنج خـراب انـداختی

زینهـار از آب آن عـارض که شیـران را از آن
تشنـه‌لب کردی و گـردان را در آب انـداختی

خـواب بیـداران ببستی وآنگـه از نقش خیـال
تهمتی بر شبـروان خیـل خـواب انـداختی

پـرده از رخ برفکنـدی یک نظـر در جلـوه‌گاه
و از حیـا حور و پری را در حجـاب انـداختی

بـاده نوش از جـام عالم بین که بر اورنگ جـم
شـاهد مقصـود را از رخ نقـاب انـداختی

از فـریب نرگس مخمـور و لعـل مـی پـرست
حافـظ خلوت‌نشیـن را در شـراب انـداختی

وز بـرای صیـد دل در گردنـم زنجیـر زلف
چون کمنـد خسـرو مالک رقـاب انـداختی

داور دارا شکـوه ای آن‌کـه تـاج آفتـاب
از سـر تعظیـم بر خـاک جنـاب انـداختی

نصـرةالدین شـاه یحیی آن‌که خصـم ملک را
از دم شمشیـر چـون آتش در آب انـداختی

ئەی دڵ! نەبێت ساتێ خاڵی لە عەشق و مەستی
هەر وایە ڕێی خەلاست ئاخر لە ماڵی هەستی
تا ئاخرین هەناسەت فەرمانبەری ئەوین بە
لەم ڕووگە ڕووکەی ئەیکەی حاشا لە خۆپەرەستی
چەشنی نەسیم هەرچەن لاوازی هەڵسوکەوتی
خۆش بی! بەوەی نەخۆش و بێ‌هێزی بەژنی هەستی
ڕێگەی گەیین بە ئیقباڵ چالاکی و خەباتە
ئایینی ئێمە ئێژێ پیلانی کوفرە سوستی
یەک نوکتە با بڵێم پێت مەنوێنە عەقڵ و زانین
خۆبین قەتیسە هەرگیز ناگا بە کۆی مەبەستی
بۆ ئاستانی گیانان بڕوا! نەک ئاسمانت
تا فەخری سەربڵیندی نەتخاتە خاکی پەستی
ئێشی دڕوو هەتاکوو گوڵ چاوی لێتە سەهلە
شیرینە مەی بە تاڵی بۆ حاڵ و زەوقی مەستی
زاهید شەرابنۆشە و «حافز» پیاڵەپارێز
ئەی خێڵی فێڵپۆشان تا کەی درێژدەستی؟!
«کۆلیل» دەرکی هەستی هەر ئاوەڵا لە تۆ بۆ
پیلانی خەستی سۆفی و ئۆفی بە مەکری بەستی

ای دل مباش یکدم خالی ز عشق و مستی
وآنگه برو که رستی از نیستی و هستی
گر جان به تن ببینی مشغول کار او شو
هر قبله‌ای که بینی بهتر ز خودپرستی
با ضعف و ناتوانی همچون نسیم خوش باش
بیماری اندر این ره بهتر ز تندرستی
در مذهب طریقت خامی نشان کفر است
آری طریق دولت چالاکی است و چستی
تا فضل و عقل بینی بی‌معرفت نشینی
یک نکته‌ات بگویم خود را مبین که رستی
در آستان جانان از آسمان میندیش
کز اوج سربلندی افتی به خاک پستی
خار ار چه جان بکاهد گل عذر آن بخواهد
سهل است تلخی می در جنب ذوق مستی
صوفی پیاله پیما حافظ قرابه پرهیز
ای کوته‌آستینان تا کی درازدستی

رازی ئـەوین و مەستـــی بۆ موددەعی مەفــەرموون
با خۆپــەرس نەمێنـێ و بمـرێ کە دەردیسـەر بـوون
عاشــق بە! وەرنە ڕۆژێ دونیـــا دەچێت و نەتخـۆند
ئەو نەخشــە پێتی ئەسپــارد لەم کارگایە گــەردوون
دوێشـــەو چ خۆشی فەرمـــوو دڵبەر لە کۆڕی بەزمـا
کارت بە کافران چیـن بوتــخانە گەر بەســەرچوون
کەوتـــوومە داوی زولفت ئـەی شاریــــار تۆخوا!
چــەندێ درێـــژدەستی تا کەی جەفـا دەفەرمــوون
داب و نەرێتـــی مــەستی تا فێـــر ئەبـم لە چـاوت
چۆنـــم دەبێ لە سووچێ هەڵکەم بە بێخەتەربــوون
ئـەو ڕۆژە دیتبــــوم ئـەم غـەوغـــایە ئێستە بەرپـان
بێــزت کە لێـم دەکردۆ، لەم شێخە بەرحەزەربـــوون
«حـافز» ئـەدا بە دەستـــی تۆفـــان ئەوینـــی ئێــوە
پێت وا نـــەبێ وەکوو برق لەو گێژەلێوە دەرچـــوون
کافـــر نـــەبێ بە حاڵی «کـۆلیـل»ی کـــوردەواری
هەڵخا لە گوێنی دینام ناخی، لە تۆی جیگەرخـــوون

با مدعـــی مگوییـد اسـرار عشـق و مستـی

تـا بی‌خبـر بمیـرد در درد خودپـرستی

عاشـق شو ار نــه روزی کار جهـان سـر آید

ناخوانـــده نقـش مقصـود از کارگـــاه هستی

دوش آن صنم چه خوش گفت در مجلس مغانم

با کافـــران چه کـــارت گر بت نمی‌پرستـــی

سلطـــان من خــــدا را زلفت شکست مـــا را

تا کـی کنـد سیـاهی چنـدین درازدستـــی

در گوشـــه‌ی سلامت مستـور چـون توان بود

تا نرگس تـو بـا مـا گویـد رمـوز مستـی

آن روز دیـده بودم این فتـنه‌ها که برخـاست

کز سرکشـی زمـانی بـا مـا نمی‌نشستـی

عشقت به دست طوفـان خواهد سپـرد حافظ

چون برق از این کشاکش پنـداشتی که جستی

خەتتێکی ئەنووسی ئەگەر ئەو خۆش‌خەت و خاڵە
گـــەردون وەرەقـــی وا نـــەدەکـــردم بە نەواڵـــە
هەرچەنـدە کە هیجـــران بەری دیـــدار ئەدا کاش
جووتێـــری فەلەک نەیدەوەشان ئەم تووە تاڵـــە
خـــاوەن بـەشـــی نەختێـــنە مرۆڤێـــکە لە دونیـــا
قەســـرێکی بەهەشتـــی هەیە شۆخێـــکی مناڵـــە
هەرگیز لە سەکۆی مەیکەدەیی عەشق نەکەی نـــاز!
پاڵشتـــی پـــەڕم بـۆچـیـــیە خشتـــم کـــە لـە پاڵـــە
مەفرۆشـــە بە بـــاخی ئیرەم و ســەروەتی شـــەدداد
ماچێـــکی دەمـــی یـــار و گوڵاوێکی پیاڵـــە
تا کەی کەسی دونیـای پـەسی ئەی دڵـی وەشیـار!
جوانی وەکو تۆ حەیفـــە لەگەڵ ئـــەم ژنە زاڵـــە
کـــوا رێـــڕەوی ئەهلـــی دڵ و دڵ‌پـــاک بفەرمـــێ
ئالـــوودە کە عالـــەم بە جبـــەی شێـــخی بەتاڵـــە
«حافـــز» کە سەری زولفتی بەردا نـــە بە خـــۆی بوو
فـــەرمانی فەلـــەک وابـــو کە فەوتـــانی مەحاڵـــە
پـــەنگاوی بزەت بۆ وە دەبـــێ خـــۆر دەمی لێـــنێ
«کـــۆلیل» بلـــێ چی، کە نەسیـبی قـــەل و داڵـــە

آن غالیه خط گر سوی ما نامه نوشتی
گردون ورق هستی ما درننوشتی

هرچند که هجران ثمر وصل برآرد
دهقان جهان کاش که این تخم نکشتی

آمرزش نقد است کسی را که در این‌جا
یاری‌ست چو حوری و سرایی چو بهشتی

در مصطبه‌ی عشق تنعّم نتوان کرد
چون بالش زر نیست بسازیم به خشتی

مفروش به باغ ارم و نخوت شدّاد
یک شیشه می و نوش لبیّ و لب کشتی

تا کی غم دنیای دنی ای دل دانا
حیف است ز خوبی که شود عاشق زشتی

آلودگی خرقه خرابی جهان است
کو راهروی اهل دلی پاک‌سرشتی

از دست چرا هشت سر زلف تو حافظ
تقدیر چنین بود چه کردی که نهشتی

لە کۆشکی یارەوە دێ بۆنی عوود و دڵ حەزی دەم بوو
نیساری خاکی بەری پایەکەم گڵی دڵی پۆڵوو
سلاوی دۆس شنەفتن سەعادەتە و رەحەتی لەش
سلاوی من بە سوعادەم، سەبا! دەسا بەرە زوو زوو
وەرن شەوانە تەماشا کەن ئەشکی ئاڵی غەریبان!
لە گوێنی خوێنی شەرابێ لە جامی شامییە جەم بوو
دەمێ کە تەیری ئەوینێ لە (زیل ئەراك) ئەگمێنێ
نەبێ لە ناڵە جودا کۆتری چەمەن وەکو پێشوو
کەمێکی ماوە بەسەرچێ زەمان و کاتی جودایی
دیارە چون لە چیاکانی یار خێوەتی مێژوو
چ خۆشە ئەو دەمە وادێی و من دەڵێم بە سلامەت
چ هاتنێکی بەخێر و چ خێرە زەحمەتی فەرموو
لە تۆیە دوورە دەسم بۆیە وەك هیلالی برۆتم
ئەگەرچی مانگی تەواوی روخت لە بەختی مە داچوو
بەهەشتم ئەر بدەنێ تا وەفا نەکەم بە بەڵێنم
نە خەو بە دیدە دەچێت و نە گیانە مایلی مینوو
بە ئەو ئومێدە کە زووتر بە ئەو دو چاوە ببینم
کە ئێوە شاهی وڵات و منم کە نۆکەری هەر دوو
پڕەنگە شیعری ئەتۆ «خاجە»! چەشنی رشتەیی یاقووت
گرەو دەباتەوە گاهێ لە نەزمی شیرنی خاجوو
لە تەختەنەردی ئەوینت لە مێژە شەشدەرە «کۆلیل»
نە شیعری ملکەچی ئێمە و نە سێحری نێرگزی جادوو

أَتَتْ رَوائِـــحُ رَنْـــدِ الْحِمــی وَ زادَ غَـرامـی
فــــدای خـــاک در دوست بـاد جـان گرامی

پیـام دوست شنیـدن سعادت است و سلامت
مَنِ المُبَلِّـــغُ عَنّــی اِلــی سُعـــادَ سَـــلامی

بیـــا به شـــام غریبـان و آب دیده‌ی من بین
به‌ســـان بـاده‌ی صـافی در آبگینه‌ی شامی

إذا تَغَـــرَّدَ عَـــنْ ذِی الأراکِ طـائِـــرُ خَیـــرٍ
فَلا تَفَـــرَّدَ عَـــنْ رَوضِهـــا أنِیـــنُ حَمـــامی

بسی نمانـــد که روز فـــراق یـــار سر آیـد
رَأیْتُ مِنْ هَضَبـــاتِ الْحِمـــی قِبـابَ خِیـامِ

خوشـا دمی که درآیی و گویمت به سـلامت
قَـــدِمْتَ خَیْـــرَ قُـــدومٍ نَزَلتَ خَیْـــرَ مَقـــامِ

بَعِـــدتُ مِنْـــکَ وَ قَـــدْ صِـرْتُ ذائباً کَهِـلالٍ
اگرچه روی چو ماهت ندیـــده‌ام به تمـــامی

وَ إن دُعِیتُ بِخُلـــدٍ و صِـرْتُ ناقِـضَ عَهْـدٍ
فَمـــا تَطَیَّبَ نَفْســـی وَ مَـــا اسْتَطابَ مَنـــامی

امیـــد هست که زودت به بخت نیـک ببینم
تو شـــاد گشته به فرمانـــدهی و من به غلامی

چو سلک در خوشاب است شعر نغز تو حافظ
که گـاه لطف سبـــق می‌برد ز نظـم نظـامی

سینە لێوان لێوی زامی سەختە یارەب مەڵهەمێ!
گیان لە تەنیایی گەیشتە لێوی دڵ بۆ هەمدەمێ

کێ لە ئەم گەردوونی گەردانە دەروونی هێورە
بێنە ساقی جامەکەت تا دڵ لە غەم دەربێ کەمێ

وتمە وەشیارێ ئەشا چۆنم، کەنی فەرموی عەجەب
رۆژگارێ سەخت و دونیایێکی پڕ پێچ و خەمێ!

بێژەنی سەبرم لە چای ئەشقی مەنیجا سووتیا
بێخەبەر خوسرەو لە حاڵم تا بنێرێ رۆسەمێ

ئەمن و ئاسایش لە رێی دڵداریا دەرد و بەلاَن
دڵبرین بێ کێ لە دەردی تۆ بخوازێ مەڵهەمێ!

کۆی ئەویندارا نە جێگەی نەوسن و نازاوییە
رێڕەوی ئەم رێگە هەستی گڕدەرە و پوختەی غەمێ

ئادەمێ دەس ناکەوێ ئێستا لە خاکی عالەما
عالەمێ تر سەر لە نۆ پێویستە بێت و ئادەمێ

سا وەرن دڵ بەینە کیژی چاورەش و شۆخی (سەقز)!
چون لەوێ بۆی عەتری دەشتی (موکریان) دێ هەر دەمێ

شیوەنی «حافز» لە لا بەرزی دەماخی ئێوە چین
تۆ کە حەو زەریا لە کن سامانی عەشقت شەونەمێ

خاکی کوردستانی «کۆلیل»ـت هەوێنی عاشقین
شیرن و فەرهاد ئەڵێن ئەم بەڵگە بۆ زین و مەمێ

سینه مالامال درد است ای دریغا مرهمی
دل ز تنهایی به جان آمد خدا را همدمی

چشم آسایش که دارد از سپهر تیزرو
ساقیا جامی به من ده تا بیاسایم دمی

زیرکی را گفتم این احوال بین خندید و گفت
صعب روزی بوالعجب کاری پریشان عالمی

سوختم در چاه صبر از بهر آن شمع چگل
شاه ترکان فارغ است از حال ما کو رستمی

در طریق عشق‌بازی امن و آسایش بلاست
ریش باد آن دل که با درد تو خواهد مرهمی

اهل کام و ناز را در کوی رندی راه نیست
رهروی باید جهان‌سوزی نه خامی بی‌غمی

آدمی در عالم خاکی نمی‌آید به دست
عالمی دیگر بباید ساخت وز نو آدمی

خیز تا خاطر بدان ترک سمرقندی دهیم
کز نسیمش بوی جوی مولیان آید همی

گریه‌ی حافظ چه سنجد پیش استغنای عشق
کاندر این دریا نماید هفت دریا شبنمی

لە یـــار کێ دەگەیێــنێ سەخـــاوەتی قەڵــەمێ
لە کوێیە ســروە ئەگەر مـەرحەمەت دەکا کەرەمێ
گەیشتــووم بەمە کاری عەقڵ لە رێگــەی ئەویـــن
چما بە شـــەونمە نووسینی خەت لە کوڵمی چەمێ
ئەگەرچی خـەرقە لە رەهنی مەیــم سەرێ بدە لێم!
بـــزا لە ماڵـــی وەقـف وا لە ماڵـــما درەمـێ
قسـەی لەبەر چی و بۆچـی فەلەک نەکەی ئەی دڵ!
پیاڵە بگرە دەمــێ! خۆش لە عومری خۆ بە ژەمــێ
بـڕۆ مەسیـح دەمــێ دەس‌خــە ئەی دەرون مردووا!
حـەکیمی خـاک‌نشین دەردی عەشقی نەبوە دەمـێ
دڵم لە گەنـــدی نهێـــن و زمـــانی چـەور پـڕە
لە دەرکی مەیــکەدە وا چــاکە هەڵبدەم عەلەمــێ
وەرن! کە کــات‌شناسان ئەدەن هــەموو عالـــەم
بە یەک پیاڵە شـــەراب و دەمــێ لەگەڵ سەنەمێ
نە عەیش و نۆشە هەموو هەر نیشانی عەشق و ئەوین
رەفێــقی ئێمــەی ئەگەر، بێ بچێــژە نێشی غەمێ!
لە هـــەوری رەحمــەتی یــارم نەبوو شـکات بەڵام
نەبوو لەگەڵ دڵــی تینــوو کەرەم‌نمێـــکی دەمێ
چ بوو بە یەک زەلی کەس ناکڕێ؟! کەسێکی وەها
کە کانی شەکـری دەرێنــاوە هەر لە زەل قەڵەمــێ
شیــاوی خزمەتـی شا، «خاجە» دەستی خاڵییە هــەر
مەگەر دوعــا لە شەوێـک و بەیــانی زیل و بەمــێ
نە هەرکە لایەقــە «کۆلیــل»! وەک پەپــوولە بکات
مەگەر هەتا بە سەحـەر زەڕ بدا لە شـــەوقی شەمێ

ز دلبـــرم که رســـاند نـــوازش قلمـــی
کجاست پیـک صبا گر همی‌کند کرمـی
قیـــاس کردم و تدبیـــر عقـل در ره عشق
چو شبنمی است که بر بحر می‌کشد رقمی
بیا که خرقه‌ی من گرچه رهن میکده‌هاست
ز مـــال وقف نبیـــنی به نـام من درمـــی
حـدیث چون و چـرا دردسر دهد ای دل
پیـــاله گیر و بیاسا ز عمـــر خویش دمـــی
طبیـب راه‌نشیـــن درد عشـــق نشنـــاسـد
برو به دست کن ای مرده دل مسیح دمـــی
دلـم گرفت ز ســـالوس و طبل زیر گلیـم
به آن کـــه بر در میـــخانه برکشـم علمـــی
بیـــا که وقت‌شناســـان دو کـون بفروشنـد
به یک پیاله مـی صاف و صحبت صنمـــی
دوام عیش و تنعـــم نه شیـوه‌ی عشق است
اگر معـــاشر مـــایی بنـوش نیش غمـــی
نمی‌کنـم گله‌ای لیـک ابر رحمت دوست
به کشتـــه‌زار جگرتشنـــگان نـــداد نمـــی
چرا به یک نی قنــدش نمی‌خرند آن کس
که کرد صـــد شکرافشـــانی از نی قلمـــی
ســـزای قدر تو شاها به دست حافظ نیست
جـــز از دعـــای شبـــی و نیـــاز صبحدمـــی

شوکری حەق دابی هەموو دادە وەتەن، سولتانی
واتە ئەحمەد کوڕی وەیسی حەسەنی ئێلخانی
خاوەنی شان و شکۆ سەروەری سالارنەسەب
ئەو کەسەی پێی دەکەوێ گیانی جەهانی دانی
ئافەرین ئەی ئەوە وا لوتفی خودا بۆ گەلی گشت
دیدە نەیدیوی کەچی نوور لەسەر چاوانی
گەر بە بێ ئێوە هیلالێ بە دەرێ دوو لەت ئەبێ
بە سەرئەنگوشتی (موحەممەد)، مەدەدی سوبحانی
شەوقی ئیقبالّی ئەتۆ دلّبەری هەر شاهـ و گەدان
چاوی دژ کوێرا! کە هەم گیانی و هەم گیانانی
شەوی کاکۆلّی ڕەشت شەق کە! کە نێوچاوی ئەتۆ
بە خەبات ئەسکەنەرین و بە کەرەم خاقانی
پڕ لە یادت مەی و مینایە ئەگەرچی دوورین
وەک یەکن دوور و نزیکی سەفەری ڕۆحانی
خونچەیێکم بە دەمۆ پێنەکەنی شیرازی
مەرحەبا بۆ شەتی بەغداد و بزەی ڕێحانی
ڕازی عاشق کە لە بەر دەرکی ئەوین خاک نەبێ
کەیە ئازا لە غەم و مەینەتی سەرگەردانی
ئەی سەبا! بێنە لە بەر دەرکی عەزیزم گەردێ
تا بە ئەو خاکە دلّی«خاجە» ببێ نوورانی
ئێستە سولّتان ئەوەنی زۆرە، گەلی «کۆلیل»ـم
فەلەکولّئەتلّەسی کەڕ کردووە ئەلئامانی

اَحْمَدُ اللهَ عَلَی مَعْدِلَةِ السُّلْطانِ
احمد شیخ اویس حسن ایلخانی

خان بن خان و شهنشاه شهنشاه نژاد
آن که می‌زیبد اگر جان جهانش خوانی

دیده نادیده به اقبال تو ایمان آورد
مرحبا ای به چنین لطف خدا ارزانی

ماه اگر بی تو برآید به دو نیمش بزنند
دولت احمدی و معجزه‌ی سبحانی

جلوه‌ی بخت تو دل می‌برد از شاه و گدا
چشم بد دور که هم جانی و هم جانانی

برشکن کاکل ترکانه که در طالع توست
بخشش و کوشش خاقانی و چنگزخانی

گرچه دوریم به یاد تو قدح می گیریم
بُعد منزل نبود در سفر روحانی

از گل پارسیم غنچه‌ی عیشی نشکفت
حبّذا دجله‌ی بغداد و می ریحانی

سر عاشق که نه خاک در معشوق بود
کی خلاصش بود از محنت سرگردانی

ای نسیم سحری خاک در یار بیار
که کند حافظ از او دیده‌ی دل نورانی

کـات و پێ غەنیمـەت بێ تا دەمـێ کە دەتوانی
چونکە بەرهەمی ژیـن ئەی گیان دەمێکە دەڕوانی
کـام ئەگەر عەتا کا گەردون ژیـان ئەسێنێ لێت
بەس نەکەی کە زایەی کەی حەققی ژین بە هەرزانی
باخـەوان کە من مالّم لێـرە چوو حـەرامت بێ
گەر لە جێگەما سـەروێ غەیـری دلّبـەرم دانی
زاهیـدی پەشیمـانی مەیـلی بـادە ئاخر کوشت
کـاری وا نەکەی عاقـڵ! بتکوژێ پەشیمـانی
موحتـەسیب چ نازانـێ ئەو هەموویە هەن سۆفـی
جنسی خەلّـوەتی، چەشنی لەعلی سووری رومانی
پووچی مەگرە ئەی شەککەردەم هەواری شـەونالاّن
ئیسمی ئەعزەمـی پێیـە و خاتـەمی سولەیمـانی
پەنـدی عـاشقان گوێ بە و لێـدە تەپڵی ئازادی!
چونکە ئەونە نـازی دلّ بەی بە عالەمـی فانـی
یـوسفی عەزیـزم چوو ئەی برادەران رەحمـێ!
دلّ غـەمیـن ئەبیـنم بۆ رۆلّە بابی کەنعـانی
لافـی رەندی لا سۆفـی لێنـەدەی کە ناوترێ
بۆ حـەکیمی نامەحـرەم رازی دەردی پەنهـانی
تون مەڕۆ دەترسـم من گیانەکەم! کە مانـدوو بی
هەی لە ڕێگە بە مژۆلاّن خەلّک ئەکەی بە قوربـانی
با لە تیـری دوو چـاوت شێـردمۆ دلّ، ئەبرۆتـان
ئەو کـەوان بە دەستی گوستاخە چوو دەری هـانی
جـەم کە ئەم پەرێشانی «حافـز»ەت بە خێری خۆ
ئەی خـەمی کەزێکانت هەر هەمـوو پەرێشـانی
ئەی دەلالی مـەرمـەڕ دلّ! گەر نەپرسـی ئەحوالّم
وا دەبـەم شـکاتـی خـۆ بۆ سکەنـدەری سـانی
لێم گەڕن وەکوو «کۆلیـل» ئەو دلّـەم ئەوەن کەیلـە
نووحـی دیـدە هەمدیسـان وا بەڕێـوە تۆفـانی

وقت را غنیمت دان آن قدر که بتوانی
حاصل از حیات ای جان این دم است تا دانی
کام بخشی گردون عمر در عوض دارد
جهد کن که از دولت داد عیش بستانی
باغبان چو من زین جا بگذرم حرامت باد
گر به جای من سروی غیر دوست بنشانی
زاهد پشیمان را ذوق باده خواهد کشت
عاقلا مکن کاری کآورد پشیمانی
محتسب نمی‌داند این قدر که صوفی را
جنس خانگی باشد همچو لعل رمانی
با دعای شب‌خیزان ای شکردهان مستیز
در پناه یک اسم است خاتم سلیمانی
پند عاشقان بشنو و از در طرب بازآ
کاین همه نمی‌ارزد شغل عالم فانی
یوسف عزیزم رفت ای برادران رحمی
کز غمش عجب بینم حال پیر کنعانی
پیش زاهد از رندی دم مزن که نتوان گفت
با طبیب نامحرم حال درد پنهانی
می‌روی و مژگانت خون خلق می‌ریزد
تیز می‌روی جانا ترسمت فرومانی
دل ز ناوک چشمت گوش داشتم لیکن
ابروی کماندارت می‌برد به پیشانی
جمع کن به احسانی حافظ پریشان را
ای شکنج گیسویت مجمع پریشانی
گر تو فارغی از ما ای نگار سنگین‌دل
حال خود بخواهم گفت پیش آصف ثانی

غزل شماره ۴۷۳

دەروون ئەی گیـــان ئەزانـــی پڕ لە عەشقی تۆیە پەیمـــانی
کە هەم نەدیـــار ئەبیـــــنی هەم نەوتـــــراوی دەرون زانـی
چوزانێ لـــۆمەچی ئاخـــر لە نێـــوانی من و تـــۆ چیـــن
سپـــی چاوێـــکی بێـدڵ کەی دەبیـــنێ رازی پـــەنهـــانی
کەزێ فـــــەرموو پەرێشان! وشکەسـۆفی بێـــنە رەقسێ تا
هـــەزاران بت لە هەر پیـــنەی کـەواکەی بێـــنە سەیـــرانی
گرێ لابەر لە گیانی عـــــاشقان ئەو دڵـــــگر ئەبرۆیـــەن
دەمـــێ دانیشـــە تۆخـــوا بـێ گرێ چینـــێ لە پێشـــانی!
لە ســـوژدەی ئادەمـــا قـەستی مەلەك پابـۆسی تۆ بوو چون
لە تۆ یەك خاڵـی دی سـەرتر لە خـاڵ و خەتتـی ئینســـانی
کە عـــەتری پرچی گیـــانان روون ئەکا چـــاوانمان یـــارەب!
نەشێـــوێ بەزمـــی ئـەم کـۆڕەت بە زریـــانی پەرێشــــانی
خەوی سوح دەرفەتی شایـی شەوی سەد حەیف لـێ‌سەنـدم
نەبوو قـــەدری دەمـت ئەی دڵ! مەگەر هەر کاتی رامـــــانی
لە دەستـی هاوەڵانی رێ، پەشێـــوی شێـــوەیێ چـا نیـــن
بە گیـــانی بکـــرە ســـەختی رێ بە یـــادی دەوری ئاســـانی
خەیـــاڵی لوولـی زولفـــی «حافـــز»!! داوی فریـوە و بەس
دەبـێ فیکـــری دەقولبـــابێ مەحـــاڵی وا لە سـەر دانـــی
«عـــــومەر» ئەو کاتە چەرخی چـاوەکانت بێقـــەراری کرد
کە چەرخـــی کردە ئاشـــێ هەر بە نازێـــکی برۆکانـــی

هواخــواه تــوام جانــا و می‌دانــم که می‌دانــی
که هم نادیــده می‌بیــنی و هم ننوشته می‌خـوانی

ملامت‌گو چه دریــابد میــان عــاشق و معشــوق
نبیــند چشــم نابیــنا خصـوص اســرار پنهــانی

بیفشـان زلف و صوفی را به پـابـازی و رقـص آور
که از هر رقعــه‌ی دلقـش هـــزاران بت بیفشــانی

گشاد کار مشتــاقان در آن ابــروی دلبــند است
خـــدا را یک نفس بنشیــن گره بگشـا ز پیشــانی

ملک در سجــده‌ی آدم زمیـن بوس تو نیـت کرد
که در حسن تو لطـفی دیـد بیش از حد انســانی

چـراغ افــروز چشــم ما نسیــم زلف جانـان است
مبــاد این جمـع را یــا رب غـم از باد پریشــانی

دریغا عیش شبـگیری که در خواب سحر بگذشت
ندانی قــدر وقت ای دل مگر وقتــی که درمــانی

ملــول از همـــرهان بودن طریـق کاردانی نیست
بکش دشــواری منـــزل به یــاد عهـد آســانی

خیــال چنبــر زلفش فـــریبت می‌دهـد حافـظ
نگــر تا حلقـــه‌ی اقبــال نـاممکـــن نجنبــانی

چــی خەڵــکە وتوویانە بە تۆ یۆسفــی ســانی
کردوومــە بە دڵ ســەیرت و ســەرتر لە ئــەوانی
شیــرین‌تری بەو شەکری کەنیــنەت لەوە بێــژم
کەی خوســرەوی شیــرینم ئەتۆ شەکری زەمانی
بێ‌جێــیە بە خونچــەی بچووێنــم دەمی چووکت
کەی خونچە وەها تەنگە دەمـــــی گفت و بەیانی
ســـەد جــارە وتت لەو دەمە ماچێکی ئەدەم پێت
وەک سوێــسنە بۆچی کە بە سەد جۆرە زمــانی
فــەرمووتە ئەگەر کامت ئەوێ گیانــم ئەوێ لێت
ترســـم هەیە ئەویان بکـــەی ئەمیــانە وەلا نی
چاوت سپــەری گیــان کون ئەکا تیــری تەماشــای
کــێ دی لە نەخۆشێــک ئەوەن هێــزی کەوانی
هەرکەس نەفەسێــکی لە نــەزەر دوور بفــەرمووی
دەتکــێ وەکــو ئەســرین لە دیــەی خــزم و بیــانی
پــــەنگاوی بزەت خۆر دەمــی لــێ‌نــاوە دەزانــم
چــەن سەختە کە «کۆلیــل» وەکــوو زەڕڕە نەزانی

گفتند خلایق که تویی یوسف ثانی

چون نیک بدیدم به حقیقت به از آنی

شیرین‌تر از آنی به شکرخنده که گویم

ای خسرو خوبان که تو شیرین زمانی

تشبیه دهانت نتوان کرد به غنچه

هرگز نبود غنچه بدین تنگ‌دهانی

صد بار بگفتی که دهم زان دهنت کام

چون سوسن آزاده چرا جمله زبانی

گویی بدهم کامت و جانت بستانم

ترسم ندهی کامم و جانم بستانی

چشم تو خدنگ از سپر جان گذراند

بیمار که دیده‌ست بدین سخت‌کمانی

چون اشک بیندازیش از دیده‌ی مردم

آن را که دمی از نظر خویش برانی

بە ئەو نیشـــانە شـــەماڵی دەمـــی بەیـــان! کە دەزانـــی
بـــڕۆ بە خزمەتـــی یـــارم لە هەر زەمـــان کە دەزانـــی
لە ڕێتـــە چـــاوی دڵ ئەی نامـــەبەر بە خەڵـــوەتی رازی!
بە هێـــوری، بە لەتـــافەت، وەهـــا رەوان کە دەزانـــی
بڵـــێ کە گیـــانی شرین تۆ بی و خودا! لە دەســـم چوو
کەرەم لە لێـــوی مەسیحـــی بکا، هەمـــان کە دەزانـــی
وەهـــامە نووسیيـــە ئەم نامـــــە من کە غـــــەیرە نەزانێ
وەهـــایە تـــۆش وەخوێنـــی بە لوتفتـــان کە دەزانـــی
ئـــەوینی تێغـــی ئەتـــۆ بۆ مـــە چـــەشنی ئـــاون و تینـــوو
بکـــووژە دیلـــی دەســـی خۆ! وەهـــا گران کە دەزانـــی
چلـــۆن کەمـــەربەنی زێـــڕت بگـــا بە دەستی ئومێـــدم
لەتیـــفەیێـــکە نیگـــارا! لـــەوێ نیـــهـــان کە دەزانـــی
یەکێـــکە «خاجـــە»! زمانی ئەوینی عورب و عەجەم، بەس
ئەوین‌دوێنـــی دڵت بـــی! بە هـــەر زمـــان کە دەزانـــی
نەبـــی لە خزمەتی شەم گەر وەکوو پەپوولە «عومەر» قەت
نـەدەی لە مەزهـــــەبی ئـەو دەم لە گفتمـــان کە دەزانـــی

نسیم صبح سعادت بدان نشان که تو دانی
گذر به کوی فلان کن در آن زمان که تو دانی

تو پیک خلوت رازی و دیده بر سر راهت
به مردمی نه به فرمان چنان بران که تو دانی

بگو که جان عزیزم ز دست رفت خدا را
ز لعل روح‌فزایش ببخش آن که تو دانی

من این حروف نوشتم چنان که غیر ندانست
تو هم ز روی کرامت چنان بخوان که تو دانی

خیال تیغ تو با ما حدیث تشنه و آب است
اسیر خویش گرفتی بکش چنان که تو دانی

امید در کمر زرکشت چگونه ببندم
دقیقه‌ای‌ست نگارا در آن میان که تو دانی

یکی‌ست ترکی و تازی در این معامله‌ی حافظ
حدیث عشق بیان کن بدان زبان که تو دانی

دو یـــاری قەشمـــەر و وریـــا، شـــەرابی کۆنـــە مـەنـێ
دلێـــکی خـــۆش و کتێبێك و سەرچـــەم و چەمـــەنێ
من ئەو هـــەل و دەمـــە ناگـــۆڕمۆ بە هەر دو جەهـــان
بکەونـە شوێـــنم ئەگـەرچی هەموو دەم ئەنجومـــەنێ
کەســێ کە کونجـی قەناعەت بـدا بە گەنجی جەهـــان
یەقیـــن کە یـــۆسفی میســری ئـەدا بە تـالە بەنـێ
وەرن لە رەونەقـــی گـــەردون کە هیـــچ کـەم نـابێ
بە زوهـدی وشـکی ئەتۆ یا گـــوناحی ئێمـــە، پەنـێ
لە گەردەلوولـــی زەلانـــــی زەمانـــــــە نـایەتە چـاو
کە بوو لە بـــاخ و چەمـــەن هەر گولێك و یاســەمەنـێ
ببینـە نەخـش و نیـــگاری حـــەرەم بە جامـــی دەرون
کەســێ لە بیـــری کە بەمـــجۆرە نـایە، بـــا زەمەنـــێ
لە ئەم گك ژەهـــرە کە زریـــان لە مێـــر گولانی پژان
عەجەب کە مـــاوە گولـــێ بـۆی و رەنگی نەستـەرەنێ
سـەبـــر لە دەس مـــەدە ئـــەی دڵ! کە کلـــکەوانەی وا
گـــران، خـــودا بەدەرێنـــێ لە دەستـــی دێـــوەگـەنێ
خەیـــــالی پەرتـــە فەلـــەك بەم بەلایە «حافز»! ئەرێ
لە کوێیە هۆشی (تەبیب)ێك و (رای) و (بەرهەمەن)ـێ
وەرە و لە بـــا رەشـــی پاییـــز ئەمێستـــە بڕوانـــە
کە چـۆن لە گـــوڵ، گـەل و «کۆلیـل» و باخ رادەچەنێ

دو یـــار زیـرک و از بـاده‌ی کهن دو منی
فراغتـــی و کتـــابی و گوشـــه‌ی چمنـــی

من این مقـــام به دنیـــا و آخــرت ندهــم
اگرچه در پـــی‌ام افتنـــد هــر دم انجمنی

هر آن‌که کنـــج قنـاعت به گنج دنیـا داد
فروخت یوسف مصری به کمتـرین ثمنـی

بیـا که رونـق این کارخـــانه کـــم نشـود
به زهـد همچو تویی یا به فسق همچو منـی

ز تنـــدباد حـــوادث نمی‌تـــوان دیـــدن
در این چمـن که گلی بوده است یا سمنـی

ببیـــن در آینـــه جـــام نقش‌بنـــدی غیب
که کس به یـــاد ندارد چنیـــن عجب زمنـی

از این سمـوم که بر طرف بوستان بگذشت
عجب که بوی گلی هست و رنگ نسترنی

به صبر کوش تو ای دل که حق رهـــا نکند
چنـــین عزیـــز نگیـــنی به دست اهـــرمنی

مـــزاج دهـــر تبـــه شـــد در این بـلا حافـــظ
کجـــاست فکر حکیـــمی و رای برهمنـی

مەیلـی فەرموو! جـامی لەعلی یەك مـەنی
تـا لە دڵ ریشـــەی غەمـــی پێ هەڵکـەنی
وەك سوراحـی دەركی دڵ با تـاك بـێ
چەشنی كووپەت سەر بە قـوڕ بون تا چەنی؟!
هەڵقوڕێنـــی ئـــاوی بێخۆیـــی كە زۆر
كـەم لە لافـــی مـنمنـی خۆتـــا بـەنی
پێ بە جێ هەر وەك چیا بی نەك وەك ئاو
رەنگ ئەگـۆڕێ ئـەو كە بۆ تـەڕدامـەنی
دڵ بە مــــەی رەنـــدانە بسپێـرن هەتـــا
تێشـكێ زوهـدی ریـایـــی گـەردەنی
زوو بە وەك «حافـــز» خەبـاتێ بەڵكە خۆ
خەیتە بەر پـێ و خاكی چەشنی گوڵشـەنی
دوێ وتـــم «كـــۆلیل»ـی بالآتم وتـــی
عاقیـــبەت بۆ بەژنـــی من ســـەر دادەنی

نوش کن جام شراب یک منی
تا بدان بیخ غم از دل برکنی

دل گشاده دار چون جام شراب
سر گرفته چند چون خمّ دنی

چون ز جام بیخودی رطلی کشی
کم زنی از خویشتن لاف منی

سنگ‌سان شو در قدم نی همچو آب
جمله رنگ‌آمیزی و تردامنی

دل به می دربند تا مردانه‌وار
گردن سالوس و تقوا بشکنی

خیز و جهدی کن چو حافظ تا مگر
خویشتن در پای معشوق افکنی

ئاوەنگی سوبحە ئەشکی دیيەی هەوری ڕێبەنان
ساقی سەبووحی ئێمە بە لیوانە گەورەکان!
نوقمم لە بەحری خۆپەسەنی، تێکە بۆم شەراب!
چون ئەم گەزاف و لافە شەرابی فەقەت دەوان
نۆشینی خوێنی پیالە حەلاڵە و ڕەوا بەهۆی
عەشقی دو چاوی مەستی کە شایانە هەر لە شان
وریا بە ساقیا کە کەمینی خەمم لە ڕێن!
موتریب هەر ئەو نەوایە کە پەنجەت لەسەر خزان
مەی بێنە ساقی! سەر لە بناگوێمە چەنگ ئەڵێ
خۆش رابوێرە، بژنەوە لەم پیرە کۆمەتان
مەی تێکە! چونکو موتریب ئەڵێ دەوڵەمەندە یار
ساقی قەسەم بە تەبعی بڵێندی قەڵەندەران
تۆ بیت و چاوی مەستی لە کەس بێ‌نیازی خۆت
مەیخانەکەت نەبەستی لە «کۆلیل» و بێکەسان

صبــح است و ژالــه می‌چــکد از ابــر بهمنی
برگ صبــوح ســاز و بــده جـام یک منـی

در بحــر مـــایی و منـــی افتـــاده‌ام بیـــار
مـــی تا خـــلاص بخشـــدم از مـایی و منـی

خــون پیاله خــور که حـــلال است خـون او
در کار یـــار بـاش که کـــاری‌ست کردنـــی

ســاقی به دست باش که غــم در کمین ماست
مطــرب نگـــاه‌دار همیـــن ره کـــه می‌زنـــی

می ده که سر به گوش من آورد چنگ و گفت
خـــوش بگـــذران و بشنـــو از این پیـر منحنـــی

ســـاقی بـه بی‌نیـــازی رنـــدان که مــی بـده
تـــا بشنـــوی ز صـــوت مغنّـــی هُـــوَالْغَنـــی

ئەی ئەوەی خوێنی مە دەڕژێنــی و مـەودات نییە
سـەرف و سەرمـایە دەسووتێنی و پـەروات نییە
دەردەدارانـی بەلاَ ژاری هــەلاهــەل بە دەســن
قــەستی ئەم خێــڵە خەتەرناکە نەکـەی! هات نییە
کە دەکا گۆشـەیی چـاوت دڵی ئەو خەڵکە دەوا
ئەمــە کـــەی دادە کە ئینســـافی مــوداوات نییە
چـاوی ئەم کۆڕە کە زەریا بە دنەی وەسڵتە بـۆچ
عـــــەزمی سـەیرانی شەپۆل و لچی زەریـات نییە
چی دەکەن نەقڵی خراپی لە خــدەی جوانی ئەتۆ
قیــن و بوغـــزی دژە، تۆ قـەت سـتـەمی وات نییە
کەڕەتـێ زاهیـدا! ئەگەر مانـــگی مە هەڵبێت لە تۆ
لە خـــودا غـــەیری مــەی و لێـوی تەمەننات نییە
«حافـــز»ا! سوژدە لە ئەبرۆی وەکو میحرابی بـەرە
لەســـەر ئەو تاقــە نەبـــێ تۆ کە دوعــا لات نییە
لەوەتــا ســوژدە لە چــاوت دڵـــی «کۆلیـــل» دەبا
لە گوڵـــی نێــرگزی قەت زەوقی مــولاقات نییە

ای که در کشـــتن ما هیـــچ مـــدارا نکنـــی
سـود و سرمـــایه بسـوزی و محـــابا نکنـــی
دردمنـــــدان بـــــلا زهـــــر هلاهـــل دارنـد
قصــــد این قـــوم خطا باشـــد هان تا نکنـــی
رنج ما را که توان برد به یک گوشه‌ی چشم
شـــــرط انصـاف نبـــاشد که مداوا نکنـــی
دیـــــده‌ی ما چو به امیـــد تو دریاست چـــرا
به تفـــرج گـــذری بر لب دریـــا نکنـــی
نقـــل هر جـــور که از خلـق کریمت کردند
قول صاحب‌غرضـــان است تو آن‌هـــا نکنـــی
بر تو گر جلـــوه کند شـــاهد ما ای زاهـــد
از خـــدا جز مـــی و معشـــوق تمنـــا نکنـــی
حافظـــا سجـــده به ابروی چو محـــرابش بـر
که دعـایی ز سر صـــدق جز آن‌جـا نکنـــی

لە غـــەم ئازادی کە بە گوێی منی ئـازادە بکـەی
خوێنـی دڵ خۆری کە داوا بەشی بێوادە بکـەی
دەستـی ئاخـر گڵی بەردەستی گەلی گۆزەگـەری
کووپەیێ ئێستـە دەبێ پڕ لە شـەمی بادە بکـەی!
گەر لەوانـەی کە بە ئاواتـی بـەهشتـی هەر ئەشێ
بـادەنۆشی لەگـەڵ ئەم خێـڵە پەریزادە بکـەی
نەکوتـی دەم لە کـەراماتی گەلی گەورە بە لاف!
مەگە مـاف و کەرەسـەی گەورەیی ئامادە بکـەی
خێرت ئەی خوسرەوی شیـرینەدەمەکان سەد لا بێ!
نەزەرێ گەر بە کـەرەم لەم دڵە فەرهـادە بکـەی
خاتـرت دوورە لە هـەڵگرتنی نەخشـی کەرەمـێ
لەوحی دڵ لەو هەمـو نەخشـانە مەگەر سادە بکـەی
بە کـەرەم کاری دەرون «حـافـز»! ئەگەر بسپێـری
هەر وەکوو دەس لە مل ئیقباڵی خـودادادە بکـەی
ئەی سـەبا خـاکی دەری خاجە جـەلالەددین بـە!
تا جەهـان پڕ لە گوڵ و سۆسـەنی ئـازادە بکـەی
شەکرە ژەهـری دەسی تۆ بۆ دڵی «کۆلیـل» وەکوو
دادە بـۆ ئەو کە بە ئەو زولفـە چ بێـدادە بکـەی

بشنو این نکته که خود را ز غم آزاده کنی
خون‌خوری گر طلب روزی ننهاده کنی
آخرالامر گل کوزه‌گران خواهی شد
حالیا فکر سبو کن که پر از باده کنی
گر از آن آدمیانی که بهشتت هوس است
عیش با آدمی‌ای چند پری‌زاده کنی
تکیه بر جای بزرگان نتوان زد به گزاف
مگر اسباب بزرگی همه آماده کنی
اجرها باشدت ای خسرو شیرین‌دهنان
گر نگاهی سوی فرهاد دل‌افتاده کنی
خاطرت کی رقم فیض پذیرد هیهات
مگر از نقش پراگنده ورق ساده کنی
کار خود گر به کرم بازگذاری حافظ
ای بسا عیش که با بخت خداداده کنی
ای صبا بندگی خواجه جلال‌الدین کن
که جهان پرسمن و سوسن آزاده کنی

ئەی دڵ! بە کـۆی ئەوین چییە ناکەی گوزەر دەمـێ
هەوڵێک نادەی ئەرچی جەم و جۆری وەک جەمێ
چـەوگان بە دەستی ئەمـری کەچی نەتڕفـاند گـۆ
بـــازی سپیت زۆر و شـــکارت نەبـــوو کەمــێ
ئەم خوێنــــە وا شــەپۆلی لە تـۆی جەرگتایە بۆچ
ناکەی بە ڕەنگ و بـۆنی دەلالێ، گوڵێ، شەمـێ؟
تا وەک ســـەبا لە کەوشــەنی ئــازیز ســەر نەدەی
بۆنێـــکی خۆش لە کـۆشی سرشتت چ نادەمـــێ
تاکوو نەچێـــژی ژاری دڕوویـــێ، لە مێـــر گوڵان
پڕ باخـــەڵێ گـوڵاڵە دەترســـم نەکـەی جەمـــێ
گەنجـن لە گیــانی باخەڵەتا بێـنی مـوشک و هیچ
نادەی لە کاکوڵێ ڕەش و زولفـی شـەکەر دەمـێ
لێـــوانی لوتفـە جـامت و قلمـۆ ئەدەی شــەراب
نیــتانە چون لە دەردی خــوماریێ کەمـــێ غەمـــێ
لەم عـــاشقانە «حافـــز»! ئەبێ دوور بی، کــــە وان
کەوتـون لە دەرکی مەحـــرەم و تۆ نیتـە مەحرەمـێ
هەرکەس غوڵامی ئەرکی ئەوین وەک «عومەر» نەبێ
بێسانی عومـــری چۆڵە لە هەر جـۆرە بەرهەمـــێ

ای دل به کوی عشق گذاری نمی‌کنی
اسباب جمع داری و کاری نمی‌کنی
چوگان حکم در کف و گویی نمی‌زنی
باز ظفر به دست و شکاری نمی‌کنی
این خون که موج می‌زند اندر جگر تو را
در کار رنگ و بوی نگاری نمی‌کنی
مشکین از آن نشد دم خلقت که چون صبا
بر خاک کوی دوست گذاری نمی‌کنی
ترسم کز این چمن نبری آستین گل
کز گلشنش تحمل خاری نمی‌کنی
در آستین جان تو صد نافه مدرج است
وآن‌را فدای طُرّه‌ی یاری نمی‌کنی
ساغر لطیف و دلکش و می افکنی به خاک
و اندیشه از بلای خماری نمی‌کنی
حافظ برو که بندگی پادشاه وقت
گر جمله می‌کنند تو باری نمی‌کنی

بەیانی ڕێڕەوێکی رازبینی
بە هاوڕێکەی دەوت نوکتەی شرینی
کە مەی ئەو کاتە مەست و سافە سۆفی!
لە کۆشکی شووشەدا بێ ئەڕبەعینی
خودا بێزارە لەو عابایە سەد جار
کە هەر قۆڵێکی بۆ سەد بت کەمینی
ئەگەرچی باوی جوامێری نەماوە
بە جێ بێنا نیازی نازەنینی!
دەزێ خەرمانت ئەی خاوەن (جەز)و(کۆ)
بەزەت بێ ئەر بە حاڵی خۆشەچینی
نە روخساری مرۆڤی شاد ئەبینم
نە دەردی دین، نە هەتوانی برینی
دەرون تاریکە گشتی مەر لە غەیبۆ
چرایێ هەڵبکا خەڵوەتنشینی
گەر ئەنگوستی سلێمانی نەبوو پێت
دەبێ کەڵکی چ بێ نەخشی نگینی
بەڵێ دابی گورۆی شۆخانە توندی
چ بوو هێور بی جارێ بۆ غەمینی
بڵێ پێم رێی موغان تاکوو بەدی کەم
سەرەنجامم لە فاڵی تاڵەبینی
نە «حافز» دەرسی خەڵوەی دڵ دەبێ فێر
نە زانا ڕێگەزانی کۆی یەقینی
وەکوو «کۆلیل» یارەبی نەبێ کەس
لە شەو ناڵەی جودایی بێ ئەوینی

سحـــــر گه رهـــروی در ســـرزمینی
همـــی گفت این معمـــا با قـــرینـــی
که ای صوفی شـراب آن گـه شود صاف
کـه در شیـــشه بـــر آرد اربعیـــــنی
خـــدا زان خرقـــه بیـــزار است صد بـار
که صـــد بت باشـــدش در آستیـــــنی
مـــروت گرچه نـــامی بی‌نشـــان است
نیـــازی عرضـــه کن بـر نازنیـــنی
ثـــوابت باشـــد ای دارای خـــرمـــن
اگر رحمی کنـی بر خـــوشـه‌چیـــنی
نمی‌بیـــنم نشـــاط عیـــش در کس
نـــه درمـــان دلـی نـــه درد دینـــی
درون‌هـــا تیـــره شد باشـــد که از غیب
چـراغـــی بر کنـــد خلـوت‌نشیـــنی
گر انگشـــت سلیمـــانی نباشـــد
چه خـــاصیت دهـــد نقـش نگیـــنی
اگرچـه رسـم خوبـان تنـدخویی‌ست
چـه باشـــد گر بســـازد با غمیـــنی
ره میـــخانه بنمـــا تـــا بپـرســـم
مـــآل خویـــش را از پیـــش‌بیـــنی
نـه حافـــظ را حضـــور درس خلـــوت
نـــه دانشمنـــد را علـــم الیقیـــنی

مەیلـــی نیشتن لە بەر ئاوێنـــە نەبێ گەر لە ســەرت
خۆت ئەبینـــی کە چ غەوغایێ هەڵەستێ لە سـەرت
تۆ ئەوەی ســەرروەری کردی بە غــولامی لە دەری!
کە کەســـیتر مەنە جێـی پیرە غولامێـکی دەرت
گەوهـەری عەشقە هونەرمان و هەوەس بێهونـەرین
خـزە رێـگا، نەکەوی! گـــەردنی دەشکێ هونەرت
سەروەری عێـلی جووانانی بەهۆی شـەرم و حـــەیا
ئافـــەرین بۆ ئەدەبی سەر لە خـدە و خـوی بەشەرت
بە رواڵـــەت ئـەوە چـاتر بو بە تـۆ ئەی گوڵـی من
کە نەکا ئەم دەمە لوتفـــێ لەگەڵم سەروی تەڕت
چـــارە بۆ عاشقی بێـــچارە فەقەت سـەبرە لەســەر
جەور و بێـــدادی رەقیبـــانی دەر و دەور و بــەرت
بە هـــەوای ئێـــوە لە گوڵـــزارەوە هەستـاوە سـەبا
کە نەبوو نەستەرەن و گــوڵ وەکو زولفی چەمــەرت
نەفەسێ پـــێ بنە ســـەر دیـــدەم و بڕوانە کە چۆن
رەقسی ئەشـــکم لە چەپ و راسەوە دەمژن نەزەرت
خـۆشەویستی کە لە بەرچـــاوی حەقێـــقەتبینان
بێنـــەزەر بژنـــەوە رازێ لە منـــی خـــۆشخەبەرت
نازەنینـــــێ وەکـو تۆ پـــاك وەهـا چـاكە نەبێ
چـاوی پیسی کەسی ناپاك لە کـــۆی موعتەبەرت
گوڕمی لافـــاوی دییەم سەبـــری دڵـی «حافز»ی برد
گەییە ئاخـــر وزەم ئـــەی بیلبیلە بەس بێ گوزەرت!
تۆ بە ئەم شۆخـــی و بێبـــاکییە ئەی مانـــگی پـــڕم
هەر مەگـــەر خاجـــە بکا هـــاڵە لە دەوری قەمەرت
دڵ بە شەوگاری قـژت، کوێـرە لە دیـــداری چەمەن
شەوەقێ هەڵـکە لە کوڵـمی سەحـەری بۆ «عومــەر»ت

تو مگر بر لب آبی به هوس بنشینی
ورنه هر فتنه که بینی همه از خود بینی

به خدایی که تویی بنده بگزیده‌ی او
که بر این چاکر دیرینه کسی نگزینی

گر امانت به سلامت ببرم باکی نیست
بی‌دلی سهل بود گر نبود بی‌دینی

ادب و شرم تو را خسرو مه‌رویان کرد
آفرین بر تو که شایسته‌ی صد چندینی

عجب از لطف تو ای گل که نشستی با خار
ظاهرا مصلحت وقت در آن می‌بینی

صبر بر جور رقیبت چه کنم گر نکنم
عاشقان را نبود چاره بجز مسکینی

باد صبحی به هوایت ز گلستان برخاست
که تو خوش‌تر ز گل و تازه‌تر از نسرینی

شیشه بازی سرشکم نگری از چپ و راست
گر بر این منظر بینش نفسی بنشینی

سخنی بی‌غرض از بنده‌ی مخلص بشنو
ای که منظور بزرگان حقیقت‌بینی

نازنینی چو تو پاکیزه دل و پاک نهاد
بهتر آن است که با مردم بد ننشینی

سیل این اشک روان صبر و دل حافظ برد
بَلَغَ الطّاقةُ یا مُقلَةَ عَیْنی بِینی

تو بدین نازکی و سرکشی ای شمع چگل
لایق بندگی خواجه جلال‌الدینی

غزل شماره ۴۸۴

ساقیا چەتری سەرت هەوری بەهارە و سەری جۆ
با نەڵێم چی کەمە، گەر ئەهلی دڵی نۆبەتە تۆ
نایە لەم خەرقە شنەی بۆنی برایی، وەرە ئەم
دەڵقە ناپاکتە سۆفی لە شەتی بادە وەشۆ!
مەکە باوەڕ بە جەهان و کەرەمی سپڵەیە چون
ئەی جەهانبین غەمی ئەم سپڵە جەفا شوغڵە مەخۆ
بژنەوی گەر لە من ئەم دوو قسە سەد گەنج دەژی
دەرکی خۆشی مەژەنە و دوو، دەمی تۆمەت مەکەرۆ
لە سپاسی ئەوە دووبارە گەیشتی بە بەهار
بەر و بۆی چا بدە! کەچ ڕێگە نەکەی چاکە لە خۆ
نانووێنێ روخی گیانان کە نەبێ دڵ وەکو جام
ناڵی ئەسپێ نییەتی وەك گوڵ و نەسرین بەر و بۆ
گوێ لە بولبول گرە! دەگریت و دەڵێ گەورەم ئەمان
نەفەسی گوڵ بمژە و بەر مەدە یێخەی کوڵ و کۆ
خۆش وتت بۆنی ریا دێ لە دەمی «حافز»ی شار
ئافەرین! چاکی دەناسی نەفەسی خێڵی درۆ
چەشنی «کۆلیل» کەسێ ئێستە ریاکار نەبێ
مەسەلێ باوە دەڵێن: (باڵت ئەوێ یاکو چەقۆ)

ساقیـــا ســـایه‌ی ابر است و بهار و لب جوی
من نگویم چه کن ار اهل دلی خود تو بگوی

بوی یک‌رنـگی از این نقش نمی‌آیـد خیـــز
دلق آلــوده‌ی صــوفی به مـی نـاب بشــوی

سفله طبع است جهـان بر کرمش تکیـه مکن
ای جهان‌دیـده ثبـات قـدم از سفله مجـوی

دو نصیحت کنمت بشنـو و صـد گنـج ببـر
از در عیـــش درآ و بـــه ره عیـب مپـــوی

شـــکر آن را که دگربـــار رسیدی به بهـار
بیـــخ نیکی بنشـــان و ره تحقیـــق بجـــوی

روی جانـــان طلبـــی آینـه را قابـــل ســـاز
ور نه هرگز گل و نسرین ندمد ز آهن و روی

گوش بگشای که بلبل به فغـــان می‌گویـــد
خواجـــه تقصیر مفرمـــا گل توفیـق ببـــوی

گفتی از حافـــظ ما بـــوی ریـــا می‌آیـــد
آفرین بر نفست بـاد که خـوش بردی بـــوی

دوێشەو لە کۆشی ژاڵە بە ئاهەنگی پەهلەوی
دەرسی مەلی سەحەر بو مەقاماتی مەعنەوی
یانی وەرن کە ئاگری مووسا نووانی گوڵ
گفتی ئەوین لە دارەگوڵێ بەڵکە بژنەوی
بولبول تەرانەسازە لە باخ و لەتیفەبێژ
تا خاجە مەستی مەی بن و ئەشعاری مەسنەوی
جەمشید هەر حەکایەتی جامی دەڵێن و بەس
عاشق بە تاج و تەختی جەم و بەختی ئەو نەوی!
ئەم داستانە سەیرە لە شەنسی شەڕم کە یار
کوشتی ژیانی ئێمە بە ئیعجازی عیسەوی!
خۆزگەم بەوەی دەکا خەوی شایی لەسەر حەسیر
ئەم ژینە کەی شیاوە لەسەر تەختی خوسرەوی
وێرانە ماڵی خەڵکی بە نازێ لە چاوەکەت
نەتبێ خومار چاکە کە تا مەستی خوشڕەوی
جووتێری پیر چەندە وتی خۆش بە کوڕ شەوێ
هەرچی بچێنی نووری دیەم هەر وە دەدرەوی
مەیگێڕ زۆری داوە بە «حافز» شەراب وا
شێواوە پێچی مێزەر و کاکۆڵی مەولەوی
«کۆلیل» شەو بە ناڵە دەخا گڕ بە ئاسمان
ڕۆژۆ دەبێ دەبێتە چەت و خەوشی سەر زەوی

بلبل ز شاخ سرو به گلبانگ پهلوی
می‌خواند دوش درس مقامات معنوی
یعنی بیا که آتش موسی نمود گل
تا از درخت نکته‌ی توحید بشنوی
مرغان باغ قافیه سنجند و بذله‌گوی
تا خواجه می خورد به غزل‌های پهلوی
جمشید جز حکایت جام از جهان نبرد
زنهار دل مبند بر اسباب دنیوی
این قصه عجب شنو از بخت واژگون
ما را بکشت یار به انفاس عیسوی
خوش وقت بوریا و گدایی و خواب امن
کاین عیش نیست درخور اورنگ خسروی
چشمت به غمزه خانه‌ی مردم خراب کرد
مخموریت مباد که خوش مست می‌روی
دهقان سالخورده چه خوش گفت با پسر
کای نور چشم من بجز از کشته ندروی
ساقی مگر وظیفه‌ی حافظ زیاده داد
کآشفته گشت طرّه و دستار مولوی

ئـەی بێـخەبەر لە خۆ وەرە دەرا! خۆش‌خەبـەر دەبـی
ڕێ‌بـڕ بە نیـوەشـەو بـە! بە ڕێبــەر سەحـەر دەبـی
ئەی کـوڕ ئەگــەر لە مەکتەبی عەشق و ئەدەب نەبی
دوارۆژ چـۆن بە بــابی ئەویــن و هونــەر دەبـی
مەردانە دەس بشۆ لە مسـی لــەش لە کۆی ئەویــن
بــەو کیمیــایە چـونکـو بە گیـانی گوهـەر دەبـی
لەش‌پــەروەری لە ڕێــز و پلــەی خـۆتی دابــڕی
وەختێ دەگەی بە خـۆ کە لە خەون و لە خۆر دەبـی
گرشەی کە کەوتە گیان و دڵـت نووری عەشقی پاک
وەڵڵا گەلێ لە خـۆری فەلەک ژوور و سـەر دەبـی!
تاوێــک نوقمی بــــەحری خـودا بەو نەکەی خەیـاڵ
هەرگیـز بە حـەوت بەحری جەهان موویە تەڕ دەبـی
ســەر تا بە پــێ لە نــووری ئەویـن غەرقی ئەو دەمە
کە بۆ بــەژنی بەسامــی بە بێ پــێ و ســەر دەبـی
روخســاری جوانی دلبــەرە گــەر دیمــەنی نــەزەر
دەڕوا گومــان، بە ئەهلـی یەقیــن و نــەزەر دەبـی
کاتــێ کە ژێــر و روویــە دەبـێ هەستی تۆ تـەواو
خـۆفـت نەزێتـە سیـنە کە ژێــر و زەبـەر دەبـی
«حافــز»! بە خاکـی دەرکی هونــەروەر ئەگەر ببی
بـڕوا کە پێــم بە وەسڵـی ئەوین بەختــەوەر دەبـی
دڵ بــێ بە (فـووجیــامە)، بە (کـانی‌نــووا) دییــەت
پێت وا نەبێ کە چەشنی شــەوانی «عومــەر» دەبـی

ای بی‌خبر بکوش که صاحب‌خبر شوی
تا راهرو نباشی کی راهبر شوی

در مکتب حقایق پیش ادیب عشق
هان ای پسر بکوش که روزی پدر شوی

دست از مس وجود چو مردان ره بشوی
تا کیمیای عشق بیابی و زر شوی

خواب و خورت ز مرتبه‌ی خویش دور کرد
آن‌گه رسی به خویش که بی‌خواب و خور شوی

گر نور عشق حق به دل و جانت اوفتد
بالله کز آفتاب فلک خوب‌تر شوی

یکدم غریق بحر خدا شو گمان مبر
کز آب هفت بحر به یک موی تر شوی

از پای تا سرت همه نور خدا شود
در راه ذوالجلال چو بی پا و سر شوی

وجه خدا اگر شودت منظر نظر
زین پس شکی نماند که صاحب‌نظر شوی

بنیاد هستی تو چو زیر و زبر شود
در دل مدار هیچ که زیر و زبر شوی

گر در سرت هوای وصال است حافظا
باید که خاک درگه اهل هنر شوی

پیری مـــەیخانە لە رووی لوتفەوە کاتی سەحـەریٚ
وتی بێـــــرۆ کە لە مێـــژینمی دەربـانی دەریٚ
نووری ئەو جامی جەهان‌بینـــتە رازی دو جەهـــان
دەر دەخـا گەر وەکو جەم جامی ئەمن بنیە سـەریٚ
رەند و دەروێـــشی وەها وا لە دەری مـــەیکەدەمان
تاجـــی شایـــی دەڕفێـــنن لە ســـەریٚ بۆ دیگەریٚ
سەر لەسەر خشت و لەسەر (حـــەوتەوەنان) پایـانە
لەم هــەموو قودرەت و سامانە عـەقڵ گێژە، ئەریٚ!
سەری ئێـــــمە و دەری ئـــەو مەیکەدە وا سەربانی
لە فەلەك بانــە لە دیـواری کەچـــی دەچیە سەریٚ
رێــگەی ئەم مەنزڵە بیٚ خزری بەڵەد نەگرییە پێش
شـەوەزەنگە و پڕە هەر شوێنی لە ترس و خەتەریٚ
تەختی دەروێشی و خۆشیت ئەگەر ئەی‌دڵ بدەنیٚ
دێنە ژێر پەرچەمی تۆ بەحر و بەڕ و مانگ و خۆریٚ
بەزمی تووران‌شەهی و تەختی وەزارەت بەسە بۆت
دەم لە سامانـــی هـەژاری مەدە وەك بێـــخەبەریٚ
ئەمەلت «خاجـــە» کە فیردەوسە بفەرموو عەمەلت!
تەمەعـــی خاونەکەی! چاکە حـــــەیا بۆ بەشەریٚ
دەردی «کـۆلیل» گەلیٚ کارییە یـــارەب کەرەمیٚ!
بە گەدایـــی ئـەوە هـــاتۆتە دەرت دەربـــەدەریٚ

سحـــرم هـــاتف میـــخانه به دولتخـــواهی
گفت بـــازآی که دیرینـــه‌ی این درگـــاهی
همچو جم جرعه‌ی ما کش که ز سر دو جهـان
پرتـو جــام جهان‌بیــن دهــدت آگـــاهی
بر در میـــکده رنـــدان قلنـــدر باشنـــد
که ستاننـــد و دهنـــد افســـر شاهنشـــاهی
خشت زیر ســـر و بر تـــارک هفت اختر پای
دست قـدرت نگر و منصب صاحب جـــاهی
ســـر ما و در میـــخانه که طرف بـــامش
به فـــلک بر شـــد و دیوار بدیـن کوتـــاهی
قطـــع این مرحله بی همـــرهی خضـــر مکن
ظلمـــات است بتـــرس از خطـــر گمـــراهی
اگـرت سلطنـــت فقـــر ببخشنـــد ای دل
کمتـــرین ملک تـو از مـــاه بود تا مـــاهی
تـو دم فقـــر ندانـــی زدن از دست مـده
مسنـــد خواجـــگی و مجلس توران‌شـــاهی
حافظ خـــام طمـــع شرمی از این قصه بـــدار
عملت چیست که فـردوس برین می‌خـــواهی

ئـەی ئەو کەسـەی لە چێـرەت ئاکـاری شاریـاری!
فیکـرت خەزێنـەوانی گـەنجی نهێـنی بـاری
سـەد کانیـاوی ژینـی بۆ دیـن و گـەل قەڵەمتـان
تـۆقان بە رەش‌دڵـۆپێ سـەد مەرحـەبا لە کـاری
هـەڵنایە خۆری ئیسمی ئەعـزەم لە دێـوی ناپـاک
تۆ شای نگین و موڵـکی سـالاری ئـەمر و کـاری
کـێ حیـکمەتی سـلێمان بـاوەڕ نەکا بە عەقـڵ و
زانیـنی، دێـنە قـاقـا بـێزار و زارداری
جارجارە بـاز ئەگەرچـی تاجێ لە سـەر دەنێ کەچ
سیمورغـی قـاف ئەزانـێ ئاییـنی شـاریاری
شێـرێ کە بەرقـی فەیـزی گـەردوونی بێ لەگەڵـدا
بێ خـەرج و باجـی قۆشـەن، دونیـا دەکا مەهـاری
فـەرمانی تۆ چ دڵگیـر گیـانبەخـش و دڵـڕفێنە
وەک چـاوەزار و سیحـرن بۆ یـار و هـەر نـەیاری
ئەی خـوڵقی تۆ لە خـاکی سـەربەرزی و شـەرافەت
وەی بـەختی سەربڵێـندی! پـاکی لە عەیب و عـاری
بەڵـکوو لە فیـزی مزگـەوت بەر ماڵـەکەم بشۆمۆ
ساقـی! لە کـۆی خەرابـات جـامێ دەکات چاری
عومرێـکە شـاریارا خاڵـی لە مـەی سوراحیـم
هـەر وەک لە وەزعـم ئاگـان دارۆغـە، شێخی شاری
وەک پەڕڕیکایـە رەنگ و روخساری سووری یاقووت
بێـت و بخـەی لە کانـی شەوقێـکی تیغـی کـاری
گەر حاڵـی ئەو غـولامەت سـروەی سەحـەر بفـەرمێ
لام وایـە دڵتەسووتـێ بۆ شـەونشینـی زاری
لەو جـێ کە بـەرقی تـاوان پێـکایە باوەگەورەم
من کێـم بڵێـم کە پاکـم نەمبوو لە رێـگە لاری
«حافـز»! کە نـاوت ئێنـێ جـارجـارە شـاریـارت
بێـرۆ بە تۆبەکـاری، بۆ کۆشـی بـەختـیاری
یـاڕەب بە حەققی عەشقـی رەنجـاوی گیانی «کۆلیل»
بمبەخشە خوێنـی پـاکی ئەنفـالـی کـوردەواری

ای در رخ تو پیدا انوار پادشاهی
در فکرت تو پنهان صد حکمت الهی

کلک تو بارک الله بر ملک و دین گشاده
صد چشمه آب حیوان از قطره‌ی سیاهی

بر اهرمن نتابد انوار اسم اعظم
ملک آن توست و خاتم فرمای هرچه خواهی

در حکمت سلیمان هر کس که شک نماید
بر عقل و دانش او خندند مرغ و ماهی

باز ار چه گاهگاهی بر سر نهد کلاهی
مرغان قاف دانند آیین پادشاهی

تیغی که آسمانش از فیض خود دهد آب
تنها جهان بگیرد بی منت سپاهی

کلک تو خوش نویسد در شأن یار و اغیار
تعویذ جان‌فزایی افسون عمر کاهی

ای عنصر تو مخلوق از کیمیای عزت
و ای دولت تو ایمن از وصمت تباهی

ساقی بیار آبی از چشمه‌ی خرابات
تا خرقه‌ها بشوییم از عجب خانقاهی

عمری‌ست پادشاها کز می تهی‌ست جامم
اینک ز بنده دعوی و از محتسب گواهی

گر پرتوی ز تیغت بر کان و معدن افتد
یاقوت سرخ‌رو را بخشند رنگ کاهی

دانم دلت ببخشد بر عجز شب‌نشینان
گر حال بنده پرسی از باد صبحگاهی

جایی که برق عصیان بر آدم صفی زد
ما را چگونه زیبد دعوی بی گناهی

حافظ چو پادشاهت گهگاه می‌برد نام
رنجش ز بخت منما بازآ به عذرخواهی

نییە وەک من لە هەموو مەیکەدەیێ دڵ بە غەمێ
خەرقە لە گرێوی مەی و دەفتەری شیعرم سەنەمێ
دڵ کە ئاوێنەیی شاییمە غوبباری لەسەرە
ئەی خودا! هەمنەفەسێ سینە وەکوو جامی جەمێ
تۆبەمی داوە بتێ، جام فرۆشێ، کە نەخۆم
بادە، مۆم و گوڵی مەجلیس کە نەبێ خونچە دەمێ
نێرگز ئەر خۆ وەکو چاوت دەنووێنێ مەبە زیز!
کوا بەدوی کوێر ئەکەون خەڵکی نەزەر بۆ کەرەمێ
زات و زاری نییە پەروانە بکا شەرحی ئەوین
مەگەر ئەم باسە ببیسی لە دەمی گەرمی شەمێ
جۆگەلەم بەستووە زۆرێک لە کۆشم کە بنێن
سەوڵ بالایێ لە پاڵم بەر و بۆ تازە دەمێ
جامی لە گوێنی گەمی بێنە کە وا بێ گوڵی رووت
بوو بە بەحرێ لە غەمی سینە هەموو گۆشە چەمێ
مەکە باسی کەسی تر بۆ منی ئازیز پەرست!
کە بە غەیری ئەو و جامم نییە بۆ غەیرە غەمێ
قسەی ئەو گاورە چەن خۆش بوو کە دەیوت بە نەوای
دەف و نەی خۆش لە دەری مەیکەدە کازێوە دەمێ
ئەگەر ئەم ئیشە موسوڵمانییە «حافز» هەیەتی
وەی ئەگەر بێنە قەزالی لە قیامەت گ ژەمێ
ئەسڵی ژین عەشقی زوڵاڵی دڵی «کۆلیل»ـە بە تۆ
کوردی، فورسی، لوڕی، تورکی، عەرەبی یا عەجەمێ

در همه دیر مغان نیست چو من شیدایی
خرقه جایی گرو باده و دفتر جایی

دل که آیینه‌ی شاهی‌ست غباری دارد
از خدا می‌طلبم صحبت روشن‌رایی

کرده‌ام توبه به دست صنم باده‌فروش
که دگر می نخورم بی رخ بزم‌آرایی

نرگس ار لاف زد از شیوه‌ی چشم تو مرنج
نروند اهل نظر از پی نابینایی

شرح این قصه مگر شمع برآرد به زبان
ور نه پروانه ندارد به سخن پروایی

جوی‌ها بسته‌ام از دیده به دامان که مگر
در کنارم بنشانند سهی بالایی

کشتی باده بیاور که مرا بی رخ دوست
گشت هر گوشه‌ی چشم از غم دل دریایی

سخن غیر مگو با من معشوقه‌پرست
کز وی و جام می‌ام نیست به کس پروایی

این حدیثم چه خوش آمد که سحرگه می‌گفت
بر در میکده‌ای با دف و نی ترسایی

گر مسلمانی از این است که حافظ دارد
آه اگر از پی امروز بود فردایی

لە دوو دییەم خەمە قـــەوسی هیلالی روو قەمـەرێ
خـــەیاڵی سەوزە لە جێیێ عوزاری مووکەمـەرێ
خـــودا بکات! کە فـــەرمانی عـــەشقی من بگـەیێ
بە وەسڵـی مۆری کەوانی رەشی وەکوو هونـــەرێ
ســـەرم نەما دەســـەلاتی، دییەم تروسکی سووت
بە عــــەشقی نێرگزی سەروێ سەفا بە کۆڕ دەرێ
دڵـــم تـەم و مـــژە گڕ بەر ئەدەم لە دەڵـــقی ریا
وەرن بە ســـەیر و بزانن شیـــاوە بۆ نـــەزەرێ؟!
بە دارەتـــەرمی چنـــارم بـەرن بە گـــۆڕستـــان
بە لــەرزی قامەتی بەرزی لە خۆ کە چوومە دەرێ
لەغاوی دڵ، منی دەروێش ئەدەم بە دەستی کـەسێ
کە چاوی دەوڵەتی حوسنی نەبوو لە دڵ کەسەرێ
لە جێگەیـــێ کە دەلالان بە عیشـوە جەرگ ئەبڕن
عەجەب مەمێنە لە بەر پێت ئەگەر بـڕاوە ســـەرێ
منـــێ کە رۆشنە ماڵـــم بە مانگی روومەتی ئەو
مەگەر بە نووری هەســارەم نەزەر دەبێ قەدەرێ؟!
لە فیکری مەیلی ئەوین بی! نە فەسڵ و وەسڵی ئەوان
کە حەیفــە غەیری مەرامی ئەوت لە سەر گوزەرێ
سەفـــەر بکا غـــەزەلی «خاجــــە» گەر بە زەریایێ
خـــەلاتی گەوهەر ئەدەن ماسیان لە هەر دەوەرێ
وتم کە ماچـــی دەمت سـەر لە هەر خـــەلاتە وتی
مەگەر کەســێ هەیە «کۆلیـــل» بێت و بەختەوەرێ

به چشم کرده‌ام ابروی ماه سیمایی
خیال سبزخطی نقش بسته‌ام جایی

امید هست که منشور عشق‌بازی من
از آن کمانچه ابرو رسد به طغرایی

سرم ز دست بشد چشم از انتظار بسوخت
در آرزوی سر و چشم مجلس‌آرایی

مکدّر است دل آتش به خرقه خواهم زد
بیا ببین که که را می‌کند تماشایی

به روز واقعه تابوت ما ز سرو کنید
که می‌رویم به داغ بلندبالایی

زمام دل به کسی داده‌ام من درویش
که نیستش به کس از تاج و تخت پروایی

در آن مقام که خوبان ز غمزه تیغ زنند
عجب مدار سری اوفتاده در پایی

مرا که از رخ او ماه در شبستان است
کجا بود به فروغ ستاره پروایی

فراق و وصل چه باشد رضای دوست طلب
که حیف باشد از او غیر او تمنایی

دُرر ز شوق برآرند ماهیان به نثار
اگر سفینه‌ی حافظ رسد به دریایی

سـلاوێ بە چەشنـی بـەر و بـۆی برایـی
لە خـەڵکی دوو چـاوم وزەی رۆشنـایـی
درووديـکی رون وەک دڵـی شـارەزاکان
بە تۆ شاچـرا خـەڵوەتی شـارەزایـی
لە یـاران کەسێـکم بە بەرچـاو نـایـێ
دڵـم خوێنـە سـاقی بە ناڵـەی جـودایی
لە مەیـخانە روو وەرنەگێـڕی! لەوێ چـون
گەلـێ گەرمە بـازاڕی موشـکڵ گوشـایـی
لە غایـەت بەدەر بوو کـی دونیـا جـووانە
لە غایـەت بەدەر وەک دەکـا بـێوەفـایی
دڵـم هیممـەتی ساغـە، چـاتر شکابـێ
هـەتا دڵـڕەقانی بکـەن مـۆمیـایی
شـەرابێـکی سـۆفیخەوێـن تێـکە بۆ من!
کە دەردم گـرانن لـە ریشـی ریـایـی
رەفێـقان وەهایان شـکان قـەوڵ و پەیمـان
کە وەک هـەر نەبـووبێ بەڵێـنی برایـی
بـەرۆکم ئەگەر نەگری ئەی نەوسـی قـارون
دەکـەم حوکمـی شـایی لە تەختـی گەدایـی
دەکـەم ئاشنـاتان بە گـەنجـی سـەعـادەت
لەگـەڵ خێـڵی ناکـەس مەکـەن ئاشنـایـی
شکایەت لە زڵمـی فەلەک «خاجـە»! بەس کـەی
کەڕ و کوێـرە هەرکەس لە کـاری خـودایـی
بە «کۆلیـل»ـی پیـری موغـان وت بەیـانێ
سـەحەر یانـی دەرچـون لە تاریـکرایـی

سلامی چو بوی خوش آشنایی
بدان مردم دیده‌ی روشنایی
درودی چو نور دل پارسایان
بدان شمع خلوتگه پارسایی
نمی‌بینم از همدمان هیچ بر جای
دلم خون شد از غصه ساقی کجایی
ز کوی مغان رخ مگردان که آن‌جا
فروشند مفتاح مشکل‌گشایی
عروس جهان گرچه در حد حسن است
ز حد می‌برد شیوه‌ی بی‌وفایی
دل خسته‌ی من گرش همتی هست
نخواهد ز سنگین‌دلان مومیایی
می صوفی‌افکن کجا می‌فروشند
که در تابم از دست زهد ریایی
رفیقان چنان عهد صحبت شکستند
که گویی نبوده‌ست خود آشنایی
مرا گر تو بگذاری ای نفس طامع
بسی پادشایی کنم در گدایی
بیاموزمت کیمیای سعادت
ز همصحبت بد جدایی جدایی
مکن حافظ از جور دوران شکایت
چه دانی تو ای بنده کار خدایی

ئـەی سـەروەری سـالاران! هـاوار لە تەنیـایی
ویـرانە دڵم بێـرۆ ئەی گیانـی دڵاوایی
تا سـەر گوڵی ئەم باخـەت هـەروا تـەڕ و خۆشبۆ نیـن
هـەتوان کە گـەلی نەتوان ئێـستا کە تووانایی
بۆ بـای سەحەرم دوێشـەو تا وت لە شەڕی زولفـی
فـەرموی کە هەڵـەی، دەرچـۆ لەم فیکرە! مـن ئاسـایی
سـەد سـروە لە زەنجیـرێ ئـەو پرچـە دەڕەقسێنێ
ئـاوایە حـەریف ئـەی دڵ! بـەس کەن هەوەسـی بـایی
لـەم دوورەوە تامـەزرۆی دیـدارت ئـەوەن دامـام
پێـم وایـە لە پێ دەردێـن سـەبری دڵ و بینـایی
یـارم لە هەموو جێیە و چی بـەژنی بە کەس نەنـوان
ئەم نوکتە بە کێ بێـژم یـاڕەب منی هەرجـایی!
ساقـی! نییەتی رەنـگێ گوڵـزار و چەمەن بـێ ڕووت
لەنجـەی قـەدی شمشـاڵت با بێـتە گوڵئارایـی
ئەی مەڵهەمـی زامـانی نێـو جێـگەیی ناشـادیم
وەی یـادی ئەتـۆ هـاوەڵ بۆ خـەلوەتی تەنیـایی
من خـاڵـی رەزامـەندی تۆی جەغـزی بەسـەرهاتـم
فـەرمان هەر ئـەوەن بێـدەی فیکرت کەرەمی شـایی
خـۆویستـن و خـۆڕایی کـوا دابـی ئەویندارین
لەم مەزهەبـەدا کوفـرن خۆویستنـی خـۆڕایی
خوێنیـنە لە دەس چەرخی میـنا جیگەرم، کـوا مـەی
موشـکڵ مـەگەرم حەل کا چەن ساغـەری مینـایی
«حافز»! شەوی دووری چوو بۆی عەتـری حوزووری دێ
ئەم جێـژنە لە تۆ پیـرۆز ئەی خوسرەوی شەیـدایی
هـەیـهۆ لە کەیێکـۆ دڵ «کۆلیـل»ـی تـەماشـاتە
بنوێنـە قـەدی شمشـاڵ ئـەی سـەروی تەماشـایی

ای پادشـــه خوبـــان داد از غـــم تنهـــایی
دل بی تو به جـــان آمد وقت است که بـــازآیی

دایـــم گل این بستـــان شـــاداب نمی‌مانـــد
دریـــاب ضعیفـــــان را در وقـــت توانـــــایی

دیشب گِلـــه‌ی زلفـش با بـــــاد همی کـــردم
گفتـــا غلطی بگـــذر زیـــن فکرت ســـودایی

صـــد باد صبـــا این‌جا با سلسلـــه می‌رقصنـــد
این است حـــریف ای دل تـــا بـــاد نپیمـــایی

مشتـاقی و مهجـــوری دور از تـــو چنانـــم کرد
کز دست بخواهـــد شـــد پایـــاب شکیبـــایی

یا رب به که شـــاید گفت این نکته که در عالـــم
رخســـاره به کس ننمود آن شاهـــد هرجـــایی

ساقـــی چمـــن گل را بی روی تو رنگی نیست
شمشـــاد خرامـــان کن تا بـــــاغ بیـــارایی

ای درد تـــوام درمـــــان در بستـــر ناکـــامی
و ای یـــاد تـــوام مونس در گوشـــه‌ی تنهـــایی

در دایـــره‌ی قسمت مـــا نقطـــه‌ی تسلیمـــیم
لطف آن‌چه تو اندیشی حکم آن‌چه تو فرمـــایی

فکر خود و رای خود در عـــالم رنـــدی نیست
کفر است در این مذهب خودبینی و خـــودرایی

زیـــن دایـــره‌ی مینـــا خونیـــن جگرم مـــی ده
تا حـــل کنـــم این مشکل در ساغـــر مینـــایی

حافظ شب هجـــران شد بوی خوش وصـــل آمد
شـــادیت مبـــارک بـاد ای عاشـــق شیـــدایی

ئەی دڵ کە لە نێــو زنجـی چەنەی گیـان بـەدەراتــی
هەر لایـە کە چــوی کردە پەشیمـــان بـەدەراتــی
گەر گوێ لە قســە و هۆشی ئەقڵ بگری وەک ئـادەم
بێــبەش لـە بەهــەشت و لـە گوڵستـــان بـەدەراتــی
جێـی خۆیـەتی گــەردون کە قومـێ ئـاو نـەدا پێت
تینـــوو کە لە سەرچــاوەیی حەیــوان بـەدەراتــی
بۆ دیتـــنی تۆ چەشنــی سەحــەر گیــانم ئـەدەم گەر
یەک چرکە وەکوو خــۆری درەخشــان بـەدەراتــی
هـەر ئەونە وەکـوو سـروە بە هیممـەت دەشنێـم بۆت
لەو خونچـەتە شایــەت گوڵی خەنـدان! بـەدەراتــی
تاریـــکەشــەوی دووری ئــەوا کوشتمـــی ئاخـۆ
کەنــگێ بلێــم ئۆخـەی مەهـی تـابان بـەدەراتــی
بەستــوومە لە دوو دیـدە دو سـەد جـــۆگە لە رێگات
وەک سەروی رەوان هــات و خەرامــان بـەدەراتــی
«حافــز»! غەمی یۆسف بەســە ئەو مانــگە کە هـاکا
دەرهــات و لە کۆی شیــوەن و گریــان بـەدەراتــی
بەستەی دەری گوڵزاری عـەزەڵ بـوم وەکـو «کۆلیــل»
تـا تــۆ وەکـو وێنـوسـی دڵ و گیـــان بـەدەراتــی

ای دل گر از آن چاه زنخدان به در آیی
هر جا که روی زود پشیمان به در آیی
هُش‌دار که گر وسوسه‌ی عقل کنی گوش
آدم‌صفت از روضه‌ی رضوان به در آیی
شاید که به آبی فلکت دست نگیرد
گر تشنه‌لب از چشمه‌ی حیوان به در آیی
جان می‌دهم از حسرت دیدار تو چون صبح
باشد که چو خورشید درخشان به در آیی
چندان چو صبا بر تو گمارم دم همت
کز غنچه چو گل خرم و خندان به در آیی
در تیره شب هجر تو جانم به لب آمد
وقت است که همچون مه تابان به در آیی
بر رهگذرت بسته‌ام از دیده دو صد جوی
تا بو که تو چون سرو خرامان به در آیی
حافظ مکن اندیشه که آن یوسف مه‌رو
باز آید و از کلبه‌ی احزان به در آیی

چت داوە لە گەردوون تا خاوەن گوڵ و هەم بادەی
گوڵ ئەمیە سەحەر فەرموو بولبول نەزەرێ دادەی!
فەرمو بە گوڵستان! تا ماچی دەمی دڵبەر کەی
گوڵ بێن و بنۆشی مەی زولفی چەمەری لادەی
رەوتی قەدی شمشاڵت بڕژێنە چەمەن بەشکەم
ئازا وەکو بەژنت بێ سەروی تەڕ و ئازادەی
ئەی تۆوی گوڵی والاّ بۆ کێ دەڕوێی ئاخۆ
لێو خونچەیی پشکووتوو بۆ کام ئەکەی ئامادەی
فریا کەوە تا گەنجی، گەنجی کەرەمێ رۆ نێ!
پێش ئەو دەمە سامان و سەرمایە بە دەس با دەی
زووتر هونەرێ فەرموو رۆشن لە شەمی جوانی
مۆمت کە لە رێی بایە و وا باش گەیی وادەی
ئەو پەرچەمە هەر چینی سەد نافەیی چین دێنێ
چەن خۆش بو کە بیبایێ روی خۆش و خدەی سادەی
هەر مەل بە هەوایێ دێ بۆ گوڵشەن و باخی شا
بولبول بە گەروی سازی، «حافز» بە غەزەڵ بادەی
چەن دوورە گوڵی ماچێ بگرێ لە دەمت «کۆلیل»
من کۆخ و لە گەل جێماو تۆ شۆخ و پەریزادەی

می خواه و گل افشان کن از دهر چه می‌جویی
این گفت سحرگه گل بلبل تو چه می گویی
مسند به گلستان بر تا شاهد و ساقی را
لب گیری و رخ بوسی می نوشی و گل بویی
شمشاد خرامان کن و آهنگ گلستان کن
تا سرو بیاموزد از قد تو دلجویی
تا غنچه‌ی خندانت دولت به که خواهد داد
ای شاخ گل رعنا از بهر که می‌رویی
امروز که بازارت پرجوش خریدار است
دریاب و بنه گنجی از مایه‌ی نیکویی
چون شمع نکورویی در رهگذر باد است
طرف هنری بربند از شمع نکورویی
آن طره که هر جعدش صد نافه‌ی چین ارزد
خوش بودی اگر بودی بوییش ز خوش‌خویی
هر مرغ به دستانی در گلشن شاه آمد
بلبل به نواسازی حافظ به غزل گویی

## «دیکـەی بەرهەمــەکانی کۆلیــل»

❖ بەرهەمە چاپ و بڵاوکراوەکان:

- لە هەر چیمەنێ دیمــەنێ (١٣٦٣ هـ.)
- گوڵی خوێناوی (١٣٦٦ هـ.)
- دووبەیتــی‌یەکانی کۆلیــل (١٣٦٧هـ.)
- ئەسرینــی ئــاڵ (١٣٧٢ هـ.)
- چـاوی خوێنینی شەوەق (١٣٧٨ هـ.)
- عەزیز و تەکش (١٣٨٤ هـ.)
- تاڤگـەی ئەوین (١٣٩٠ هـ.)

❖ بەرهەمە بێنازکەوتوو و چاپنەکراوەکان:

- ◇ ئاوایە بەزمی عاشقان (وەرگیراو لە یۆسف و زلێخای جامی)
- ◇ وەرگێڕانی قەسیدە عەرەبییەکانی سەعـدی
- ◇ فەرهەنگی گژ و گیا
- ◇ خاک و خۆڵ، یا نوختە خەتێکی‌تر
- ◇ کۆکردنەوەی هەندێ چیرۆکی کوردی بە لێکۆڵینەوە
- ◇ بیرەوەرییەکانی کۆلیــل

# سەرچاوەکان


🕮 دیوان حافظ. تصحیح علامه قزوینی، مقدمه دکتر خلیل خطیب رهبر، انتشارات سعیدنو، ١٣٦٣.

🕮 سودی بوسنوی، محمد: شرح سودی بر حافظ(٤جلد)، ترجمه دکتر عصمت ستارزاده، نگاه زرین، تهران، ١٣٧٢.

🕮 دیوان حافظ شیرازی با شرح ابیات. به اهتمام ناهید فرشادمهر، پاکتاب، ١٣٨٥.

🕮 شێخ موحەممەدی خاڵ: فەرهەنگی خاڵ. دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موحەممەدی، سەقز ١٣٦٦.

🕮 شرفکندی، عبدالرحمن (هەژار): هەنبانە بۆرینە (فرهنگ کردی-فارسی). انتشارات سروش، تهران ١٣٦٩.

🕮 مردوخ‌کردستانی، شیخ محمد: فرهنگ مردوخ. انتشارات غریقی، سنندج ١٣٦٢.

🕮 موکریانی، گیو: فەرهەنگی کوردستان. دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر ١٩٩٩.

🕮 مدرس، عبدالکریم: تفسیر نامی للقران الکریم. الوطن العربی، بغداد ١٩٨٠.

🕮 مردوخ روحانی، ماجد: فرهنگ فارسی-کردی دانشگاه کردستان (٣ جلدی). چاپ اول ١٣٨٥.

🕮 احمد حبیب، بدران: فەرهەنگی زاراوە (عەرەبی-کوردی). وەزارەتی پەروەردە، هەولێر ٢٠٠٢.